زنجیرەی بیروباوەڕی ئیسلامی

٢

تصویر ابو عبد الرحمن الكردي

# بیروباوەڕی بەتەنها خوا پەرستی

ڕونکردنەوەی دژەکانی یا لە پایەکەم کەرەوەکانی لە هاوبەشی پەیدا کردنی گەورە و بچوك و پەك خستن و داهێنان و تازەگەری و گەلێ شتی تر ...

د.صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان





وەرگێڕانی : ئەحمەد میرزا ڕۆستەمی ژیرو

١٤٣٠ك - ٢٠١٠ز

٢٦٢
ف ٣٢٢
الفوزان، صالح بن فوزان بن عبدالله
بيرو باوەڕی تەنها خوا پەرستی. شێخ صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان، وەرگێڕانی أحمد میرزاڕۆستەمی ژێرو، سلێمانی، چاپخانەی سیڤا، ١٤٣٠-٢٠٠٩.
٢٦١ ل.
١- ئایینی ئیسلام - بیرو باوەڕ ٢- ئیسلام - تەنها خوا پەرستی ا- ناویشان ب- زنجیرە ج- وەرگێڕ.

بە پێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠) ی ساڵی ١٩٩٣ ژمارەی سپاردنی ساڵی ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (١٢٨٩) ی ساڵی (٢٠١٠) ی پێ دراوە.

ناوی کتێب: بیرو باوەڕی تەنها خوا پەرستی.
ناوی نوسەر: صالح فوزان بن عبدالله الفوزان.
ناوی وەرگێڕ: ئەحمەد میرزاڕۆستەمی ژێرو.
بابەت: بیرو باوەڕی ئیسلامی.
ناوی چاپ: چاپخانەی سیڤا.
ساڵی چاپ: ٢٠١٠.
شوێنی چاپ: سلێمانی.
تیراژ: ١٠٠٠دانە.
ژمارەی پۆلین لەسیستمی دیوی دەیی دا: ٢٦٢/ ف ٣٢٢.

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على نبيه الصادق الأمين، نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين...وبعد:

ئەم کتێبە کەبریتیە لەزانستی تەنها خوا پەرستی، تابۆم کرابێت تیایدا چاوەدێری کورتیو سادەو سانایی دەربڕینەکانیم کردوە، سودم لەزۆرێك کتێبەژێدەرو سەرچاوەکانی پێشەواو ناوداره بەڕێزەکان وەرگرتوە بەتایبەتی کتێبەکانی شێخی ئیسلام إبن تيمية، وکتێبەکانی ناوداروبلیمەت إبن القيم ، وەکتێبەکانی شێخی ئیسلام محمد کوڕی عبدالوهابو شاگردەکانی(قوتابیەکانی) لەپێشەوایانی ئەم بانگەوازە پیرۆزەی ئیسلامە، ئەوەی کەگومانی تێدا نیە ئەوەیە کە زانستی بیروباوەڕی ئیسلامی زانستێکی بنەڕەتیە کەپێویستە گرنگی تەواوی پێ بدرێت لەڕوی فێر بونیو گوتنەوەی واتە فێر کردنی موسڵمانانو هەروەها کار کردن پێ یو ڕەنگ دانەوەی لەژیانی ڕۆژانەدا، بۆ ئەوەی خوای گەورە کردەوە باشەکانمان لێ وەربگرێتو سودیشی هەبێت بۆ خەڵکی، بەتایبەتیش ئێمە کەلەڕۆژگارێکی وا داین کەپڕیەتی لەتەوژمە لادەرەکانو تەوژمی ئیلحادی، و تەوژمی سۆفیگەرێتیو ڕەبەنایەتی(الرهبنة)، وتەوژمی گۆڕپەرستیو بت پەرستی پوچەڵ، وتەوژمی داهێنانو تازەگەریو داتاشینی پێچەوانەو دژی ڕێگەی هیدایەتو ڕێنومایی پێغەمبەرایەتی، هەر هەمویان تەوژمانێکی مەترسیدارو تێك دەرن ئەگەر بابای موسڵمان چەکدار نەبێت بەچەکی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی پاڵ پشت بەقورئانو سوننەت کەپێشینەی پیاو چاکی ئەم ئوممەتە لەسەری بون، کەشایەنی ئەوەیە هەمو ئەو تەوژمە گومڕاو سەرلێشێواوانە ڕابماڵێت بەرەو زبڵدانی مێژو. ئەمە وا دەخوازێو دەبێ گرنگی تەواو بدرێت بەفێر بونو فێر کردنو پەروەردە کردنی ڕۆڵەی موسڵمانان لەسەر بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام لەسەرچاوە ڕەسەنو بنەڕەتەکانی ئەم ئایینی ئیسلامە.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه.

## دەرگـــای یەکەم

## دەروازەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەبیرو باوەڕی ئیسلامی

کەلەم بەشانەی خوارەوە پێك هاتوە:

*بەشی یەکەم: واتـای بـیرو بـاوەڕو ڕونکردنەوەی گرنگیو بایەخیەکـەی، بـەوەی کەبریتیـە لەبنچینەو بنەمایەك تەلاروکۆشکی ئایینی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت.

* لقـی دوەم: ژێـدەرو سەرچـاوەکانی بیروبـاوەڕی ڕاسـتەقینە، بەرنامــەو مەنهــەجی پێشینەی پیاوچاکان کەلەسەری ڕۆیشتون .

* لقی سێ یەم: لادان لەبیروباوەڕو ڕێگاکانی خۆپارێزی لێ ی.



## بەشـــی یەکەم

### واتـای بیرو بـاوەڕو ڕونکردنەوەی گرنگیو بـایەخەکەی، بەوەی کەبریتیە لەبنچینەو بنەمایەك تەلاروکۆشکی ئایینی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت.

* بیرو باوەڕ لەزماندا: لەگرێ بەستی یەوە وەرگیراوە، کەبریتیە لە بەستنەوەی شتێك بەشتێکی ترەوە، ئەوام گرێدا، دڵو ویژدانی خۆم پێوە گرێداوە.

وەبیروباوەڕ: ئەوەیە کەمرۆڤ بنەمای ئایینی خۆی لەســەر دادەمـەزرێنێت، دەڵـێن فـلان کـەس بیروبـاوەڕێکی پتـەو پـاكو بێگـەردی هەیـە، واتـە لـەدودڵیو گومـان بـەدورەو پارێزراوە. وەبیروباوەڕ کارو کردەوەی دڵە، کەبریتیە لەبڕوا بونی دڵ بەشتێكو بەڕاست زانینو پشت ڕاستاندنو پێ قایل بونو پەسەند کردنی.

* وەبیروبـاوەڕ لەشــەرعدا: بریتیــە لــەبڕوا بــون بــەخوای گــەورەو بەفریشـــتەکانو بەکتێبەکانیو بەنێردراوو پێغەمبەرانو بەڕۆژی دوایـی وبـڕوا بـون بەقـەزاو قـەدەر خێـرو شەڕی، کەئەمانە پێ یان دەگوترێت: پایەکانی ئیمان.

### شەریعەت

شەریعەت دەکرێت بەدو بەشەوە: بیروباوەڕەکانو کارو کردەوەکان:

بیروباوەڕەکـان: ئەوەیـە کەپەیوەسـت نیـە بەچۆنیەتی کـار کردنـەوە وەکـو بـڕوا بـون بەپـەروەردگارێتی خوای گەورەو واجب بونی بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، وبڕوا بـون بەباقی پایەکانی باوەڕ(الأيمان) کەپێ ی دەگوترێت: بنەڕەتی یابنەما.

وەکردەوەکان: بریتیە لەوەی کەپەیوەستە بەچۆنیەتی کار کردن یائیش پێ کردنو ئەنجامدان وەك نوێژو ڕۆژوو گشت حوکمە کردەکیەکانی تر، کەپێ یان دەگوترێت: لقی(فرعية) چونکە لەسەر ئەو ڕاستیو ناڕاستیە یادروستیو نادروستیو خراپیە دادەمەزرێت(١).

دەی بیروباوەڕی ڕاستەقینە بنچینەو بنەمایەکە کەبناغەی ئایینی لەسەر دادەمەزرێتو پێوەرێکە کردەوەکـانی پـێ دەپێـورێنو ڕاسـت دەکرێنـەوە، هـەروەکو خـوای گـەورە دەفەرموێ:﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَـــدًا﴾(٢).

---

(١) شرح العقيدة السفارينية(٤/١).

(٢) أ- سورة الكهف: (١١٠).

هەروەها دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[3]. هەروەها دەفەرموێ:﴿ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ۝ أَلاَ لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ [4].

ئەم ئایەتە گەلە پیرۆزانەو واتاکانیان وادەگەیەنن کەکردەوەکانی مرۆڤ وەرناگیرێن‌و قبول نین تاکو نیاز پاکی تەواوو ئیخلاسیەتی تەواو نەبێت‌و خالی بێت لەپیس‌و پۆخلیەکانی هاوبەش‌و هاوەڵ دانان، هەروەها گرنگی‌و بایەخ پێدانی پێغەمبەران - صلات‌و سەلامی خوایان لەسەر بێت - لەپێشەنگی کارەکانیاندا بۆ پاك کردنەوەو چاك کردن‌و هێنانەوە سەر سکەی بیروباوەڕ بوە، بەڵێ یەکەمین شتێك کەداوایان لەگەلەکانیان دەکرد بەتەنها خوا پەرستی‌و بەندایەتی کردن تەنها بۆ خوای پەروەردگار

ب - واتە: هەر کەسێك خوازیاری گەیشتنە بەخوای پەروەردگاری خۆی باکردەوەی چاك بکات‌و هاوبەش‌و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دانەنێت‌و بەندایەتی بۆ غەیری خوا نەکات. وەرگێڕ.

([3]) أ ــ سورة الزمر: (٦٥)

ب - واتە: ئەی محمدﷺبەدڵنییەوە سروشمان بۆ تۆو بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ کردوەو پێمان گوتون کەئەگەر هاوەڵ بۆ خوا دابنێن هەمو کردەوە باشەکانتان ڕەش دەبنەوەو هەڵ دەوەرن‌و لەکۆتایی دا لەزیانمەندان دەژمێردرێن. وەرگێڕ.

([4]) أ ــ سورة الزمر: ( ٢ــ٣ ) .

ب - واتە: پڕ بەدڵ خوا بپەرستەو نیاز پاکی‌و ئیخلاسیەتت بۆ خوا هەبێت ، پەرستن تەنیا شایستەی خوای گەورەیەو هیچ کەس‌و هیچ شتێکی تر نیە کەبەهەق بپەرسترێت‌و شایستەی ئەو پەرستنە بێت تەنیا زاتی خوای پەروەردگار نەبێت‌و دین هەر هی خوایەو بەس، بەڵێ پەرستنی پاك‌و بێگەردو دور لەپیس‌و پۆخڵی هاوەڵ‌و هاوبەش تەنها هی خوای گەورەیەو بەس، هیچ کەس‌و هیچ شتێك بێجگە لەخوای گەورە بەدۆست‌و پشتیوانی خۆتان مەزانن، بێگومان خوای گەورە ئەمانە لەڕۆژی دوایی دا کەجیاوازی هەبوە لەنێوانیاندا دادگایی دەکات کەجوێ لەخوای گەورە کەس‌و شتی تریان پەرستوە، ئەوانە دەڵێن ئێمە تەنیا بۆ ئەوەمان پەرستون کەلەخوامان نزیك بکەنەوەو واسیتە بن بۆمان لەلای خوای گەورە، بەڵێ ئەوانە دادگایی دەکرێن لەسەر ئەو بیرو بۆچونەی کەجیا بون تایدا، چاکیش بزانن کەخوای گەورە هیدایەت‌و یارمەتی ئەو کەسانە نادات کەبیرو باوەڕی پوچەڵ‌و هەڵەیان گرتوەو هەر سورن لەسەر هەڵەکانی خۆیان‌و ڕێگەی سەرلێشێواوی‌و گومراییان گرتوەو لێ ی لانادەن، ئاخر ئەوانە خۆیان بەویستی خۆیان ئەو ڕێگە چەوتەیان گرتوە. دەبێ سزای خۆشیان بچێژن. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵەشەن ب٣ل١٢٠١.

بو، دور کەوتنەوەو واز هێنان و کشانەوە لەبەندایەتی کردن و پەرستشی کەس و شتێکی تر جوێ لەخوای گەورە. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ﴾ سورة النحل: (٣٦). بەلێ، هەمو پێغەمبەرێك گفتارو یەکەمین داوایەك کەلەگەلەکانیان دەکرد ئەم دەستەواژەی:﴿ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ ﴾ سورة الأعراف: (٥٩ـــ ٦٥، ٧٣، ٨٥). واتە: تەنیا خوای گەورە بپەرستن و هیچ خوایەکی ترتان نیە بێجگە لەخوای گەورە کەبەهەق بپەرسترێت. ئەوە بو نوح و هودو صالح و شعیب و باقی پێغەمبەرانی ترهەمان داوایان لەگەلەکانی خۆیان دەکرد.

پێغەمبەرﷺدوای ئەوەی پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ هاتە خوار سێزدە سالی ڕەبەق لەمەککە مایەوە تەنیا خەلکی بۆ تەنها خوا پەرستی بانگ دەکردو سەرقالی پاك کردنەوەو چاك کردن و ڕاست کردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی و بەتەنها خوا پەرستی بوە ، چونکە ئەمە تاکە پێوەرو تاکە بنەمایەکە کەتەلارو بینای ئایینی لەسەر دادەمەزرێت. بانگەشەکاران و چاکخوازان لەهەمو کات و زەمینەیەکدا شوێن پێ ی پێغەمبەران و نێردراوانیان گرتۆتە بەر، سەرەتا لەبانگەوازی کردن و داوا کردنیان لەخەلکی بۆ تەنها خوا پەرستی دەستیان پێ کردوە، خەریکی ڕاست کردنەوەو چاك کردنی بیروباوەڕ بون، ئەمجار دوای ئەمە ڕویان کردۆتە کارو بارەکانی تری ئایین و ڕاست کردنەوەیان.



## بەشـی دوەم

## ژێدەرو سەرچاوەکانی بیروباوەڕی ڕاستەقینە، بەرنامەو مەنهەجی پێشینەی پیاوچاکان کەلەسەری ڕۆیشتون.

بیروباوەڕی ئیسلامی بڕێنراوەتـەوە(توقيفية)، ناچەسـپێت مەگـەر بەبەڵگـەو سـەلماندن بێتو لەلایەن شەرعزان یا شەرع دانەرەوە بێت، جێگای کۆششوهەوڵو ڕاو بۆچونی تێدا نابێتەوە. هەروەها سەرچاوەو ژێدەرەکانی تـەنیا لـەقورئانو سـوننەتدا کورت هـەڵاتون واتـە تاکـە سەرچـاوەی پـاکو بێگـەرو زوڵاڵـی بیروبـاوەڕی ڕاسـتەقینەی ئیسـلام تـەنیا قورئانو سوننەتە، چونکە کەس لەخوای گەورە شارەزا ترو زانا تـر نیـە بـەزاتی خۆیو چیش پێویستە بۆخۆی، وەکەسیش بەقەد خوا نازانێت کەزاتی ئەو چەندە پاکو بێگەردە و دورە لەهەمو خەوشێك، هەروەها کەسیش لەخوا شارەزا ترو زانا تر بەپێغەمبەری خـوا ﷺ، هەر بۆیەشە کە مەنهەجو بەرنامەی پێشینەی پیاو چاك(السلف الصالح)و ئەوانەشـی کەشوێن کەوتەی ئـەوانن هـەتا دنیـا دنیایە تاکە سەرچاوەی بـیرو باوەڕەکـەیان تـەنیا قورئانو سوننەتەو بەس.

هەرچی قورئـانو سـوننەت هێناویـەتیو ڕای دەگەیـەنێت دەربـارەی مافـەکانی خـوای بەرزو بێ هاوتا بڕوایان پێ ی هێناوەو وەریان گرتوەو وەری دەگرنو کاریان پێ کردوە، وەئەوەشی کەلەکتێبەکـەی خـوا واتـە لـەقورئانو لەسوننەتی پێغەمبەرەکـەی دانـەبێتو لەلاڕا هێنرا بێت فڕێ یان داوەو وەلایان ناوەو نەبڕوایان پێ ی هـەبوەو نەکاریشیان پـێ کردوە، لەبەر ئەمەش بوە هـیچ جیاوازیو جیاڕاییـەك لەنێوانیانـدا ڕوی نـەداوە لـەبواری بیروباوەڕ(العقيدة)دا، بەڵکو بیروباوەڕیان یەك بوە، و یەك ڕیزو یەك کۆمەڵ بـون، چـونکە خـوای گـەورە دەسـتەبەرو گرێنتـی داوە بەئـەو کەسـانەی کەدەسـت گرتـون بـەقورئانو بەسوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺکەلەسەر یەك وشـە(الكلمـــة) کۆیـان بکاتـەوە، وەلەسـەر بیروباوەڕێکی ڕاستەقینەو یەك بەرنامەو یەك مەنهەج یەکیان پێ بگرێـتو پـێ دامەزراوو کۆیان بکاتەوە. ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ ﴾سورة آل عمران: (١٠٣). هەروەها دەفەرموێت:﴿ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ

﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى﴾[٥]. هەر لەبەر ئەمەشە ناو نراون دەستە یاگروپی ڕزگار بو لەئاگری دۆزەخ(الفرقة الناجية). چونکە پێغەمبەرﷺ لەو کاتەی کەهەواڵی پەرتەوازە بونی ئوممەتەکەی بۆ حەفتاو سی دەستەوو گروپ بەموسڵمانان ڕاگەیاند شایەدی ڕزگار بونی ئەو گروپەی دا، و فەرموی: هەر هەمویان دەچنە ناو ئاگری دۆزەخ تەنیا دەستەیەکیان نەبێت. وەکاتێك پرسیاری ئەوەی لێ کرا کەئەو دەستەیە کێن؟ فەرموی: {هي من كان على مثل ما أنا عليه اليوم وأصحابي}[٦].

ڕاستیەتی ئەم فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هاتە دی کاتێ هەندێ لەخەڵکی بیرو باوەڕە کەیان لەسەر بنچینەو بنەمای غەیری قورئانو سوننەت دامەزراند، لەسەر بنەمای زانستی کەلام(علم الكلام)و بنچینەی لۆجیکیو ژیریەك(المنطق) کەلە فەیلەسوفە یۆنانیەکانەوە بەمیرات بۆیان ماوەتەوەو لەفەلسەی یۆنانیو ناموسڵمانانیان وەرگرتوەو ڕاگوێزتوە، ئەوە بو بەهۆی ئەم پێ خزینو هەڵخلیسکانە لادانو پەرتەوازەییو جیا جیاییو پشت لەیەکتری کردن سەری هەڵ داو بیروباوەڕەکەیان پەرتەوازەی تێ دەکەوتو ئەنجام جیاوازی کەوتە وشەو گفتاریانەوە، کۆمەڵی موسڵمانان جیاڕاو پەرتەوازە بون، ئەنجام درزو کەلەبەر کەوتە ناو تەلارو بینایەی کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە هەر وەکو ئێستا بەچاوی سەری خۆمان دەیبینین.

*** *** ***

---

([٥]) أ ــ سورة طــه: (١٢٣).

ب ـ واتە: ئەگەر هێدایەتو ڕێگەی ڕاستی منتان بۆ هات ، بەدڵنیاییەوە ئەوەی شوێن ئەو ڕێنومایيەی من بکەوێتو دەست بەئایینی منەوە بگرێت هەرگیزاو هەرگیز ڕێگەی ڕاستی لێ گوم نابێتو سەری لێ ناشێوێتو گومڕا نابێت. وەرگێڕ

([٦]) أ ــ رواه الإمام أحمد.

ب ـ واتە: ئەوەی لەسەر ئەو ڕێگەو بەرنامەیە بڕوات کەئێستا منو هاوەڵەکانم لەسەری دەڕۆین. وەرگێڕ.

## بەشــی سێ یەم

## لادان لەبیروباوەڕو ڕێگاکانی خۆپارێزی لێ ی.

لادانو خلیسـکان لـەبیروباوەڕی ڕاسـتقینەی ئیسـلام تێـدا چـونو ون بونـە، چـونکە بریوباوەڕی ڕاستەقینە پاڵنەرو فاکتەرێکی بەهێزە بۆ کار کردنی بەسود(العمـــل النــافع)، تاکی کۆمەڵ بەبێ بیروباوەڕی ڕاستەقینەو دروست نێچیرێکە بۆ ئەندێشـەو بیرو خەیاڵە پڕو پوچەکانو دودڵیو ڕاڕاو نائارامی یەکان کەلەوانەیە سات بەسات لەسەر دڵو دەرونو مێشـکی دا کەڵەکـە بـبنو ببنـە پەردەیـەکی ڕەشو بۆگـەن بەسـەر چـاوی داو سۆمای چـاوەکانی دابپۆشـنو ڕێگـای ڕۆشـنو ژیـانی بەختـەوەریو سـەرفرازیان پـی نـەبێنێت ، هەتاکو بەجۆرێکی وا تەلارەکانی ژیانی ئەوەندە لێ تەسك دەبنـەوە(کـورد گۆتـەنی کونـە مشکی لێ دەبنە قەیسەری ـ وەرگێڕ ـ) بەدوا دەرویەك دا دەگەڕێت لەکەلـەو ژیانـە ئـاڵۆزو تەنگەبەریو ناخۆشە ڕزگاری ببێـت جانەگـەر بـەخۆ کوشـتنیش بێـت، هـەروەکو ئێسـتا لەژیانی زۆرێك لەتاك تاکەکانی کۆمەڵگەدا دەیان بینین کەڕێگای سەرفرازیو بەختەوەری بێروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسـلامیان گـوم کـردوەو لـەزەلکاوی بـی بـاوەڕیو گـومڕایی دا دەژین. ئەو کۆمەڵگەیەی کـەبیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسـلامی لەدەسـت داوە ژیـانێکی ئاژەڵ ئاسا دەژیـەنو کۆمەڵگەیـەکی ئـاژەڵینو هـەمو بنـەماو کۆڵکـەو ڕاگرەکـانی ژیـانی سـەرفرازیو بەختـەوەریان گـوم کـردوە، هـەر چـەندە زۆرینـە ڕاگـرو بنـەماکانی ژیـانی ماددیشـیان لەدەسـت دابێـت کـەزۆر وایـە بـەرەو هەڵوەشـانەوەو لەبـەر یـەك چـونو داڕوخانیـان دەبـات، هـەروەکو بەچـاوی خۆمـان ئـەم ڕاسـتیانە لەکۆمەڵگـە کـافرو بێباوەڕەکانـدا دەبیـنین، بـۆ؟ چـونکە ئـەو بنـەماو کۆڵکـە مادیانـە هەمیشـە پێویسـتیان بەئاراستە کردنو دەسـتگیرۆییو ڕێنومـایی هەیـە بـۆ سـود وەرگـرتن لـەو سـودو کەڵكو تایبەتمەندیانە، دیارە گومانی تێدا نیـە کـەهیچ ئاراسـتەکارو ڕێنومایـیەکی تـر نیـە ئـەم تایبەتمەندیە بێنێتە دی جگە لەبیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام، هەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِـــنَ الطَّيِّبَـــاتِ وَاعْمَلُـــوا صَـــالِحًا ﴾[٧]. وەهـەروەها

([٧]) أ ـــ سورة المؤمنون: (٥١).

دەفـەرموێت:﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ ۝ أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ۝ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ ۝ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾(٨).

**دەی هێزی بیروباوەڕ پێویستە لەهێزی ماددی جیا نەکرێتەوە، ئەگەر بێت و لێك جیا بینەوەو بەرەو بیروباوەڕی پوچەڵ لابدات، ئەوا بەبێ ئیمان و بیروباوەڕ هێزی ماددی دەبێتە هۆکارو فاکتەرێکی تێك دەرو هەرەس هێنەرو سەرەنگوم و سەرەو لێژ بونەوە،**

---

ب ـ واتە: ئەی نێردراوان و پێغەمبەرانی خوا بخۆن و بخۆنەوە لەشتە حەڵاڵ و پاکەکان و کردەوەو کاری چاك بکەن و لەخوا بەولاوە هیچ کەس وهیچ شتێکی تر مەپەرستن و بەندایەتیان بۆ مەکەن. وەرگێڕ.

(٨) أ ـ سورة سبأ (١٠ ـ ١٣).

ب ـ واتە: ئێمە بەخشش و نازو نیعمەتی خۆمان بەداود بەخشی بو، وەفرمانمان بەچیاکان و باڵندەو دارو بەردەکان دا بو کە کاتێ ویردەکانی(مزامیر) دەخوێنێتەوە لەگەڵی دا بڵێنەوە، جاکەلەگەڵیاندا دەگوتەوە تابلۆیەکی خۆش دروست دەبو . چونکە داود دەنگ و سەدایەکی خۆشی هەبو. هەروەها ئاسنمان بۆ نەرم کردبو بێ ئەوەی گەرمی بکات. ئەمەش یەکێکە لەو موعجیزانەی کەخوا بەداودی بەخشی بو، فرمانمان بەداود کرد کەلەئاسن زرێی فراوان و درێژ دروست بکات، بەرێك و پێکی ئاڵقەکانی بگەیەنێتە یەك و لەیەکتریان گیر بکات، بەشێوەیەك لەکاتی جەنگدا بتوانرێت خۆی پێ بپارێزرێت هەروەها ڕمیش نەچێت بەنێوان ئەڵقەکانی دا. هەروەها پێ ی دەفەرموێ: خۆت و ئەوانەشی وان لەگەڵی دا کەکردەوەی چاك بکەن، بێگومان من ئاگادارو بینام بەو کردەوانەی کەئەنجامیان دەدەن، ئێمە بامان ڕام کرد بو بۆ سلیمان تابەپێ ی فرمانەکانی ئەو بڕوات بەڕێوەو کارەکانی بۆ ڕابپەڕێنێت، بەشێوەیەك ماوەی ڕۆیشتنی مانگێك ڕێگا لەدانە ڕۆژێکدا ببڕێت، هەروەها لەو سەریشەوە ماوەی گەڕانەوەی بەدانە ڕۆژێکی تر ببڕێت. هەروەها کانگای مسمان بۆ دەرخست و بۆمان نەرم کرد، هەندێك جنۆکەشمان خستنە ژێر دەستەلات و فەرمانیەوە بەمۆڵەتی خوای گەورە فرمانەکانی جێ بکەن و هەرچی بیەوێت بۆی دروست بکەن. جائەگەر هەر کامێك لەوجنۆکانە لەفرمانی ئێمەی لابدایە ئەوا سزای ئاگری دۆزەخی توندو تیژمان پی دەچەشتن. ئەو جنۆکانە کۆشك و تەلارو پەیکەرو مزگەوت و شوێنی خواپەرستی و تەشت و سینی گەورە گەورەی وەك حەوزو مەنجەڵی گەورەی وایان بۆ سلێمان دروست دەکرد. ئەوەندە گەورە بون لەجێگە خۆیان نەدەجولێنران. ئینجا خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئالی داود سوپاسگوزاری نازو نیعمەت و بەخششەکانی خوای گەورە بکەن هەر چەندە کەمێك نەبێت لەبەندەکان سوپاسگوزاری خوا نابن و شوکرانە بژێر نین. تەفسیری گوڵشەن ب٢ل١١١٤ـ١١١٥. وەرگێڕ.

هەروەکو ئەمڕۆ لەوڵاتو دەوڵەتە کافرەکاندا کەهێزی ماددی زۆریان لەبەر دەس دایە دەیبینین، بەڵام لەبیروباوەڕی ڕاستەقینە بێ بەشو ماڵ وێرانن.

## وەلادان لەبیروباوەڕی ڕاستەقینە کۆمەڵێك هۆکارو فاکتەری هەن پێویستە بیان ناسین، گرنگەکانیان:

(١) نەشارەزایی‌و تێنەگەیشتن لەبیروباوەڕی ڕاستەقینە: بەهۆی پشت هەڵ کردن لەفێر بون‌و فێرکردنی بیروباوەڕ، یاخود کەمتەرخەمی‌و گوێ نەدان‌و گرنگی نەدان بەبیرو باوەڕی ئیسلامی هەتا وای لێ دێت بەرەیەك پەیدا دەبێت بیروباوەڕی ئیسلامی هەر ناناسێت‌و نازانی چیشە!! چاك‌و خراپی لی تێکەڵ دەبێت نازانێ کامە پێچەوانەو دژەکانی بیروباوەڕی ئیسلامین، و هەق بەناهەق دەزانێت‌و ناهەقیش بەهەق، هەروەکو عمری کوڕی خەتتاب ـ رضي الله عنه ـ گوتویەتی:( پایەکانی ئیسلام یاگرێ یەکانی ئیسلام گری لەدوای گرێ دەبنەوە هەتاکو کەسانێك یابەرەیەك لەئیسلامدا پەیدا دەبن نازانن نەفامی هەر چیشە).

(٢) دەمارگیری‌و پابەند بون بەو بیروباوەڕو ڕێچکانەی کەباوك‌و باپیران لەسەری بون: دەست گرتن بەو بیروباوەڕە هەر چەندە پوچەڵ‌و بەتاڵیش بێت، پشت کردن لەدژو پێچەوانەکانی ئەو دەمارگیریە هەر چەندە ڕاست‌و هەقیش بێت. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾ ([9]).

(٣) لاسایی کردنەوەی کوێرانە: بەشوێن کەوتنی قسەو قسەڵۆکی خەڵکی لەبواری بیروباوەڕدا بێ ئەوەی بەڵگەو نیشانەی ڕاستی‌ودروستی بپرسن یابزانن، و بێ

---

([9]) أ ـ سورة البقرة: (١٧٠).

ب ـ واتە: شوێن کەوتەکانی شەیتان لەجولەکەو گاورو دیانەکان‌و موسڵمانە شلەژاوو بڕوا شلۆقەکان ئەگەر پێ یان بگوترایە شوێن بەرنامەو یاسای خوا بکەون، دەیان گوت: نەخێر ئێمە تەنیا شوێن باوك وباپیرانی خۆمان دەکەوین‌و لەسەر ئەو بەرنامەیە دەڕۆین کەئەوان لەسەری بون، دەی باشە مەگەر باوك‌و باپیرانیان کەسانێکی گومڕاو سەر لێشێواو نەبون، هیچ عەقل‌و ژیریەکیان نەبوو عەقڵیان بەڕێگەو بەرنامەی خوا نەدەشکاو عەقڵ کول بون. وەرگێڕ بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل ٦٧.

ئەوەی بزانن تاكوی ڕاستەو چەندە هەڵەیە، هەروەكو لەواقعیەتی دەستەو گروپە پێچەوانەكانی قورئان‌و سوننەت دا دەیبینین لەجەهمەیەكان‌و موعتەزیلەكان، ئەشعەریەكان‌و صۆفیەكان،و غەیری ئەوانیش ڕویاندان كەلاسایی پێشەوا گومڕاكانی پێش خۆیان دەكردەوە، تا گومڕاو سەرلێشێواو بون‌و لەڕێگەی ڕاستی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام لایان دا پێ یان هەڵخلیسكا.

(٤) زێدە ڕەوی لەئاستی خۆشەویستانی خواو پیاو چاكاندا(الأولياء والصالحين): لەپلەو پایەی خۆیانیان تی پەڕاندن، بەجۆرێكی وا بیروباوەڕیان وابو كەئەوانە جۆرە كارو كردەوەیەك دەكەن كەلەخوا بەولاوە لەتوانای هیچ كەسێكی تر دا نەبوەو نیە، لەسود پی گەیاندن‌و لادانی زیان‌و بەڵاو موسیبەتەكان وەكردنیان بەواسیتە لەنێوان خوای گەورەو لەنێوان خەڵك‌و دروستكراوەكانی خوا بۆ جێ بەجێ كردنی پێداویستیەكانیان‌و وەڵام دانەوەی دوعاكانیان، تاكارەكە بەوە گەیشتوە بەندایەتی كردن بۆیان جگە لەخوای گەورە (واتە بەندایەتی كردن بۆ غەیری خوا چ بۆ بت‌و سەنەمەكان‌و چ بۆ ئەستێرەو هەسارەكان‌و كەس‌و بەرنامەو ماڵی دنیاو گۆڕ پەرستان‌و پیرو پیاو چاك‌و مەزارەكان‌و...تد. وەرگێڕ.)، وەخۆ نزیك كردنەوە لێ یان بەهۆی قوربانی كردن‌و سەربڕین لەسەر گۆڕو مەزارەكانیان‌و نەزر كردن بۆیان، هەروەها دوعا وپاڕانەوە لێ یان‌و هانا بۆ بردن‌و داوای مەدەد كردن لێ یان، هەروەكو ئەمە لەگەلی نوح دا ڕوی دا بەرامبەر بەپیاو چاكانیان كاتێ گوتویانە:﴿ وَقَالُوا لاَ تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلاَ تَذَرُنَّ وَدًّا وَلاَ سُوَاعًا وَلاَ يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴾[10]. هەروەها لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەزۆرێك لەوڵاتاندا لەلایەن گۆڕ پەرستانەوە ئەم بیروباوەڕە هەڵەو چەوتە باوەو ڕوی داوە.

---

([10]) أ- سورة نوح: (٢٣)

ب - واتە: گەورەو سەركردەكانی گەلی نوح بۆ ڕێگا گرتن لەبڕوا هێنانی خەڵكی جۆرە پلان‌و فرۆفێڵێكی زۆر گەورەیان دروست كردو بەشوێن كەوتوانی خۆیانیان دەگوت: نەكەن هەرگیز دەست لەخواكانی خۆتان هەڵ بگرن واتە لەبت پەرستی‌و نەكەن واز لەوەددو سواع‌و یەغوپ و یەعوق‌و نەسر بهێنن.كەئەمانە كاتی خۆی لەناو گەلی نوح دا پیاو چاك بون. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٥٢٨.

(٥) بێ ئاگایی‌و ورد نەبونەوەو پشت هەڵکردن لەبەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورە لەم بونـەوەرو لـەم گەردونـە پـان‌و پـۆڕەدا: پشـت کـردن‌و ورد نەبونـەوەو تێڕا نەمان لەبەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورە لەبونەوەر(الكون)و ئایەتە قورئانیەکان‌و ڕو کردن‌و شانازی کردن بەدەستکەوتە شارستانە ماددیـەکان، بـەجۆرێك وا گومـان دەکەن کەئەم جۆرە کارانـە بەتـەنیا لـەتوانای مرۆڤدایە. بۆیە مرۆڤیـان بەگـەورە دانـاوەو دادەنـێن، وەئـەم نـازو نیعمـەت‌و دەسـتکەوتانە دەخەنـە پـاڵ هـەوڵ‌و تێکۆشان‌و زیرەکی‌وداهێنانی مرۆڤ. نەك لەبەخشش‌و نیعمەتـەکانی خـوای گـەورە. هەروەکو قارون لەڕوی موسادا دەی گوت:﴿ قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾ سورة القصص: (٧٨). هەروەکو مرۆڤ دەڵـێ:﴿هَـذَا لِـي﴾ فصـلت: ٥٠. واتـە: ئەمـەم بەئازایەتی‌و زیرەکی‌و بلیمەتی خۆم پەیدا کردوە. هـەروەها:﴿ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ ﴾ سورة الزمر: (٤٩). بێ ئەوەی بیر بکەنەوەو بڕواننە گەورەیی‌و دەسەلاتی لـەبن نەهاتوی ئەو کەسەی کەئەو هەمو بونەوەرو گیـان لەبەرانـەی هێناونەتـە دی‌و ئـەو هـەمو جیاکـاری‌و تایبەتمەندی‌ودەسـتکەوت‌و نـازوو نیعمـەت‌و بەهرەیـەی پـێ بەخشیون‌و مرۆڤی هێناوەتە دی‌و ئەو هەمو هێزو دەسەڵات‌و توانایـەی پێداوە بـۆ هێنانە دی ئەو هەمو تایبەتمەنـدی‌و جیاکاریانـەو سودیان لێ وەربگرێت:﴿ وَاللَّـهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾([11]). هەروەها دەفـەرموێ:﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّـمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾([12]). هەروەها دەفەرموێ:﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ

---

([11]) أ ـ سورة الصافات: (٩٦).

ب ـ واتە: ئیبراهیم بەگەلەکەی گوت: ئەمانە چین ئێوە دەیان پەرستن؟ ئاخر خوای گەورە ئێـوەش‌و ئەوانەشی دروست کردون کەئێوە دەیان پەرستن. واتە ئێوەو ئەو شتانەشی دروست کردوە کـەئێوە بتیـان لێ دادەتاشن‌و دەیان پەرستن. وەرگێڕ لەتەفسیری گوڵەشەن.

([12]) أ ـ سورة الأعراف: (١٨٥).

ب ـ واتە: ئایا ئەوان واتە بێباوەڕان تەماشای موڵکی ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و هـەمو ئـەو شـتانەی کـەتیایان دایە ناکەن کەچۆن‌و بەچ شێوەیەك دروستی کردون‌و هێناونیە بون، چۆن وا بـەڕێك‌و پێکی‌و نزامێك دروستی کردون تاهێزو تواناو دەسەڵاتی خوایان بۆ دەر بکـەوێت‌و بـزانن‌و هۆشیان بێتـەوە بـەر کـەخوای گـەورە تـاك‌و

وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ۞ وَسَخَّر لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَينَ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ۞ وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾[١٣].

---

تەنیایەو هیچ هاوبەش‌و هاوەڵی نین، هەروەها بزانن کەکاتی مردنیان نزیك بوەتەوە. ئایا ئەوانە جگە لەقورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر بەچ شتێکی تر بڕوا دەکەن؟ وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب١.

([١٣]) أ ـــ سورة إبراهيم: (٣٢ ـــ ٣٤)

ب ـ واتە: هەر خوای تاکو تەنهایە کەئاسمانەکانی دروست کردون بەوهەمو خۆرو مانگو ڕۆژو گەلە ئەستێرەی وا تیایدان ڕازاندونیەوەو هەر یەکە لەبوارو مەودای خۆیاندا بێ زیادو کەم تارۆژی قیامەت دەخولێنەوە هەروەها زەوی بەو هەمو دەشتو دەرو

چیاو چۆڵ‌ودەریاو ڕوبارو ئەو هەمو شتانەی تیایدان دروست کردون ، هەروەها لەو زەویە ڕەقەنەدا بەهۆی بارانەوە گژو گیاو جۆرەها میوەهاتو بەروبومی دروست کردوە و کردونی بەڕیزق‌و ڕۆزی بۆ خۆتانان‌و بۆ مەڕو ماڵات‌و وڵساتەکانتان. هەروەها سروشتی ئاوی دەریاو ڕوبارەکانی وا لێ کردوە کەکەشتی‌و بەلەمەکان لەسەر پشتی خۆی هەڵ بگرێت‌و نقومی ژێر ئاو نەبن و بۆ ئێوەی مرۆڤی ڕام کردوە کەلەژیانی ڕۆژانەتاندا بەکاری بهێنن. ئەوجار ئاوی ڕوبارو کانیاوو هەمو ئاوەکانی ژێر زەوی وا دروست کردون کەبۆ خواردنەوەی مرۆڤ وگیاندارەکان بتوانن بیخۆنەوەو بەکاری بهێنن. هەر ئەو خوایە خۆرو مانگی بەجۆرێك دروست کردون کەبەدوای یەك دادێن‌و هەڵ دێن‌و ئاوا ببن، بێ ئەوەی بۆ چرکە ساتێکیش دوا بکەون‌و یالەمەودای خۆیان لابدەن، هەتا ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەو خولگەو لەو کاتەی کەبۆیان دیاریکراوە لانادەن‌و پاش‌و پێش ناکەن‌و لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن. بەهەڵهاتن‌و ئاوا بونی خۆر شەوو ڕۆژ دروست دەبێت. بۆ دیاری کردنی کاتەکانی ئیش‌و کار تیادا کردنی مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی ڕزق‌و ڕۆزی‌و کاتی شەو بۆ ئیسراحەت‌و تێدا حەسانەوەی مرۆڤەکان. خۆزگەر بەدرێژایی ساڵ هەر ڕۆژ بێت یاهەر شەو بوایە ژیانی مرۆڤ نەدەچوە سەر و مرۆڤ پەکی دەکەوت. هەرچی داواتان کردوەو دڵتان دەیخوازێ خوای گەورە پێ داون، دەی ئەگەر بتانەوێ نازو نیعمەت‌و بەخششەکانی خوا بژمێرن ئەوەندە زۆرن ناتوانن، چونکە بەخششەکانی خوای گەورە بۆ ئێوە ئەوەندە زۆرن هەرگیزاو هەرگیز نایەنە ژماردن، هەر لەجەستەو لەشی خۆتان بنۆڕن هەر ئەندامێك لەو لاشەی خۆتان بیگرن بەخشش‌و نازو نیعمەتێکە کەخوای گەورە پێ ی بەخشیون . بابچوك ترین ئەندامێك تان نەبێت ژیانتان دەکەوێتە هەراسان‌و بێزار دەبن‌و ئازار دەخۆن. جا ئای بەڕاستی ئادەمیزاد ستەمکارو سپڵەیە بەرامبەر بەو هەمو نازو نیعمەت‌و بەخششانەی خوای گەورەو کەهەرگیز بیر لەو نازو بەخششە زۆرە ناکەنەوە کەخوای گەورە پێ ی داون و هەرگیزاو هەرگیز تەنیا بەزمانیش جاری لەجاران سوپاس‌و شوکرانە بژێری خوا

(٦) نەبونی ئاراستەو ئامۆژگاری پكو ڕاستەقینەی ئیسلامی لەزۆربێك لەماڵەكاندا: وای لی هاتوە زۆربەی ماڵو خانەوادەی موسڵمانان لەئامۆژگاری موسڵمانانەوئاراستە كردنی بڕوادارانە بێ بەشنو یان زۆر كزو لاوازە یان هەر نیەو خزیوەو ڕوەو تەوژمی دژ بە ئیسلام سەرەنگوم بونو تروسكایی بڕوا دەگمەنە تیایاندا، ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی :{كل مولود يولد على الفطرة فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه}([١٤]). گومانی تێدا نیە كەباوكو دایك ڕۆڵێكی گرنگیان هەیە لەپەروەردە كردنو ڕاست كردنەوەو ئاستو ڕێڕەوو بیرو باوەڕیو چاكیو خراپیو گۆش كردنی منداڵەكانیان بیرو باوەڕی باوكو دایكەكان چۆن بێتو ڕو لەكوێ بێت ئەوا بیروباوەڕو ڕوی منداڵەكانیشیان هەروا دەبێت مەگەر بەدەگمەن خوای گەورە هیدایەتی منداڵو وەچەكانیان بداتو بیان هێنێتە سەر ڕێگەی ڕاستی خوایی، ئەوان خراپ بن منداڵەكانیش خراپو ئەوان چاك بن منداڵەكانیش چاك دەبنو لەسەر ڕێچكەی باوكو دایكیان دەڕۆن.

(٧) پەردە پۆش كردنو كپ كردنەوەی هۆكارەكانی پەروەردەو فێر كردنو ڕاگەیندنەكان: لەزۆربەی زۆری جیهانی ئیسلامی دا هۆكارەكانی پەروەردەو فێر كردنو ڕاگەیاندنەكان كپ كراونەوەو ڕوپۆش كراونو لەئەنجامدانی گرنگیو ئەركەكانی سەرشانی خۆیان لادرانو فریو دراونوچاوبەستەكێ یان لی كراوەو بەرچاو لێڵو لیخن كراون، ومەنهەجو بەرنامەی پەروەردەوفێر كردن بەزۆری وایە كە گرنگی یەكی ئەوتۆ بەپەروەردە كردنو فێر كردنی ئایین نادرێتو پشت گوێ خراون، یان لای لێ هەر ناكەنەوەو بەتەواوی فرێدراوەو وەلا نراوە، و هۆكارەكانی ڕاگەیاندنی بینینو بیستنو خوێندنەوە بەزۆری بونەتە ئامرازو ئامێرێكی تێك دەرو

---

ناكەن. وادەزانن هەر لەخۆوە یان بەهێزی شانو شەوكەتی خۆیان ئەو هەمو نازو نیعمەتە هاتونەتە دی. ! ! ! وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ ٦٤١-٦٤٢.

([١٤]) أ ـ أخرجه الشيخان.

ب ـ واتە: هەر كەسێك هەر منداڵێك كەلەدایك دەبێت لەسەر ئایینی فیترەتی ئیسلام لەدایك دەبێت ، دوایی باوكو دایكی لەو ئایینەی وەردەگێڕنو دەیكەن بەجولەكە یان گاور یا بەئاگر پەرست. وەرگێڕ.

داڕوخێنـەرو لادەرو وێرانکـەری تـەلاری ئیسـلام، یـان بایـەخ و گرنگـی دەدەن بەشـتانێکی مـاددیو ڕابواردنوخشـگوزەرانی دنیـایی هـەڵ فریوێنـەر، هـەرگیزاو هەرگیز گرنگیو بایەخ نادەن بەو لایەنو هۆکارانـەی کـەئاکارو ئەخلاقـەکان ڕاست دەکاتەوەو دادەمەزرێنێت، ودەبێتە هۆی چاندنو گەشـە پـێ کردنـی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام، بـەرگریو مـل ملانـێ لەگـەڵ تەوژمـە لادەرو بۆگەنەکـەکان دەکات، بۆ ئەوەی بەرەیەکی بڕوا قرچۆكو بێ هێـزو لاوازو گۆشـەگیرو خـەریك بـو تەنیا بەنەفسی خۆیو گێژو سـەر سـڕو بـێ ئاگـاو بـێ دەسەڵات لەبـەر دەم هێـزو سـوپاکانی بێبـاوەڕانو لـەڕوی مولحیـدەکانو کلـكو وابەسـتەو بـەکرێگیراوو دوڕوەکانیانو بەرەیەکی فشەڵۆكو بێ بەرگرىو هەرگیز بیر لەسەر بەرز کردنـەوەو بەرگری لەخۆ کردن نەکەنەوە.

**ڕێگاکانی خۆ پارێزی لەم لادانو داخزینە لەم چەندا خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:**

(١) گەڕانەوە بۆ کتێبەکەی خوای گەورە واتە بۆ قورئانی پیرۆز: باشـترینو یەکسـاتە ترین چارەسەریەك بۆ ڕاست کردنـەوەو ڕزگـار بـون لـەم تەنگژەیـە گەڕانەوەیـە بـۆ قورئانی پیرۆزو بۆ سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەدیهێنانـەوەو دامەزراندنـەوەی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام، چونکە کۆتایی ئـەم ئوممەتـە چـاك نابێتـەوە بـەو بیروبـاوەڕە نـەبێت کەسـەرەتای ئـەم ئوممەتـەی پـێ چـاك بـوە. هـەروەکو چـۆن پێشینەی پیاو چاکان بیروباوەڕەکەی خۆیان لێ هەڵ دەهێنجاو لەسەریان دامەزرانـد بو، کۆتایی ئەم ئوممەتە هەر بەو بیروباوەڕە چاك دەبێتـەوەو کەسـەرەتاکەی پـێ چاك ببـو، لەگـەڵ شـارەزا بـونو ئاگـاییو ناسـینی بنچینەو بنـەمای بیروبـاوەڕی دەستەو گروپـە لادەرو گومڕاو سەرلێشـێواوەکان، هـەروەها ناسینو ئاگـادار بـون لەگومانەکانیان بۆ بەرپەرچ دانەوەو ئاگاداری دانو هۆشیار کردنەوەی موسڵمانان لێ یان، چونکە هەر کەسێك شەڕو خراپە نەزانێتو نەناسێت ناتوانێت یانازانێت کەخۆی لێ بپارێزێتو بـەئاگا بێـت لێ یو دور نیـە کـەتێ ی بکـەوێت. ((هـەروەکو دەڵـێن: (الأشياء تعرف بأضدادها) واتـە شـتەکان بـەدژەکانیان دەناسـرێنەوە، بۆیـە ئێمـەی

موسڵمانیش پێویستە هەمو دژو پێچەوانەکانی بیروباوەڕەکەمان بناسین‌و ئاگاییمان لێ یان هەبێت، بۆ ئەوەی خۆیان لێ بپارێزین‌و هۆشیاری بدەین بەموسڵمانان ـ وەرگێڕ ـ)).

(٢) گرنگی دان‌و بایەخ دان بەخوێندن‌و لێکۆڵینەوە لەبیروباوەڕی ڕاستەقینە ـ بیروباوەڕی پێشینەی پیاو چاك ـ لەقۆناغە جۆربەجۆرەکانی خوێندن، بەشە وانەی تەواویان بۆ دابنرێت لەمەنهەجی خوێندن‌و بایەخ‌و گرنگی تەواویان لەسەیر کردن‌و بەوردی پیاچونەوەی تاقی کردنەوەکان لەکاتی تاقی کردنەوەی ماددەی ئاییندا.

(٣) پێویستە بڕیار لەسەر خوێندنی کتێبەکانی پێشینەی ساف‌و پاك بدرێت، خۆدور بگرن لەخوێندنی کتێب‌و سەرچاوەکانی دەستەو گروپە لادەرو گومڕاکانی وەك سۆفیگەرێتی، تازەگەرو داهێنەرەکان(الصوفية والمبتدعة)، جەهمی‌و موعتزیلەکان، ئەشعەریەکان‌و ماتوریدیەکان، و جگە لەوانیش تەنیا بۆ ئەوە نەبێ بیان ناسن‌و ئاگاییتان هەبێت لەسەریان بەڵکو بۆ بەرپەرچ دانەوەیان لەو پوچەڵی‌و باتڵیەی کەتێ یان دا هەیەو بۆ ئاگایی‌و هۆشیاری دانی موسڵمانان بۆ دور کەوتنەوەو خۆ پارێزی لێ یان.

(٤) بانگەوازی کردنی چاکخوازان‌و بانگەوازکاران بۆ نوێ کردنەوەی بیروباوەڕی پێشینە بۆ خەڵکی: پێویستە موسڵمانان بەگشتی‌و بانگەوازکاران‌و چاکخوازان(دعاة المصلحين) بەکاری بانگەوازی وبانگ کردنی خەڵکی هەڵ بستن بۆ سەر لەنوی نۆژەن کردنەوەی بیروباوەڕی پێشینەی پیاو چاك بۆ خەڵکی، سەرلێشێواوی‌و لادانی گومڕایی سەر لێشێواوان‌و گومڕاو لەدین لادەران وەلا بنێن‌و بن بڕو ڕیشە کێشیان بکەن.



## دەرگـــای دوەم

## ڕونکردنەوەی واتای تەنها خوا پەرستیو جۆرەکانی

تەنها خوا پەرستی(التوحيد): بریتیە لەبەتاك دانانی خـوای گـەورە لەدروست کـردنو بـەدیهێنانو هەڵسـوڕاندنی کارو بـاری گـەردون(بونـەوەر ـ التـدبر الکـــوني) ، هـەروەها ئیخلاسیەتو نیاز پاکی بۆ خـوای گـەورە لەبەندایـەتی کـردنو پـەرستشـی دا، واز هێنـان لەهەمو بەندایەتی کردنو پەرستشیەك بۆ غـەیری خـوای گـەورە، ددان نـانو سـەلماندنی هەمو ناوە جوانو سیفاتە پیرۆزەکان بۆ خوای گەورە، پاك ڕاگرتنـی خـوای گـەورەو دور گرتنـی لەهـەمو عـەیبو خـەوشو ناتەواویـەك. بـەم پێناسـەیەی کەلەسـەرەوە کردمـان هەرسێ جۆرەکانی بەتەنها خوا پەرستی دەگرێتەوە، کەبەم شێوەیەی خوارەوەن:

### ١ـ بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی

بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی لەم چەند لقانەی خوارەوە پێك دێت:

* لقی یەکەم: ڕون کردنەوەی واتای تەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی، فـیترەتو ددان پێدا هێنانی هاوبەش پەیدا کەران بەپەروەردگارێتی خوا.

* لقی دوەم: ڕونکردنەوەی چەمکی وشە یازاراوەی پەروەردگار لـەقورئانو لەسـوننەتدا، و بیرو بۆچونو تێڕامانی ئوممەتە گومڕو سەر لێشێواوەکان لە بابەتی پـەروەردگارێتی دا ، وە بەرپەرچ دانەوەیان.

* لقی سێ یـەم: ڕونکردنـەوەی ملکەچـی بونـەوەر وپێشـەوایەتیو گوێڕایـەڵی کـردن بـۆ خوای پەروەردگار.

* لقی چوارەم: ڕونکردنەوەی مەنهەجو بەرنامەی قورئان لەچەسپاندنو سەلماندنی تاكو تەنایی خوای گەورە لەبەدیهێنانو دروست کردنو بەدیهێنانو ڕزقو ڕۆزی دانو جگە لەوانەش.

* لقی پێنجەم: ڕونکردنەوەی پەیوەست بونی بەتەنها خوا پـەرسـتی پـەروەردگارێتی بـە تەنها خوا پەرستی خوایەتی(توحيد الألوهية).

  

## بەشـی یەکەم

**ڕون کردنەوەی واتـای تەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی، فیترەتو ددان پێدا هێنـانی هاوبەش پەیدا کەران بە پەروەردگارێتی خوا.**

تەنها خوا پەرستی: بەواتا گشتی یەکەی بریتیـە لـەبڕوا بـون بەتـەنهایی خـوای گـەورە لەپەروەردگارێتی دا، و نیاز پاکیو ئیخلاسیەت بۆ خوای گـەورە لەبەندایـەتی بـۆ کـردنو پەرستشی دا، هەروەها چەسپاندنو سەلماندنی ناوە جوانو سیفەتە بەرزەکان بۆ خـوای گەورە. ئەمەش سی جۆرن کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

تەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی، تەنها خوا پەرستی خوایـەتی، تـەنها خـوا پەرسـتی لەناوو سیفاتەکان. هەر یەکێ لەم جۆرانـە چەمکو واتـای خۆیـان هەیـە کەپێویسـتە ڕون بکرێنەوەو بناسرێنو لێ یان حاڵی بیت، بۆ دەست نیشان کردنو سنور دانـانی جیاوازیو جیاکاریەکانی ئەو جۆرە تەنها خوا پەرستیانە:

١ـ بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی:

بریتیە لەبەتاك دانانی خـوای گـەورە لـەکارو فرمـانو کاریگەریـەکانی دا، بـەوەی بـڕوا وابێـت کـەخوای گـەورە بـەتاکی تـەنێو تـەنیا خـۆی دروسـتکەرو بەدیهێنـەری هـەمو دروستکراوەکان یا هەمو بونەوەرە:﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ سورة الزمر: (٦٢). ئەو خوایـە ڕۆزی دەری هەمو گیان لەبەرو مێشو مەگەزو ئادەمیزادەکانە:﴿ وَمَا مِنْ دابَةٍ فِي الْـأَرْضِ إِلاَّ عِلَى اللهِ رِزْقُهَا﴾ (١٥).

ئەو خوای تاكو تەنیایە خاوەنی هەمو خاوەندارێکە، وپاشای پاشایانە، خـاوەنی هـەمو شتێکە لەو بونەوەرەدا، بەڕێوەبەرو هەڵسـوڕێنەری کاروبـاری هـەمو جیهـانو جیهانیانـە، هەر ئەوە دادەنێـتو دادەمـەزرێنێتو لادەدات واتـە هـەر ئـەوە حوکمو موڵكو سامانو دەسەڵات دەدات بەئادەمیزادەکانو هەر ئەویش لـەکاریان لادەداتو سـەرو سامانو مـاڵ

(١٥) أ ـ سورە هود:٦.

ب ـ واتە: هەرچی گیان لەبەرێكو هەرچی شـتێکی پـێ بنێـت بەسـەر ئـەم زەویـەدا ڕزقو ڕۆزی لەسـەر خوای گەورەیە. وەرگێڕ.

لەئادەمیزادەکان دەستێنێتەوە، بەرز دەکاتەوەو نزمو سەر شۆڕ دەکاتو بڵند نەوی دەکاتو نەویان بڵند دەکات، تواناو بەدەسەڵاتە بەسەر هەمو شتێکداو شەوو ڕۆژ بەدوا یەك دا دێنێت، شەو بەدوای ڕۆژدا دێنێتو ڕۆژ بەدوای شەودا، دەمرێنێو دەژیەنێت، زیندو لەمردو دەردێنێو مردوش لەزیندو:﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ۞ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الَمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ([16]).

---

([16]) أ ـ سورة آل عمران (٢٦ ـ ٢٧).

ب ـ واتە: ئەی محمد ﷺ بەبێباوەڕانو هاوەڵ دانەرانو مولحیدو خوا نەناسان بڵێ تەنیا خوا خاوەنی هەمو خاوەندارێکەوو هەر ئەو خاوەنی دەسەڵاتی ڕاستەقینەیەو هەر کەسێکی ئارەزو لێ بێت دەسەڵاتو موڵكو سامانی پێ دەبەخشێت بەپێ ی ئەو یاساو ڕێساو سیستەمەی کەخۆت بۆت داناونو داتمەزراندوە، هەر کەسێکیش حەزت لێ بێت ئەو موڵكو سامانو دارایی و دەسەڵاتو سەرۆکایەتیو بەرپرسیەتیەی لێ دەستێنیەتەوە، باڵا دەستان ژێر دەستە دەکەیتو ژێر دەستان باڵا دەست دەکەیت، هەر کەسێکت ویست زەبونو ژێر دەستەی دەکەیتو هەروەها بەپێچەوانەوەش، دەی خوایە گیان هەمو خێرو بەرەکەتو چاکەیەك هەیە هەموی جڵەوەکەی لەدەستی تۆدایە، و تۆ بەسەر هەمو شتێکدا باڵا دەستو زاڵیو دەسەڵاتی تۆ سەروی هەمو دەسەڵاتو هێزو توانایەکە. خوایە گیان هەر تۆی شەو بەدوای ڕۆژدا دێنیتو شەو بەدوای ڕۆژدا دێنیت بەپێ ی ئەو سیستەمو یاسایەی کەبۆت داناوە، هەر تۆی لەهاویندا ڕۆژ درێژ دەکەیتو بەشێك لەشەو دەخەیتە سەر ڕۆژ ئاوا درێژ دەبێت، هەروەها لەپاییزو زستاندا بەشێك لەڕۆژ دەخەیتەوە سەر شەوو بەم پێ یە شەو درێژ دەکەیت ، خوایە گیان هەر تۆی زیندو لەمردو دەردەهێنیتو مردوش لەزیندو دێنیتە دەر . هەروەکو دەبینین زەوی لەبەر بێ ئاوی وشك هەڵ دەگەڕێتو هەرچی سەوزە گیاو دارو درەختو کشتو کاڵ هەیە وشك دەبنو دەمرن، وەئەگەر باران باریو زەوی ئاو درایەوە زەویەکە هەل دەزەپێتو زیندو دەبێتەوەو هەرچی سەوزەو گژو گیاو دارو درەختەکان هەن زیندو دەبنەوەو سەر لەنوێ دەڕوێنەوە ...تد. بەڵێ هەمو تووێك چ هی ئادەمیزاد بێتو چ هی هەر گیانلەبەرو گژو گیاو میوەهاتێك بێت هەمویان بنەماو بناغەی ژیانێکی تایبەتی خۆیەتی و جیاوازە لەوی تر لەبەر ئەوە ئەو جۆرە ژیانانە بەجۆرێك لەمردن دادەنرێت. لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت: خودایە ! ئەوەی تۆ بتەوێت ڕزقو ڕۆزیو خێرو بەرەکەتی خۆتی پێ دەبەخشیتو بەبێ حیسابو بێ ژمارە بەپێ ی ئەو مەبەستو حیکمەتەی کەبۆ خۆت بۆت دیاری کردون. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل ١٢٦.

بێگومـانو زۆر بەدڵنیاییـەوە خـوای گـەورە بـەهیچ شـێوەیەك ڕازی نیـە كەهاوبـەشو یارمەتیدەرو شەریكی بۆ دانبێن لەخاوەندارێتیو موڵكو دەسـەڵاتی دا، هـەروەكو خـوای گەورە قەدەغەی كردوە كەلەدروستكردنو بەدیهێنانو ڕۆزیداندا هاوبـەشو یاریـدەدەری بۆ دابنرێت، هەروەكو دەفـەرموێت:﴿ هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِـهِ بَـلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾([17]) هەروەها خوای باڵا دەستو كاربەجێ دەفەرموێت:﴿ أَمَّنْ هَذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ﴾ سورة الملك: (٢١). (واتە: ئەوە كێ یە كەڕزقو ڕۆزیتان دەدات، ئەگەر ئەو ڕۆزیەتان لێ بگرێتەوەو نەتان داتێ كێ دەتوانێت جگە لەخوای گەورە ڕۆزیتان بدات. وەرگێڕ). هەروەها خوای گەورە تاكو تەنیایی خۆی لەپەروەردگارێتی دا بەسەر هەمو دروست كراوەكانی خۆی دا ڕاگەیاندوەو بەهیچ شێوەیەك قبوڵی نیە كەهیچ كـەسو هـیچ شـتێكی تـری لەگەڵ دا بكرێتە هاوبەشو هاوكار، ئەمەتە دەفەرموێت:﴿ الْحَمْدُ للّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ﴾ سـورة الفاتحة: (٢). هـەروەها دەفـەرموێت:﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَـهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾([18]).

---

([17]) أ ـــ سورة لقمان: (١١).

ب ـ واتە: ئەوەی دەیبینن لەم گەردونو لەم بونـەوەردا هـەموی دروسـتكراوو بـەدەهێنانی خـوای گـەورەن، دەی ئێوەش نیشانمان بدەن كەئەوانەی ئێوە جگە لەخوای گەورە دەیـان پـەرستن چیان دروست كـردوەو چ دەسەڵاتێكیان هەیە، ئاخر ئەوانیشو ئێوەش هـەموتان خـوای گـەورە دروسـتی كـردونو هـەموتان موحتـاجی دەستی ئەو خوایە باڵا دەستو كار بەجێ یەن. وەرگێڕ.

([18]) أ ـــ سورة الأعراف: (٥٤).

ب ـ واتە: خوای پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە كەهەمو ئاسمانەكانو هەمو ئەو گەردونەو زەوی لەشەش ڕۆژدا دروست كـردوەو لەنەبونـەوە هێناونیـە بـون، دوایش لەسـەر تـەختی پاشـایەتی مـوڵكی خـۆی كەهـەمو بونەوەرە سەركەوتو دەستی بەسەردا گرت، ئەم جیهانەشی وا دروست كـردوە كەخێراو بەپەلـە شـەو بەسـەر ڕۆژدا دێنێـتو ڕۆژیش لەشـەو دەردەكاتـەوە ، هـەروەها خـۆرو مـانگو ئەسـتێرەو كەشكەشـانە ئاسمانیـەكان كەبەملیارەها دەبنو ناژمێردرێن، دروست كردونو هەر هەموشی یان لەژێر دەسەڵاتو فرمانی خوای گەورەدانو بۆ چركە ساتێكیش لەژێر فرمانی خوا دەرناچنو هەر یەكەیان خولگەو(مدار) ی خۆی بۆ داناونو بێ پاشو پێش كردن بەو پەرشی ڕێكو پێكی دا دەخولێنەوە تارۆژی قیامەتو بەمو لێ ی لانادەن. وەرگێڕ. بەسـود وەرگرتن لەتەفسیری ناوبراول٢٨٥ـ ٢٨٦.

خـوای گـەورە هـەمو دروسـتکراوەکانی خـۆی وا دروسـت کـردون کەهـەر لـەزگماکی خۆیانەوە ددان بەتاکو تەنیایی خوای گەورەدا بنێن لەپەروەردگاریێتی دا، هەروەکو خۆی دفـەرموێت:﴿ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۞ ونسَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَـلَا تَتَّقُونَ۞ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنـتُمْ تَعْلَمُـونَ۞ و نسَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ﴾([19]).

ئـەم بەتـەنها خـوا پەرسـتی یـەی پەروەردگاریێتیـە هـیچ دەسـتەو هـیچ گروپێـك لـە ئادەمیزادەكـان دژی نەوەسـتاون، بـەڵكو دڵـەكان هـەر لـەفیترەتو زگمـاكی خۆیانـەوە ددانیان بەم جۆرە تەنها خوا پەرستیەدا هێناوەو پێچەوانەی نەوەستاونەوە، ئـەو خوایە لەوە گەورە ترو پیرۆز ترە کەلەفیترەتدا ددان بەغەیری ئەو دا بنرێت لەناو شتە بوەکاندا (الموجودات) ، هـەروەکو هـەمو پێغەمبـەرو نێردراوەکـانی خـوا ئـەم ڕاستیەیان گوتـەو داوایان کردوە هەروەکو خوای گەورە لەوانەوە بۆمان دەگێڕێتەوەودەفـەرموێ:﴿ قَالَـتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾([20]).

---

([19]) أ ــ سورة المؤمنون: (٨٦ ــ٨٩)

ب ـ واتە: پێ یان بڵێ: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانە بەو هـەمو گەلـە ئەستێرەو خۆر مانگو کەشکەشانەکانەوە و کێ پەروەردگاری عەرشی زۆرگەورەی خوایە، بێگومان لەوەڵامدا دەڵێن ئەوانـە هـەمویان هی خوای گەورەنو هەر ئەو پەروەردگاریانە، دەی تۆش ئـەی پێغەمبـەرﷺ پـێ یان بڵـێ دەی کـەوا دەزانـن بۆچی هۆش بەکار ناهێننو خۆتان لەو هەمو بیروباوەڕە پوچەڵو سەرلێشێواویو گومڕاییە ناهێننو لەتوڕەییو غەزەبی خوای گەورە خۆتان ناپـارێزن. ئـەوجار پـێ یان بڵـێ: خاوەنـدارێتی ومولکایـەتی هـەمو شـتێکی ئـەم بونەوەرە لەدەستی کێ دایە؟ و کێ کاروباری ئەم بونەوەرە هەڵ دەسوڕێنێتو بـەڕێوەی دەبـات؟ هـەر ئـەوە کەپەنای بۆ دەبرێتو پەنا دەرەو هیچ کەسیشی لەدەست دەرناچێتو کەسیش ناتوانێت کەسێکی تـر لەبـەر دەستی خوا ڕزگار بکاتو پـەنای بـدات، دەی وەڵامـم بدەنـەوە ئەگـەر چ دەزانـنو هـیچ تێدەگـەن! ! بێگومـان لەوەڵامدا دەڵێن ئەمانە هەموی بەدەستی خوانو هی ئەونو هەر ئەو کاروبارەکانی بونەوەر هەڵ دەسوڕێنێت ، جاتۆش پێ یان بڵێ: دەی کەوا دەزانن بۆچی وا جادوتان لێ دەکرێتو ئاوا سەرتان لێ دەشوێتو گومڕا دەبـنو ڕو دەکەنە بت پەرستیو واز لەپەرستی خوای پەروەردگارتان دەهێننو وا بـەم جۆرەو وازو هـەل دەخەڵـەتێن. لەتەفسیری گولشەن ب٢ل٨٧٨ـ ٨٧٩. وەرگێڕ.

([20]) أ ــ سورة إبراهيم: (١٠).

بەناوبانگ ترینو ناسراو ترین کەسێك کەبەئاشکرا نەفامیەتیو گومڕاییو سەر لێشێواوی خۆی ڕاگەیاند لەئینکار کردنو ددان نەنان بەخوای پەروەردگارو ڕەتی کردەوە فرعەون بو،، کەچی لەناخی خۆی داو لەژێرەوە لەبونی خوا دڵنیا بو هەروەك کاتێ موسا پێ ی گوت:﴿ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلاء إِلاَّ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ بَصَآئِرَ ﴾([21]).
هەروەها لەو کەسانەشی کەئەمڕۆ زۆر بی شەرمانەو بەئاشکرا ئینکاری بونی خوای پەروەردگار دەکەنێ کۆمۆنیستەکانو مارکسیەکانو مادده پەرستەکانن، ئەمانە لەڕوی خۆ بەزل زانیو خۆ بەدەرخستنەوە ددان بەبونی خوای گەورەدا ناهێنن، دەنا گومانی تێدا نیە کەدەبێ لەناخی خۆیانداو لەناو دڵدا دەبێ ددان بەبونی خوایەکی پەروەردگترو بەدیهێنەری خۆیاندا بهێنن، چونکە دەبێ بڕوایان بەوە هەبێت کەهەمو شتێکی بو یا بەدیهاتو دەبێ بەدیهێنەرێکی هەبێت، وەهەر دروستکراوێك دەبێ دروستکەرێکی هەبێت، هەمو شوێنەوارێك دەبێ خاوەنی ئەو شوێنەوارەی هەبێت یان دەبێ هەمو کارتێکراوێك کاریگەرێکی یا کارتێکەرێکی هەبێتو یان هەمو شوێن پێ یەك خاوەنی ئەو پێ یە یان پێ یەكێ هەبێت کەئەم شوێن پێ یەی بەجێ هێشتەوە. ئەوەت خوای گەورە دەفەرکوێت :﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ۞أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لاَّ يُوقِنُونَ ﴾([22]).

---

ب ـ واتە: پێغەمبەرو نێردراوەکانیان بەگەلەکانیان دەگوت: ئایا ئێوە هیچ گومانێکتان هەیە لەوەی کەتەنیا خوای پەروەردگار هەمو ئاسمانەکانو زەوی بەهەمو ئەو شتانەشی کەوان تیایاندا لەنەبونەوەو هێناونیە بونو دروستی کردون؟ وەرگێڕ.

([21]) أ ـ سورة الإسراء: (١٠٢).

ب ـ واتە: موسا بەفرعەونی گوت: تۆ چاك دەزانێت کەئەم تۆ موعجیزانە کەسی تر نەیناردونە خوار جگە لەخوای گەورە پەروەردگاری هەمو ئاسمانەکانو ئەم زەویەی کەئێمە لە سەری دەژیەین، وەبەو هەمو شتە سەیرو سەر سوڕهێنەرانەی کەتیایدان، کەئەمانە هەمویان بەڵگەن لەسەر تاکو تەنیایی وبێ سنوری دەسەڵاتی خوای گەورە. وەرگێڕ. لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٧٣١.

([22]) أ ـ سورة الطور: ( ٣٥ ـ ٣٦).

ب ـ واتە: ئایا ئەو بێباوەڕو خوا نەناسو بێباوەڕو ملهوڕانە لەخۆوە هاتونە دنیاوەو دروست بون یان خۆیان خۆیان دروست کردوە؟ دیارە گومانی تێدا نیە کەهیچ شتێك لەخۆوە نایەتە دیو دروست نابێتو هەمو شتێك دروستکەرو بەدیهێنەرێکی هەیە، هەروەها هەرگیز نەبوە شتێك خۆی خۆی دروست بکات، چونکە ئەگەر شتێك بونی نەبێت چۆن دەتوانێت خۆی دروست بکات. کەواتە بیرو بۆچونی ئەو خوا نەناسانە پوچەڵە

لەم جیانە هەموی ڕابمێنەو سەیر بکە بەهەمو بەشەکانیەو سەرویی‌و خوارویی، دەیان بینی کەهەمویان بەزمانی حاڵ‌و بەڕواڵەت‌و بەناوەڕۆکیانەوە شاهیدن لەسەر بونی دروستکەرو بەدیهێنەرو خاوەنی خۆیان. دەی نکۆڵی کردن لەبونی دروستکەری خۆی‌و ددان نەنان بەبەدیهێنەر لەعەقڵ‌و لەفیترەتدا، وەك نکۆڵی کردن‌و ددان نەنانە بەزانست‌و پلەو پایەی زانست، هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوانیاندا([23]).ئەوەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا کۆمۆنیست‌و مارکسیستەکان لاف‌و گەزاف‌و فڕو فیشاڵی پێوە لێ دەدەن‌و خۆی پێوە هەڵ دەکێشن لەنکۆڵی کردن‌و لەئینکار کردنی بونی خوای پەروەردگار، شتێك نیە تەنیا لەخۆبەزل زانی وکەللە ڕەقی‌و خۆهەڵکێشان نەبێت، هەروەها بۆ دەست بەسەردا گرتنی‌و داپۆشینی بەروبومی ژیری‌و بیروبۆچونی ڕاستەقینەو دروستی، جاهەر کەسێك ئەمە بیروبۆچونی بێت ئەوە عەقڵ‌و ژیری خۆی لەدەست داوەو بانگەشەی خەڵکی دەکات بۆ گاڵتەجاڕی‌و بیروبۆچونێکی سوکەڵەو پڕوپوچ‌و بێ ناوەڕۆك‌و دور دور لەڕاستی. هەروەکو شاعر دەڵێ:

كيف يعصي الإله ويجحد الجاحد

وفي كل شيء له آية تدل على أنه واحد

---

کەدەڵێن هەمو شتێك لەخۆوەو لەسروشتدا هاتۆتە ئەم جیهانە. وەپێ یان بڵێ: ئایا ئەوان ئاسمانەکان‌و زەویان دروست کردوە؟ خۆئەگەر لێ یان بپرسیت: ئاسمانەکان‌و زەوی‌و بونەوەر بەگشتی کێ دروستی کردون؟ بێگومانە دەڵێن: خوا دروستی کردون، بەڵام ئەوانە باوەڕ لەدڵیاندا بەتەواوی لەدڵیاندا نەچەسپاوە، ئەگەر بچەسپایەو تۆزێ هۆش وگۆشیان هەبایە بتیان نەپەرست‌و ڕویان لەخوای گەورە وەر نەدەگێڕا وبیرو باوەڕی ئەوا پوچەڵ‌و بێ بنەماو نازانستیانەو ناژیرانەیان نەدەگرتە بەرو ئەوا مولحیدو بێ باوەڕ نەدەبون بەرامبەر بەخوای گەورەو بەڕۆژی دوایی بەزیندو بونەوەو لێپێچانەوەی ڕۆژی دوایی. وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٣٨٢.

([23]) چونکە زاستی ڕاست‌و دروست ددان بەبونی خوای گەورە دروستکەرو بەدیهێنەری بونەوەردا دەنێت‌و دەیسەلمێنێت.

## بەشی دووەم

## ڕونکردنەوەی چەمکی وشەوزاراوەی پەروەردگار لەقورئان و لەسوننەتدا، و بیرو بۆچون و تێڕامانی ئوممەتەکانی گومڕاو سەر لێشێواو لە بابەتی پەروەردگارێتی، و بەرپەرچ دانەوەیان.

### ١- چەمکی زاراوەی پەروەردگار لەقورئان و لەسوننەتدا:

پەروەردگار لەبنەڕەتدا: چاوگی(ربَّ يَرُبُّ) وە بەواتای لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر گەشەی کردو پێگەیشت بۆ حەڵەتی تەواو بون. دەگوترێ: (ربَّه وربَّاه وربَّبَهُ) دەی وشەی (رب) چاوگێکی خوازراوە بۆ بکەر (الفاعل)وەبەڕەهایی ناگوترێت(الرَّبُّ) تەنیا بۆ خوای بالاّ دەستو کاربەجێ نەبێت ، کەتەنیا شیاوی ئەوەو بەس. هەروەکو لە فەرمایشتەی خوای گەورەدا دەردەکەوێت:﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ الفاتحة:٢.(واتە: پەروەردگاری جیهانیان. وەرگێڕ). ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ﴾ سورة الشعراء: (٢٦).(واتە: خوای گەورە پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوکو باپیرانی ئێوەشەز وەرگێڕ).

ئەم وشەیە بۆ غەیری خوای گەورە بەڕەهایی بەکار ناهێنرێت مەگەر بخرێتە سەر ناوێکی تر بەشێوەیەکی سنوردار، هەروەکو دەگوترێت(رب الدار - خاوەنی خانوەکە)،( رب الفرس - خاوەنی ئەسپەکە)هەروەها فەرمایشتی خوای گەورە کەدەربارەی یوسف - عليه السلام بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:﴿ اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ﴾ (٢٤). هەروەها دەفەرموێ:﴿قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ﴾(٢٥). هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَمَّا أَحَدُكُمَا

---

(٢٤) أ ـــ سورة يوسف: (٤٢).

ب ـ واتە:لای گەورەکەی خۆت کەمەبەستی گەورەی میسر ە باسم بکەو بەسەرهاتی منی بۆ بگێڕەوە، بەلاّم شەیتان بیری بردەوە کەباسی بکات لای گەورەی میسربۆیە یوسف ماوەیەکی زۆر لەبەندیخانەدا مایەوە. وەرگێڕ.

(٢٥) أ ـــ سورة يوسف: (٥٠).

ب ـ واتە:بگەڕێوە لای گەورەکەتو پێ ی بڵێو لێ ی بپرسە دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کەدەست خۆیان بەچەقۆ هەمو شەق شەق کرد. وەرگێڕ.

﴿فَيَسْقِي رَبَّهُ خَمْرًا﴾[٢٦]، هەروەها پێغەمبەرﷺدەربارەی وشترە وَن بوەکە فەرمویەتی: {حتى يجدها ربها}[٢٧].

لەمەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کەوشەی پەروەردگار بەڕەهایی بۆ خوای گەورە بەکار دەهێنرێت بەمەعریفە بێت یان بەخستنە سەر(مضافاً)، کەدەگوترێت:(الرب ـ پەروەردگار) یان(رب العالمين — پەروەردگاری جیهانیان) یان( رب الناس — پەروەردگاری خەڵکی ). بەڵام بۆ غەیری خوا بەڕەهاییو یەکسەر وشەی پەروەردگار بەرکار ناهێنرێت [٢٨]. مەگەر بەخستنە سەر (مضاف) بێت. وەك(رب الدار ـ خاوەنی خانوەکە)وە(رب المنزل ـ خاوەنی ماڵەکە)وە(رب الإبل ـ خاوەنی وشترەکە).

وەواتای(رب العالمين ـ پەروەردگاری جیهانیان) واتە: دروستکەروبەدیهێنەرو خاوەنی جیهانیان، چاککاروچاکسازو پەروەردیاریان بەنازو نیعەمتو بەخششەکانی خۆی بەناردنی نیرّدراواو پێغەمبەرانی، ناردنە خوارەوەی کتێبەکانی، وەلەکردەوە خراپەکانیان دەبورێت واتە لا یان خۆش دەبێت. ناودارو بلیمەت إبن القيم — رحمه الله ـ گوتویەتی:(( لەداخوازیەکانی پەروەردگارێتی فرمان کردنە بەسەر بەندەکانیو قەدەغە لێ کردنیانە(أمر العباد ونهيهم)، هەروەها پاداشت دانەوەی چاکەکارانە بەچاکە سزادایانە لەسەر کاری خراپە واتە پاداشت دانەوەی چاکەکارانو سزا دانی خراپەکاران))[٢٩]. ئائەمەیە واتای ڕاستەقینەی پەروەردگارێتی.

---

([٢٦]) أ — سورة يوسف: (٤١).

ب ـ واتە: لەلێکدانەوەی خەونەکەی هەردو هاوڕێکانی یوسف لەناو بەندیخانەدا بەیەکێکیانی گوت: یەکێکتان مەی دروست دەکات بۆ گەورەو سەرکردەکەی خۆیو دەیداتێ. ئەی گوت: فڵان کەس تۆ ئازاد دەبیتو ئەو کارە دەگریتە دەست . فڵانیشتان ئازادا نابنو لەسێدارە دەرێیت بۆ ئەوەی هەردو لایان خۆ بەو کەسە بزاننو سێدارەکە بۆ خۆی دانەنێت. وەرگێڕ.

([٢٧]) متفق عليه.

ب ـ واتە: هەتاکو خاوەنەکەی دیدۆزێتەوە. وەرگێڕ.

([٢٨]) لەزمانی کوردی خۆماندا زاراوەی پەروەردگار تەنیا بۆ خوای گەورە بەکار دەهێنرێت بەڵام لەبرامبەر (رب الفرس ـ خاوەنی پەسپەکە بەکار دەهێنرێت . وەرگێڕ.

([٢٩]) سەیری(٨/١) بکە لە(مدارج السالكين)

**٢ـ چەمكی وشەی پەروەردگار لەبیرو بۆچونەكانی گەلە گومڕاو سەر لێشێوەكاندا:**

خوای گەورە هەمو بونەوەرو دروستكراوەكانی خۆی بەفیترەت لەسەر بەتەنها خوا پەرستی دروست كردن‌و بەدیهێناون، هەروەها لەسەر ناسینی پەروەردگاری بەدیهێنەری پاك‌و بێگەرد دروست كردون، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴾([٣٠]). هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا ﴾([٣١]).

دەی ددان نان‌و بڕیار دان لەسەر بونی پەروەردگاریێتی خوای تاك‌و تەنیا(الله) گیان و ڕو كردنە ئەوو بەروەو خوا چون كارێكی فیتری‌و سروشتی خواییە، بەڵان هاوبەش پەیدا كردن تازەیەو ڕوداوێكی لەنكاو كت‌و پڕەو پەیدا بوەو سەری هەڵداوە، ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ كل مولود يولد على الفطرةن فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه}([٣٢]). ئەگەر لێ بگەڕێن بەندە بۆ خۆی بەئازادی لەسەر فیترەتی خوایی خۆی بڕوات ئەوا

---

([٣٠]) أ ـ سورة الروم: (٣٠).

ب ـ واتە: ڕوی خۆت ڕیك بكە لەگەڵ ئەم ئایینی ئیسلامە بەتەنها ڕو لەم ئایینی ئیسلامە بكە، ئەو ئایینە پاكە ئایینی فیترەتی خوای گەورە كەهەمو خەڵكی لەسەر ئەم ئایینە هەر لەزگماكەوە بەدیهێناون‌و ئەو ئایینەی لەدڵ دا چەسپاندون، ئایینی ڕاست‌و پەسەند كراو و فیترەت هەر ئەم ئایینی ئیسلامەیەو هیچ گۆڕانكاریەك نیە لەدروست كردن‌ویاسا ڕێژی خوادا واتە خوای گەورە هەر شتێكی دروست كردو بڕیاری لەسەر داوو چەسپاندی ئیدی گۆڕانی بەسەردا نایە، چونكە هەر شتێك، هەر بەرنامەو هەر ئایینێك كەخوای گەورە دای بڕێژێت پڕاو پڕ تەواوەو هیچ ناتەواویەكی تێدا نیە كەتەنیا بۆ كۆمەڵە كەسێك یان تەنیا بۆ سەردەمێك بێت‌و بەس تەخێر بەڵكو بۆ هەمو ئادەمیزادەكان‌و هەتا دنیاش دەبڕێتەوە لەگەڵی دا دێتەوە . وەك بەرنامەو یاساكانی دەستی مرۆڤ كورت بڕو كەم مەودا بێت بۆ چەند كەس‌و گروپێك بێت‌و بۆ كاتێكی كەم بێت‌و چەند ساڵێكی بەسەردا چو ئێكسپایەر دەبێت‌و مۆدیلی بەسەر بچێت. وەرگێڕ.

([٣١])أ ـ سورة الأعراف: (١٧٢).

ب ـ واتە: خوای گەورە هەر لەفیترەتەوە كەئادەمیزادی دروست كردوە بڕوای لەدڵدا چەسپاندوەو جێگیری كردوە، بۆیە هەر بەو فیترەتە پشتاو پشت ئەو پەیمانەی لەنەوەكانی ئادەم وەرگرتوە كەبڕوای پێ بێنن‌و هەر خۆشیانی لەسەر خۆیان كردۆتە شاهید. ئەوەتە كەلەمرۆڤ دەپرسێت: ئەی ئادەمیزادەكان ئایا من خوای پەروەردگاری ئێوە نەبوم؟ لەوەڵامدا دەڵێن: بەڵێ ئەی خوای پەروەردگار تۆ پەروەردگاری ئێمەیت‌و ئێمە خۆمان شایەدین لەسەر ئەمەو شاهیدی دەدەین. وەرگێڕ.

([٣٢]) رواه الشيخان.

یەکسەر ڕو دەکاتە بەتەنها خوا پەرستیو تەنها خوا بەپەروەردارو بەخوای خۆی دەزانێتو دواو شوێنی بانگەوازی نێردراوانو پێغەمبەرانی خوا دەکەوێتو گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرانی خوا دەکات، شوێن ئەو بەرنامە دەکەوێت کەپێغەمبەران لەخوای گەورەوە هێناویانەو کتێبەکانی پێ هاتونە خوارو هەمو بەڵگەو نیشانە کەونیەکان واتە بونەوەریەکان ئاماژەی پێ دەکەنو دەیسەلمێنن. بەڵام بەداخەوە پەروەردەی سەقەتو لادەرو گومڕاو ژینگەی مولحیدو لەدین دور و سەر لێشێواو ڕێڕەوی زاڕۆڵە چاو گەشە پاکەکان دەگۆڕنو بەرەو خراپەو بی بڕوایی وەریان دەچەرخێننو گومڕایان دەکەن. جا باوكو دایکان چۆن بن منداڵەکانیش ئەو ڕێڕەوە دەگرن، چونکە منداڵەکان لاسایی باوكو دایکان دەکەنەوەو شوێن پێ ی ئەوان هەڵ دەگرێتەوە لەسەر لێشێواوی گومڕاییو لادان لەئایین.

خوای گەورە لەفەرمودەیەکی قودسی دا دەفەرموێت:﴿ خلقت عبادي حنفاء، فاجتالهم الشياطين﴾([33]). واتە: شەیتانەکان بەرەو بت پەرستی وەریان دەگێڕنو دەستیان پێ لەبەرنامەو ئایینی خوا لادەدەن، ئەو بتو ئەو کەسو ئەو شتانە دەکەن بەپەروەردگاری خۆیان جگە لەخوای گەورە دەیان پەرستن، ئەوا دەکەونە ناو گومڕاییو سەرلێشێواویو ون بون، پەرتەوازەییو جیاوازییو دو بەرەکیو چەند بەرەکی، هەر یەکە پەروەردگارێك بۆ خۆی دەگرێتە بەرودەپەرستێت جیا لە پەروەردگاری ئەوی تریان، چونکە ئەگەر پشتی یان لەپەروەردگاری ڕاستەقینەی خۆیان کرد، دوچاری ئەوە دەبن کەچەندان پەروەردگاری پوچەڵو بێ ناوەرۆك بۆ خۆیان بگرن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ فَذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ﴾([34]). دەبێ ئەوەش بزانین کەگومڕاییو سەر لێشێوایی سنوری نیەو کۆتایی بۆ نیە. توشی هەر کەسێك دەبێت کەلە

---

([33]) أ ــ رواه أحمد.

ب ـ واتە: من بەندەکانی خۆم لەسەر ئایینی پاكو فیترەت دروست کردونو بەفیترەت موسڵمانو بەپو دارن بەڵام دوایی شەیاتینیەکان لەڕێگەی ڕاستو ئایینی پاکی فیترەت لایان دەدەنو گومڕایان دەکەن. وەرگێڕ.

([34]) أ ــ سورة يونس: (٣٢).

ب ـ واتە: دەی ئەوەی کەئەو هەمو شتانەی دروست کردون تەنیا ئەو پەروەردگاری تاكو تەنیاو ڕاستەقینەی ئێوەیەو هەر ئەو بپەرستن، دەی کەواتە بیر بکەنەوە لەدوای هەقو ڕاستی چی هەیە لەگومڕایی بەولاوە، لەدوای سەرلێشێواوی وگومڕایی لەهەق بەولاوە چیتر هەیە. وەرگێڕ.

پەروەردگاری ڕاستەقینە لای دا، خوای باڵا دەستو کار بەجێ دەفەرموێت: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ۝ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (٣٥).

هاوبەش دانان لەپەروەردگار لەپەروەردگارێتی بەئیعتباری چەسپاندنی دو بەدیهێنەری هاو وێنەو چون یەك لەسیفاتو لەکردارەکانی دا قەدەغەو لەدینی چوادا نەویستراوە، بەڵکو هەندێ لەهاوبەش پەیداکاران بۆ ئەوە چون کەپەرستراوەکانیان هەندێ هەڵسو کەوتو هەقی تەسەڕوفیان لەم بونەوەرەدا هەیە، شەیتان بەکەیفی خۆی یاری پێ کردونو یاریان پێ دەکات لەبەندایەتی کردنو پەرستشیاندا بۆ ئەو پەرستراوە ناهەقانەیان، هەر کەسەو هەر گەلەو هەر قەومە بەپێ ی عەقڵو پلەی تێگەیشتنیانەوە لەئاینی خوا یاریان پی دەکاتو جڵەویان دەکێشێت، ئەوەتە دەستەیەکیان بانگ دەکات بۆ پەرستنی مردوەکانیان لەڕوی بەگەورە زانینو بەپیرۆز دانانیان، ئەوانەی کەوێنەو پەیکەری بتیان لەسەر وێنەی ئەو پیاو چاکە مردوانەیان کێشا یادایان تاشی، وەکو گەلی نوح، وەدەستەیەکی تریان بتیان لەسەر وێنەی ئەستێرەکان داتاشیو دەیان پەرست بەبیانوی ئەوەی کەدەڵێن ئەوانە کاریگەریان بەسەر جیهانەوە هەیە، چەندان تەلارو خانویان بۆ دروست کردوەو خزمەتکارو مجێوریان داناوە.

---

(٣٥) أ ــ سورة يوسف (٣٩ ــ ٤٠).

ب ـ واتە: ئەی دو هاوەڵەکەی زیندانیم پێم بڵێن: توخوا چەند پەروەردگارێك واتە ئەو هەمو خوایانەی کەئێوە لەبتەکانتان دەیان پەرستن کەهیچ هێزو دەسەڵاتو توانایەکیان نیەو هیچیان لەدەست نایە، باشترو ڕاست ترە یان پەروەردگارێکی تاكو تەنیاو خاوەن دەسەڵاتو توانادار بەسەر هەمو بونەوەرەکاندا ، دەی پێم بڵێن: کامیان ڕاست ترو شایستە ترن کەبپەرسترێت؟. ئەوانەی کەئێوە دەیان پەرستن پەروەردگاری ڕاستەقینە نینو خوا نین بەڵکو چەند ناوێکن خۆتان داتان هێناونو ناوتان بۆ داتاشیونو لەباوكو باپیرانتانەوە ناوتان لێناون، لەکاتێکدا پەرستنی ئەوان هیچ بەڵگەیەكو هیچ دەسەڵاتێكو هیچ ڕێگەیەکی پێ نەدراوە کەبیان پەرستن، بەڵکو پەرستنی خوای پەروەردگار بەتاکو بەتەنهایی ڕێگەی ڕاستەقینەی خواییە. وەرگێڕ. بەسود وەر گرتن لەتەفسیری گوڵەشەن ب٢.

وەلەبەندایەتی کردنیان بۆ ئەو ئەستێرەو کەشکەشانانەدا جیاوازن، هەندێکیان ڕۆژ پەرستن، هەندێکیان مانگ پەرستن، هەندێکیشیان هەیە کەلە ئەستێرەکانو هەسارەکانی تر دەپەرستن، هەتاکو پەیکەر گەلێکیان بۆ دروستو داتاشیون، بۆ هەر ئەستێرەو هەسارەیەك پەیکەری تایبەتیان بۆ داتاشیوە، وەدەستەیەکی تریان هەن ئاگر دەپەرستن کەئاگر پەرستەکانن(المجوس)، وەهەشیانە مانگا(چێڵ) دەپەرستێت هەروەکو لەهیندستان دەیبینین، وەهەشیانە فریشتە دەپەرستێت، هەیانە درەختو دارو بەردەکان دەپەرستنن هەشیانە گۆڕو مەزارەکان دەپەرستێت، هەمو ئەمانە بەهۆی ئەوەیە کەئەوانە وا بیر دەکەنەوە کەئەو شتانە شتێك لەتایبەتمەندیو جیاکاریەکانی پەروەردگاریێتیان تێدایە بۆیە وا دەیان پەرستن.

هەیانە دەڵێن ئەو بتانە وێنای شتو کارە پەنهانیەکان دەکەن، إبن القيم گوتویەتی: (دانانی بت لەسەرەتاو لەبنەڕەتدا لەسەر شێوەی پەرستراوێکی نادیارو پەنهان دانراوە، دوایی بتیان لەسەر شێوەو لەسەر وێنەو دەستەی ئەو دروست کردوە یان داتاشیوە، بۆ ئەوەی جیگر بێت لەجێگەی ئەوکەسەی لەجێگەیدا دانراوەو وێنای ئەو دەکات، لەجێگەی ئەودا بەکارەکانی ئەو هەڵ دەستێت، دەی شتێکی ئاشکراو زانراوە ئەوەی ئاقڵ وچیر بێت هەرگیز دارێك، تەختەیەك یابەردێك بەدەستی خۆی داناتشێت، دوایش بیرو بۆچونی وا بێت کەئەو داتاشراوە خواو پەرستراوی خۆی بێتو بیپەرستێت....) تەواو[٣٦].

هەروەکو گۆڕ پەرستانی کۆنو نوێش دەڵێنو پڕو پاگەندەی ئەوە دەکەن وا بیر دەکەنەوە کەئەو مردوانە تکایان بۆ لەلای خوا دەکەن، وەدەبنە هۆکارو واسیتە لەنێوان ئەوانو خوای گەورەدا لەجی بەجێ کردنی پێداویستەکانیانو هێنانە دی مەبەستەکانیان

(٣٦) إغاثة اللهفان:(٢/ ٢٢٠).

و دەڵێن:﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ﴾[٣٧]. هەروەها:﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ ﴾[٣٨].

هەروەكو هەندێ لەهاوبەش پەیداكارانی عەرەبو گاورەكان وایان بیر دەكردەوە كەپەرستراوەكانیان كوڕی خوان، هاوبەش پەیداكارانی عەرەب فریشتەیان دەپەرست بەبیانوی ئەوەی كەئەو فریشتانە كچانی خوان، وفەلەو گاورەگان عیسایان ـ علیه السلام ـ دەپەرستو بەندایەتیان بۆ دەكرد گوایە ئەو كوڕی خوایە.

**٣ـ بەرپەرچ دانەوەی ئەو بیربۆچونە پوچەڵو باتلانە:**

خوای گەورە بەرپەرچی هەمو ئەوە بیروبۆچونە پوچەڵو باتلانەی داوەتەوە بەم شێوەی خوارەوە:

أـ بەرپەرچی بت پەرستەكانی بەم شێوەیە داوەتەوەو دەفەرموێت:﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى۝وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى﴾ سورة النجم: (١٩ ـــ ٢٠). واتای ئایەتەكە هەروەكو القرطبي گوتویەتی: ئایا ئەم خوایانەتان بینیون! یایا سود یا قازانج دەگەیەنن بۆ مرۆڤەكان تاشایەنی ئەوە بن بكرێنە هاوبەشو هاوشانی خوای پەروەردگار؟ وەئایا ئەوانە توانیان هەتاكو بەرگری لەخۆشیان بكەن كاتێ كەپێغەمبەرﷺوهاوەڵەكانی﷟ تێكیان شكاندنو ڕوخاندیانن، ئەوەتە خوای گەورەو بەرزو بەتوانا دەفەرموێ:﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ۝إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ۝قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ۝قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ۝أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ۝قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾[٣٩].

---

([٣٧]) أ ـــ سورة الزمر: (٣).

ب ـ واتە: ئێمە تەنیا بۆیە ئەوانە دەپەرستین تاكو لەخوامان نزیك بكاتەوەو ببنە واسیتە لەنێون ئێنەو لەنێوان خوادا. وەرگێڕ.

([٣٨]) أ ـــ سورة یونس: (١٨).

ب ـ واتە: بێباوەڕو هاوبەش پەیداكارانی مەككەو هەمو ئەوانەشی كە لەسەر بیرو باوەڕی ئەوانە دەڕو هەتا دنیا دنیایە جگە لەخوای گەورە شتانێك دەپەرستن كەنە دەتوانن سودیان پێ بگەیەننو نەزیان دەڵێن: ئەوانە تكا كارن بۆ ئێمە لەلای خوا. وەرگێڕ.

([٣٩]) أ ـــ سورة الشعراء (٦٩ ـــ ٧٤).

لەڕاستی دا ئەوان نکوڵی یان لەوە نەدەکردو لاریان لێ نیە کەئەو شتانەی کەدەیان پەرستن‌و هاواریان دەکەنێ‌و داوایان لی دەکەن‌و دوعاو هاوارو داوای ئەوان نابیستن‌و نەسودیان پێ دەگەیەن‌و نەزیانیش، بەڵکو پەرستنی ئەو شتانە لاسایی کردنەوەی باوکو باپیرانی خۆیانەو لاسایی کردنەوەیەو هیچی تر نا، دیارە شتێکی ئاشکرایە کەلاسایی کردنەوەو چاو لێکردن بەبەڵگەو بڕو بیانو(حجة) پوچەڵەو وەرناگیرێت‌و کاریشی پێ ناکرێت.

ب - وەخوای گەورە بەرپەرچی پەرستنی ئەستێرەو هەسارەکان‌و مانگ‌و ڕۆژ بەم فەرمودەیە وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێت:﴿ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ﴾ سورة الأعراف: (٥٤).(واتە: ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەکان هەمویان لەژێر دەستی خوادان‌و بەفرمانی خوا هەمویان ڕام بون‌و هەتاڕۆژی قیامەت فرمانەکانی خوا جێ بەجێ دەکەن‌و هەر یەکەیان لەخولگەی خۆیان دەخولێنەوەو بەمو لانادەن. وەرگێر). هەروەها بە فەرمایشتی خوای گەورە:﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لاَ تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلاَ لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾(٤٠).

ج - وەبەرپەرچی فریشتە پەرست‌و مەسیح - علیه السلام - پەرست بەبیانوی ئەوەی کەکوڕی خوایە بەم فەرمودەی خوای بەرزو بێ هاوتا دەداتەوەو دەفەرموێت:﴿ مَا اتَّخَذَ

---

ب - واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەسەرهاتی ئیبراهیم لەگەڵ باوکی‌و گەلە بێباوەڕەکەی بۆ بێباوەڕان‌و خوانەناسان بگێڕەوە، کاتێ بەباوکی‌و بەگەلەکەی خۆی گوت: ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟! دیارە کەئەو دەیزانی چی دەپەرستن بەلاّم بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئەوان ئەو پرسیارەی لێ کردن بۆ ئەوەی پێ یان بڵێ ئەوەی کەئێوە دەیان پەرستن پوچەڵ‌و ڕاست نین، ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: ئێمە بتەکانمان دەپەرستین و بەردەوامیش دەیان پەرستین‌و دەستیان لێ هەڵ ناگرین، ئیبراهیم پێ ی گوتن: ئایا ئەوانە گوێ یان لێتان دەبێت کاتێ بانگیان بکەن‌و هاواریان بکەنێ‌و داوایان لی بکەن وەڵامتان دەدەنەوە؟! یان ئایا هیچ سودتان پێ دەگەیەنن‌و هیچ زیانێکتان لێ دەدەن یا لێتان لادەدەن‌و دەتان پارێزن؟ گەلەکەی لەوەڵامدا گوتیان: ئێمە لەسەر عاداتو ڕەوشتی باوکو باپیرانمان دەڕۆین، دەیان پەرستین، چونکە ئێمە باوکو باپیرانی خۆمان دەدیت ئەم بتانەیان دەپەرستن، بەڵێ بۆیە ئێمەش چاو لەوان دەکەین و وەکو ئەوان دەیان پەرستین. وەرگێر. لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٩٤٦ .

(٤٠) أ- سورة فصلت: (٣٧).

ب - واتە:وەلەبەڵگەو نیشانەکانی بون‌و دەسەڵاتی لەبن نەهاتوی خوای گەورە شەوو ڕۆژو (الليل والنهار)وخۆر(الشمس)و مانگ ، دەی کڕنوش نەبۆخۆرو نەبۆ مانگ مەبن‌و ئەوانە مەپەرستن‌و بەندایەتیان بۆ مەکەن، بەڵکو تەنیا خوا بپەرستن‌و بەندایەتی‌و کڕنۆش بەتەنیا بۆ خوای پەروەردگار ببەن، ئەو خوایەی کەئێوەش‌وئەو پەرستراوانەشی دروست کردون کەئێوە جگەلەخوا دەیان پەرستن. وەرگێر.

اللَّهُ مِن وَلَدٍ﴾ سورة المؤمنون: (٩١).( واتە: خوای گەورە هەرگیز منداڵو وەچەی بۆ خۆی دانەناوە ئەوە بوختانێکی گەورەیە کەئەو بێباوەڕانە بەرامبەر بەخوای پەروەردگاری دەکەن. وەرگێڕ.) هەروەها بەفەرمایشتی خوای گەورە:﴿ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّـهُ صَاحِبَةٌ ﴾(٤). هـەروەها دەفـەرموێ:﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ سـورة الإخلاص:( ٣ ـ ٤). (واتە: لەکەس نەبوەو کەسیشی لێ نابێت، وەلە شێوەو وێنەی کەس دا نیەو کەسیش لەوێنەو لەشێوەی ئەودا نیە.وەرگێڕ).

******* ******* *******




---

(٤) أ ــ الأنعام:١٠١.

ب ـ واتە: ئەو خوایەی ئەو هەمو ئاسمانو زەویو بونەوەرەی بەگشتی بەجوانترین شێوە بەدیهێناون، ئەدی چۆن دەبێت و دەگونجێت کەخوا منداڵی ببێت لەکاتێکدا هاوسەری نیە. وەرگێڕ.

## بەشی سێ یەم

## بونەوەرو فیترەتەکەی و ملکەچ و گوێڕایەڵی بۆ خوای پەورەدگار

ئـەم بونــەوەرە بەگشـتی بەئاسمانــەکانی و زەویەکـەی و گەردونەکـەی و ئەسـتێرەو هەسـارەکانی، بەگیانــدارو گیــان لەبــەران و دارو درەخــت و بەشــارو گونــدو گــڵ و قــوڕو خاکەکەی و بەوشکانی و بــەدەریاو دەریـالوش و ئاوەکانیــەوە، بەفریشـتەو بەجنۆکـەو بـە مرۆڤەکانیەوە، هەر هەمویان ملکەچـن بـۆ خـوای گـەورە، گوێڕایـەڵن بـۆ فرمـانی کـەونی خوای گەورە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴾([42])، هەروەها دەفـەرموێت:﴿ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ﴾ ([43])، هـەروەها دەفـەموێت:﴿ وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَالْمَلآئِكَةُ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ﴾([44]). وەهـەروەها:﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ ﴾([45]).

---

([42]) أ ــ سورة آل عمران: (٨٣).

ب ـ واتە:هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دا هەن خۆیان داوەتە دەست خوای گەورەو تەسلیمی خوا بون چ بەخۆشی بێت و چ بەناخۆشی . وەرگێڕ.

([43])سورة البقرة : (١١٦).

ب ـ واتە: بەڵکو هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دا هەن هەر هەمویان هی خوان ملکەچ و ژێر دەستی خـوای گـەورەن و لەژێر فرمانی ئەودان و هەمیشە لەبەندایەتی و پەرستشی خوادان. وەرگێڕ.

([44]) أ ــ سورة النحل: (٤٩).

ب ـ هەرچی لەئاسمانەکاو زەوی دا هەن لـەگیان لەبـەران و مـرۆڤو جنۆکـەکان و فریشـتەکان ...تـد. مـوڵکی خـوان و بەندایەتی و پەرستشی خوا دەکەن و کڕنوش بۆ خوا دەبەن و هەرگیز لالوتی ناکەن ویاخی نـابن و خۆیـان بەگـەورە نـازانن. وەرگێڕ.

([45]) أ ــ سورة الحـج: (١٨).

ب ـ واتە: نابینی هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە لەگەڵ ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان و چیاوچۆڵ و شاخەکان و گیان لەبەرەکان و هەندێکیش لەئادەمیزادەکان کڕنۆش بۆ خوای پـەروەردگار دەبـەن و بەتـەنها خـوا دەپەرسـتن، زۆرێک لەئادەمیزادەکان سزای خوایان بۆ براوەتەوەو بێباوەڕ بون. وەرگێڕ. بەسـود وەرگرتن لەتەفسـیری گوڵشـەن ب٢ل٨٤١ــ ٨٤٢.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ*﴾(٤٦).

هەمو ئەم بونەوەرانەو هەمو جیهانیان، دوای خوا دەکەونو ملکەچی هێزو دەسەڵاتی خوان، بەگوێرەی ویستو ئارەزوی خوا دەڕۆن بەڕێوەو گوێڕایەڵی فرمانەکانی خوان، هیچ کامێکیان سەرپێچی ناکەنو لێ ی یاخی نابن، هەر یەکەو بەگوێرەی ئەو یاساو سیستەمەی کەخوا بۆی داناون کارو ئەرکەکانی سەر شانی خۆیان ڕادەپەڕێننو ملکەچانە جێ بەجێ ی دەکەن، ودەرئەنجامەکان بەسیستمێکی زۆر وردکاریەوە دەدەنە دەست هەر هەمویان بەدیهێنەرو دروستکەری خۆیان بەپاکو بێگەرد ڕادەگرن لەهەمو ناتەواویو پەك کەوتنو خەوشێك(العيب)، خوای بەرزو بێ هاوتاو بەتەنێ دور دەگرن هەروەك دەفەرموێت:﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾(٤٧).

دەی ئەم هەمو دروستکراوانە قسە کەرو قسە نەکەریان(صامتها وناطقها)، زیندوەکانیانو مردوەکانیان، هەر هەمویان گوێ ڕایەڵی خوانو ملکەچن بۆ فرمانە کەونیەکانی ئەو خوایە، هەر هەمویان بەزمانی حاڵو بەزمانی گوتار(لسان المقال) خوای گەورەی خۆیان پاكو بێگەرد ڕادەگرنو بەدوری دەزانن لەهەمو ناتەواویو خەوشێك. مرۆڤی ژیر هەر چەندە لەو دروستکراوانەی خوا ورد ببێتەوەو تێڕا بمێنێت دەزانێتو بۆی دەردەکەوێت کەئەوانە هەمویان بەهەق دروستکراونو بۆ هەق دروستکراون، وەهەر

(٤٦) أ ــ سورة الرعد: (١٥).

ب ـ واتە: هەرچی لەناو ئاسمانەکانو زەوی دا هەن بەخۆیانو بەسێبەرەکانیانەوە بەیانیانو ئێواران پێ یان خۆش بێت یان نا، واتە بیانەوێتو یان نەیانەوێت کڕنوش بۆ خوای پەروەدگار دەبەنو ملکەچن بۆیو دەیپەرستنو بەندایەتی بۆ دەکەن. وەرگێڕ. لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٦١٩.

(٤٧) أ ــ سورة الإسراء: (٤٤).

ب ـ واتە: حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تیایاندایە لەفریشتەو لەجنۆکەو ئادەمیزادو دارو درختو گشت دروستکراوەکانی تر ناوی خوا بەبەرزو بێ عەیبو پاكو بێگەرد دەهێننو بەرزی ڕادەگرن، وەهیچ شتێك نیە لەم گەردونەدا کەناوی خوا بەرز ڕانەگرێتو و یادی خوا نەکاتو ددان نەنێت بەتاكو تەنیایی خوای گەورەو بەندایەتیو پەرستشی بۆ نەکەن، بەڵام ئێوە ئەی بەندەکانی من گوێتان لەو تەسبیحاتانە نیەو لێ ی تێ ناگەن. وەرگێڕ. هەمان تەفسیری ڕابردو ب٢ل ٧١٢.

هـەمویان ملکـەچو گـوێ ڕایـەڵن‌و هـیچ دربڕینێـك‌و هـیچ سەرپێچیەکیان بـۆ نیـە لـەڕوی هەڵسـوڕێنەرو بەڕێوەبەرەکـەی خۆیـان کـەخوای پـەروەردگارە، هــەر هــەمویان هــەر لەفیترەتی خۆیانەوە ددان بەدروستکەرو بەدیهێنەری خوای گەورەدا دادەنێن‌و نکوڵی لێ ناکەن.

شێخی ئیسلام إبن تيمية ــ رحمــه الله ــ گوتویـەتی:(ئەوانـە ملکەچـی خوان‌و خۆیـان بەتـەواوی داوەتـە دەسـت خـوای گـەورە، خـوا پـەرستن، بەبـەردەوامی خـوا دەپەرسـتن ناچارو ملکەچن بۆ خوای گەورە، لەچەند ڕوەیەکەوە:

١ ـ هەمیشە دەزانن کەپێویستیان بەخوایەو موحتاجن بۆ نیعمەت‌و بەخششەکانی خوا.

٢ــ ملکـەچ بـون‌و خۆدانـە دەسـت خـوا لەهـەمو قـەزاو قـەدەرو ئـیرادەو ویسـت‌و دەسەڵاتەکانی خوای گەورە.

٣ـ پاڕانەوەو دوعاو داوا کردن تەنیا لـەخوای گـەورە لـەکاتی ناخۆشـی‌و لێقـەومان‌و تەنگ‌و چەڵمەکان‌و لەکاتی پێویستی داو لەهەمو کاتەکاندا.

بابای بـڕوادار بەویسـت‌و ئـارەزوی خـۆی ملکەچـە بـۆ فرمانـەکانی خـوای پـەروەردگار، هەروەها بۆ ئەو قەزاو قەدەرەی کەبەسەرت دێنێ لە تەنگژەوو بەڵاو ناخۆشیەکان. بەڵکو بـڕوادار ئـەوەی کـەفرمانی پـێ کـراوە لـەکاتی تـوش بـون بـەو بـەڵاو موسـیبەت‌و تـاقی کردنەوانە ئارام گرتن‌و خۆڕاگریە تاخوای گـەورە دەروت لێ بکاتـەوەو پاداشـتت بداتـەوە بەویست‌و خوایشتی خۆی، بەخوایشـتی خـۆی خـۆی داوەتـە دەسـت خـواو موسـڵمانە، بەویسـت‌و خویشتی خـۆی ملکەچـە بـۆ خـوای پـەروەردگاری([48]).. بـەڵام کـافر ملکەچـە بۆفرمانی پەروەردگاری کەونی، وەکرنـوش بردنـی بـۆ بونەوەرەکانـە کەمەبەسـت پـێ ی ملکەچیە، وەکڕنوش بردنی هەر شتێك بـەپێ ی خۆیـەتی، کڕنوشـێك کەلەگـەڵ بونیـەتی خۆی دا بگونجێت‌و ملکەچی بێت بۆ پەروەردگارەکەی، وەتەسـبیح کردنـی هـەمو شـتێك بەگوێرەی خۆیەتی‌و ئەمە ڕاستیەکەو خوازراو نیە).

هەروەها شێخی ئیسلام إبن تيمية ـ رحمه الله ـ دەربـارەی فـەرمودەی خـوای گـەورە:﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ سورة

---

([48]) مجموع الفتاوي:(١/٤٥).

آل عمـــران: (٨٣). گوتویـەتی:(خـوای پـاكو بێگـەرد باسـی ئیسلامیەتو موسڵمانێتی بونەوەرەكان كردوە بیانەوێ یان نەیانەوێ؛ (واتە بەخۆشی بێت یا بەترشی بێت، كورد گوتەنی - وەرگێڕ -)، چونكە دروستكراوەكانو بەدیهێنراوەكان هـەر هـەمویان بەندایـەتی خـوا دەكـەن بەبەندایـەتی كردنێكی تـەواو، جـاچ ددانـی پێدا بنێت، یـاخود نـا، هـەمو قـەرزداری خـوای گـەورەنو خـوای گـەورە چارەسـازو ڕێكخـەری ژیانیانـەو بەڕێوەبـەرو هەڵسوڕێنەری كارو بارەكانی ژیانیانە لەدنیاو لەقیامەت، ئەی هەمو بونەوەرەكان خۆیان داوەتە دەست خوای گەورەو لەژێر فرمانی ئەودان بیانەوێ یان نەیانەوێت، هـیچ كامێكو هیچ كەسێك لەبونەوەرەكان بۆی نیە لەویستو خواستو قـەزاو قـەدەرەكانی دەربچێت، وەهـیچ هێـزو دەسـەڵاتو گۆڕانكاریـەك لەدەسـتی ئێمـەدا نیـەو تـەنیا لەدەسـتو هێـزو دەسەڵاتی خوا دایەو تەنیا بەدەست ئەوە، ئەو خوایـە پـەروەردگاری هـەمو جیهانیانـە و خاوەنو پادشایانە، بەكەیفی خۆی هەڵسو كەوتیان لەگەڵ دا دەكاتو كارو باریـان هـەڵ دەسوڕێنێت، هەر ئەو خوایە بەدیهێنەرو دروستكەری هەمویانـە، داهێنـەر و شـێوەدانەرو دروستكەریانە، وەهەمو شتێك جگە لەخوای گەورە خاوەنی پەروەردگارنو دروستكراون، لەنەبونەوە هێنراونە بون(مفطور) و هەژاری دەستی ئـەون بەناچاری خـوا پەرستن واتـە بیەوێتو نەیەوێت خوا پەرستەو دەبێ بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار بكات، ئەو خوایـە پاكو بێگەردە تاكە زاڵ بوو بەتواناو دەسەڵاتدارەو دروستكەرو بەدیهێنەرو نیگار كێشو شێوە دانەری هەمو شتێكە لەم بونەوەرەدا)([49]).

******* ******* *******

([49]) مجموع الفتاوى:(١٠/٢٠).

## بەشــی چوارەم

## ڕونکردنەوەی مەنهەجی قورئان لەسەلماندنی بونی بەدیهێنەری تاكو تەنیا

مەنهەجی قورئان لەسەلماندنی بونی بەدیهێنەرێکی تاكو تەنیا، بریتیە لەو ڕێگەو ڕێبازەی کەلەگەڵ فیترەتی ڕاستەقینەو دروستو، عەقڵە پاكوساغەكاندا دەڕوات، ئەویش بەبەرپاکردنو هێنانەوەی بەڵگە سەلمێنەرە ڕاستودروستەکان،کەعەقڵە دروستەکان پێ ی ڕازینو قەناعەتیان پێ ی هەیە، ودژو نەیارەکان پێ ی دێنە سەر دینی خواو موسڵمان دەبنو یەکسەر خۆ دەدەنە دەست، کەلەم چەند خاڵانەدا ڕیز بەندیان دەکەین:

١- شتێکی بەڵگە نەویستو ئاشکرایە کەهەمو ڕوداوێك دروستکەرو هۆکاری خۆی هەیە:

ئەم کێشەیە هەر لەفیترەتدا زەرورەتێکی ئاشکراو ڕونە، هەتاکو بۆ منداڵانیش، ئەگەر منداڵێك یەکێك شەقازلەیەکی لێ بداتو ئاگای لەخۆ نەبێتو نەزانێت کێ ئەو شەقازلەیەی لێداو ئەو کەسە نەبینێت لەکاتی لێدانەکەدا، یەکسەر هاوار دەکاتو دەڵێ: ئەوە کێ بو لێ ی دام؟ ئەگەر لەوەڵامدا پێ ی بڵێن: کەس لێ ی نەدای، بڕوا دەکات؟ نەخێر ئەقڵی قبوڵی ناکاتو پێ ی دەڵێت: شتی وا نابێت، ئاخر من کەسێك لێ ی دام، چۆن کەس لێ ی نەدام. بەڵام ئەگەر پێ ی بڵێن: فڵان کەس لێ ی دای، دەگریاو ژێر نابێتەوەو تاڵێ ی دەداتەوەو تۆڵەی خۆی دەکاتەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾ سورة الطور: (٣٥).

ئا ئەم شێوە دابەشیە تەنگ پێ هەڵچنینە، خوای گەورە بەشێوەی پرسیاری ئینکاری هێناویەتیو باسی دەکات، بۆ ڕونکردنەوەی زەرورەتی ئەم پێشەکیە ڕونو ئاشکرایانە، کەناکری پەردە پۆش بکرێن، دەفەرموێ:﴿ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ﴾ واتە: هەر لەخۆوە دروست بونو هیچ دروستکەرو بەدیهێنەرێکیان نیە، یاخود خۆیان خۆیان دروست کردوە، دیارە بێگومانە کەبەهەر دو بارەکەیاندا پوچەڵو بێ واتاوباتڵن، خوای گەورە لەم ئایەتەدا بۆی ڕون کردونەوەو بۆ دیاری کردن کە نەخێر دروستکەرێکیان هەیە کەدروستی کردون کەخوای گەورەو پاكو بێگەردەو جگە لەو هیچ دروستکەرو بەدیهێنەرێکی تر نین. خوای بەرزو بێ هاوتا

دەفەرموێ:﴿ هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ﴾([50]). وە:﴿ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ ﴾ سورة الأحقاف: (٤).

**واتە: نیشانم بدەن ئەوانەی ئێوە داوایان لێ دەکەن‌و دەیان پەرستن‌و بەندایەتیان بۆ دەکەن لەم زەویەدا چیان دروست کردوەو چیان لەدەست دێت.** ﴿ أَمْ جَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَاء خَلَقُواْ كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾([51]). **هەروەها دەفەرموێت:**﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ ﴾([52]). **هەروەها** :﴿ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لاَ يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾([53]). **هەروەها دەفەرموێت:**﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لاَّ يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾([54]).

---

([50])أ ــ سورة لقمان: (١١).

ب ـ ئەمە ئەوە واتە ئەو بونەوەرەوئەوەشی کەتیایدایە دروستکراوی خوان، دەی ئێوەش نیشانم بدەن کامەیە دروستکراوەکانی ئەوان ئەوانەی کەجگەلەخوا دەیان پەرستن‌و هاواریان دەکەنێ. وەرگێڕ.

([51]) ــ أــ سورة الرعد: (١٦).

ب ـ واتە:ئایا ئەو بت‌و ئەو شتانەی کەئەو بێباوەڕانە کردویانن بەشەریك‌و هاوبەشی خوا هیچ شتێکیان وەکو دروستکراوەکانی خوا دروست کردوە هەتاکو لێ یان تێکەڵ ببێت‌و نەزانن کامە دروستکراوەکانی ئەوانەو کامەش هی خوا، دیارە نەخێر، دەی تۆش ئەی محمدﷺ پێ یان بلێ تەنیا خوای گەورەو پەروەردگار دروستکەرو بەدیهێنەری هەمو شتێکە و جیهان لەژێرفرمان‌و دەسەڵاتی بێ ئەندازەی ئەو دایە. وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب٢ل٦٢٠ .

([52]) أ ــ سورة الحج: (٧٣).

**ب ـ واتە : ئەوانەی کەدەیان پەرستن‌و داوای بەدیهێنانی سودوو قازانج‌و لادانی زیان‌و ناخۆشی‌و بەڵاو موسیبەتەکانتانیان لێ** دەکەن جانەوانە بت بن یان هەرشتێکی تر بێت لەدروستکراوەکانی خواو ماڵی دنیا بێت‌و کەس‌و بەرنامە دەست کردەکان بێت ، سەیر بکەن‌و بزانن ئەوانە ئەگەر هەر هەمویان لەم جیهانەدا کۆببنەوەو یەك بگرن‌و بچنە پاڵ یەکتری ناتوانن تەنانەت مێشێکیش دروست بکەن‌و دەسەڵاتیان نیە هەتاکو ئەگەر بێت‌و مێشێك بە سەر ئەو بت‌و شتانەی کەداوایان لێ دەکەن‌و دەیان پەرستن بنیشێتەوەو لەو بۆن‌و بەرامانەی کەبەسەر بتەکانتان دەکرد بخوات‌و لێ ی بستێنێت دەسەڵاتی یان نیە تەنیا لەخۆشیان دەریکەن‌و لێ ی بستێننەوە، خوای گەورە دەفەرموێت هەردوکیان بێ دەسەڵاتن‌و بێ هێزن ج مێشەکەش‌و ج ئەوانەشی کەدەیان پەرستن‌و داواو هاواریان دەکەنێ. تەفسیری گوڵشەن ب٢ل٨٥٨.. وەرگێڕ.

([53]) أــ سورة النحل: (٢٠).

ب ـ واتە: ئەوانەی ئێوە دەیان پەرستن‌و داوایان لێ دەکەن‌و هاواریان دەکەنێ و سوێندیان پێ دەخۆن‌و داوای مەدەدیان لێ دەکەن ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن تەنانەت ناتوانن مێشوولەیەکیش دروست بکەن‌و هیچ شتێکتان بۆ بەدیبهێنن‌و چیان لەدەست نایە، بەڵکو ئەوان خۆیان دروستکراوی دەستی خوای گەورەن‌و خوای تاك‌و تەنیا بەدیهێناون‌و موحتاجی دەستی خوای گەورەن. وەرگێڕ.

([54])أ ــ سورة النحل: (١٧).

لەگەڵ ئەو هەمو سنور بەزاندنە یەك لەدوای یەكانەدا كەس ناڵێو پروپاگەندەی ئەوە ناكەن كەئەوانە دەتوانن شتێك دروست بكەنو ناڵێن ئەوانە بەدیهێنەرن - وە نەتەنیا داوایەكی روتە - سەرباری سەلماندنی ئەمەش، ئیدی لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كەخوای پاكو بێگەرد خۆی تەنیاو بەتەنێ دروستكەرو بەدیهێنەرەو هیچ هاوبەشو هاوەڵێكی نیەو تاكو تەنیایە.

٢ـ رێكو پێكی كارو باری هەمو جیهانو ئەحكامەكانی: بەهێز ترین بەڵگەو نیشانەیەكە لەسەر ئەوەی كە هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەرەكەی خوایەكی تاكو تەنیا، پەروەردگارێكی تاكو تەنیاو بەتەنێ یەو هیچ هاوبەشو هیچ هاوتاو هاوەڵی نینو هیچ ركابەرو دژێكی نیە. ئەوەتە خوای گەورە:﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَـٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَـٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾(**).

دەی خوای هەق گومانی تێدا نیە دەبێ دروستكەرو بەدیهێنەرێكی كاراو چالاك بێت، جائەگەر خوای پاكو بێگەرد خوایەكی تری لەگەڵ دابێت، و لەمولكو دەسەلات بەشی

ب - واتە: چۆن ئەوەی كەدروستكەرو بەدیهێنەرە لەنەبونەوە دەهێنێتە بون لەگەڵ ئەو كەسو لەگەڵ ئەو شتانە كەناتوانێتو دەسەڵاتی دروست كردنی هیچ شتێكی نیە لەئاسانترینو سادەو سانان ترین شتەكانی سەر روی زەوی یەم بونەوەرەدا دروست بكاتو بهێنێتە دی دەی كەواتە تاكەی هۆش ناهێننەوە بەر خۆتانو تۆزێ ئاقڵ نابنو تۆزێك بیرناكەنەوە لەبری ئەوەی ئەو پەروەردگاری بەدیهێنەری خۆتان كەخوای تاكو تەنیاو خاوەنی هێزو دەسەڵاتی بێ سنورە ناپەرستنو كەسێكی بی هێزی وەكو خۆت یانەو شتە بێ گیانانە دەپەرستن كەبەدەستی خۆتان دایان دەتاشنو دوایش دەی پەرستنو هاواریان دەكەنێ داوایان لێ دەكەنو تەوافی مەزارو مەرقەدەكانیان دەكەن. وەرگێڕ.

(**) أ ـــ سورة المؤمنون: (٩١).

ب - واتە: خوای گەورە هیچ مندالی نینو بڕیاری بونی ماڵو مندالی بۆخۆی نەداوە، وەهیچ خوای تری لەگەڵ دا نیەو تاكو تەنیایەو هیچ هاوەڵو هاوبەشی نین، ئەگەر خوایەكی لەگەڵ دا بوایە ئەوە هەر خوایەك لەوانە دەستی بەسەر دروست كراوەكانی خۆی دادەگرتو لەگەڵ یەكتری دا دەكەوتنە ركا بەرێ كردنو مل ملانێ كردن لەگەڵ یەكتری داو بەگژ یەكتری دا دەچونو شەڕو هەرا لەنێوانیاندا روی دەداو ئەو كات بەڕێوە بردنو هەڵسوڕاندنی كارو باری ئەم بونەوەرە تێك دەچون چونكە هەر كامێكیان دەیانەویست بەویستو ئارەزوی خۆی ئەم بونەوەرە هەڵ بسوڕێنن. هەروەكو دەبینین هەر لەناو خۆماندا لەوڵاتی خۆماندا دو تاقمو دو گروپ و دوسەركردەو دو حیزب بەیەكەوە ئیدارە ناكەنو لەسەر دەسەڵاتو تەماحی دنیا لێیان دەبێتە هەراو چەندان كەسی دەست و پێوەندو لایەنگرەكانیان لەنێواندا بێ تاوان خوێنیان دەڕژێت. بەم شێوەیە هەڵسوڕاندنی كارو باری ئەو وڵاتە تێك دەچێت و بەرەڵایی و ئاژاوە دەكەوێتەوە . وەك كورد گوتەنی حاشا لەڕوی خوای پەروەردگارو پاكو بێگەرد:(سەری دو بەرانان لەمەنجەڵێك دا ناكوڵێت). تەفسیری گوڵشەن ب٢ل ٨٧٩ـ٨٨٠. وەرگێڕ.

بکاتو هاوبەشی بێت ـ حاشا خوا لەوە بەرز تـرو پـاكو بێگـەرد تـرە لـەوەی کەدەیدەنـە پاڵ ـ ئەگەر ئەو هاوبەشە دروستکراوو کارو چالاکی هەبێت، دەی لەو کاتەدا ڕازی نابێـت شەریکایەتی خوایەکی تر بکات، بەڵکو بەوەش ناوەستێت ئەگەر بۆی بکرێتو دەسـەڵاتی هەبێت بەسەر شەریکەکەی خۆی دا زاڵ ببێت شۆڕشی بەسەردا دەکاتو لـەناوی دەباتـو دەسەڵاتەکەی ئەویش دەهێنێتە ژێر دەسەڵاتو خوایەتی خۆیو دەیەوێت تەنیا بۆ خـۆی خوایەتی بکات، لەمەدا بێگومان بن کەئەو کارە دەکات، بەڵام ئەگەر نـەیتوانی ئـەم کـارە بکات، ئەوا داوای جیا بونەوە دەکاتو موڵكو دەسەڵاتی خـۆی جیـا دەکاتـەوەو بەتـەنیا حوکمی خۆی دەکات لەسەر موڵـكو دروسـتکراوەکانی خـۆی دا، بەمـە لێـك جیـا بونـەوە دێتە کایەوە. هەروەکو ئەم ڕاستیە بەچـاوی سـەری خۆمـان لـەدنیادا دەبیـنین کەپاشـاو سـەرکردەو دەسـەڵاتدارەکانی دنیـا لەسـەر دەسـەڵاتو مـوڵکی دنیـادا لـەنێوان خۆیانـدا ئەنجامی دەدەنو لێ یان دەبێتە هەراو کوشتو کوشتار، هەندێك بەسەر هەندێکیاندا زاڵ دەبنو ئەوانی دی دەشکێنێتو دەسەڵاتی لێ دەستێنێت یان ئەگەر دەسـەڵاتی یـەکتریان نەبو ئەوا موڵكو دەسـەڵاتەکان لـەنێوان خۆیان دابەش دەکەن ( ئێمـە ئـەو ڕاستیەمان لەوڵاتی خۆمانداو لەسەردەمی خۆماندا دیتو ئێستاش هەر بەردەوامە ـ وەرگێـڕ ـ). دەی ئەو کاتە گومانی تێدا نیە کەدەبێ یەکێك لەم سێ کارە یاهەڵبژاردنە بگیرێتە بەر:

أـ دەبێ یەکێکیان شۆڕش بەسەر ئەوی تر دا بکاتو هەرچی موڵكو دەسەڵات هەیە لـەوی تری دابڕێنێتو بیخاتە ژێر دەستی خۆی.

ب ـ یان دەبێ لەیەکتری جیا ببنەوەو موڵكو دەسەڵاتی خۆیان لێك جیا بکەنـەوەو هـەر کەس بەجیا حـوکمی خۆیـان لەسنوری دەسـەڵاتی خۆیانـدا بکـەن، ئـەو کاتـە لێـك جیـا بونەوەو دو لەت بون ڕو دەدات.

ج ـ یاخود دەبێ هەردوکیان لەژێر حوکمو دەسەڵاتی یەکێکیاندا بن لەژێر موڵـكو حـوکمی یەك پاشادا بن ئەو پاشایە بەکەیفی خـۆیو چـۆن بەرژەوەنـد بێـت بەویسـتی خـۆی ئـەو حوکمە هەڵ بسوڕێنێت ئەو کاتە ئەوانی تر هـەمویان دەبنـە بەنـدەو ئـەو دەبێتـە خـوای ڕاستەقینەو هەقیان بێتو پەروەردگاریان دەبێت.

ئەمەش واقعێکی ڕاستەقینەیەو گومانی تێدا نیە، بۆیە لەم جیهانو بونەوەرەدا هیچ دابەش بونو لەت بونو هیچ پەك کەوتنو شێواندانو خراپییەك ڕوی نەداوە، کەئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەهەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەری ئەو بونەوەرە ئەو جیهانە تەنیا یەك تاکە کەسەو یەك خوای پەروەردگارە، کەهیچ ڕکابەریو بەرامبەری نین، هەروەها خاوەنەکەی تەنیا یەکە کەسەو هیچ شەریکو بەشداری نین.

## ملکەچ بونی دروستکراوو بەدیهێنراوەکان لەڕا پەڕاندنی کارو فرمانەکانیان، هەستان بەتایبەتمەندیو جیاکاریەکانی خۆیان

لەم بونەوەرەدا هیچ دروستکراوێك نیە کەیاخی ببێتو لاملی بکات لەئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کەلەپێناوی دا دروست کراوەو خراەتە سەر شانی ، هەر ئەم مەبەستەش بو کەموسا ـ علیه السلام ـ بەبەڵگەی دەیهێنایەوە کاتێ کەفرعەونی پرسیاری لی کرد:﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى﴾[56].( واتە: فرعەون گوتی: خوای پەروەردگاری ئێوە کێ یە ئەی موسا؟ وەرگێڕ). موساش وەڵامێکی تەواوو شیفاهێنەری دایەوەو فەرموی:﴿ قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾[57]. واتە: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کەهەمو دروستکراوەکانی دروست کردون، وەهەر کامێکیان بەجوانترین شێوە دروستی کردون کەلایەقو گونجاو بێت لەگەڵ دەرونو جەستەی خۆی، جەستە گەورەو بچوكو مام ناوەندیو بەهەمو سیفەتەکانیەوە، ئەمجار ئەو خوایە گەورەیە هەر دروستکراوێکی ڕێنومایی کردوە بۆ ئەو مەبەستەی کەلەپێناوی دا دروستی کردوە، وەئەم ڕێنومایییەش ڕێنومایی نیشانەو جێما(الدلالة)و ئیلهام بۆ کردنە کەئەمەش ڕێنومایی تەواوەو لەهەمو دروستکراوەکاندا دەبینرێت، لەگشت دروستکراوێکدا دەبینرێت کەهەمیشە هەوڵ دەدات

---

([56]) أـــ سورة طـــه: (٤٩).

([57]) أـــ سورة طـــه: (٥٠).

ب ـ خوای پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کەهەمو شتێکی بەجوانترین شێوە دروست کردوەو ئەوجار ڕێنومایشی کردونو بەرنامەوو دەستورو کەتەلۆکی ژیانی بۆ ناردونو بۆی داڕشتونو شەریعەتی خۆی بۆ ناردونە خوار بۆ ئەوەی حوکم بەو یاساو ڕێساو دەستورە بکەنو نێردراوانو پێغەمبەرانی خۆی هەر لەخۆیاندا واتە لەگرۆهی ئادەمیزاد بۆ ناردون بۆ ئەوەی ڕێنومایییان بکات بۆ ڕێگەی ئەو شەریعەتو دەستورو یاسایەی کەئەو خوای پەروەردگارە بۆی ناردون، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو شەریعەتو دەستورو یاسایە خواییە. وەرگێڕ.

بەرەو ئەو مەبەستە بڕوات کەلەپێناوی دا دروستکراون وسودی تێدایە بۆیان، هەروەها وەلانانی ئەو شتانەی کەزیانی تێدا بێت بۆیان، هەتاکو دەبینی خوای گەورە هەستی داوە بەو گیاندارە ئاژەڵەکانیش، کەبەرەو ئەنجامدانی ئەو کارانە بڕوات کەسودی تێدایە بۆ خۆیو بۆ بەردەوامی ژیانی، هەروەها لادانو دور خستنەوەی ئەو شتانەی کەزیانی تێدایە بۆ خۆیانو ژیانیانو بەرەو ئەنجامدانی ئەو کارە دەڕوات لەپێناو مانەوەی ژیانی دا، ئەمەش فەرمایشتی خوای گەورەیە کەدەفەرموێ: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ﴾[٥٨] «(واتە: ئەو خوایەی کەهەمو شتێکی بەجوانترین شێوە دروست کردوەو هەر کەسو هەرشتە بەو شێوەی کەلایقو گونجاوە لەگەڵ خۆی دا. وەرگێڕ).

دەی ئەو کەسەی کەهەمو دروستکراوەکانی دروست کردون، وەبەچاکترین شێوەش دروستی کردون - کەهیچ عەقڵێك پەی بەو شێوە چاکیو جوانیە ناباتو هیچ پێشنیارێك لەسەروی ئەم شێوە جوانیەی خوادا نیە - واتە هیچ عەقڵێك ناگاتە ئەو شێوە جوانیەی کەخوای گەورە دروستکراوەکانی خۆی پێ دروست کردون. ئەوجار ڕێنومایشی کردون بۆ ڕۆیشتن بەرەوبەرژەوەندەکانی خۆی، ئەوەیە بەڕاستی پەروەردگاری ڕاستەقینە، دەی ئینکار کردنو ڕەت کردنەوەی بونی ئەو پەروەردگارە ئینکاری کردنە لەبونی گەورە ترین شتێك کەبێگومان بونی هەیە کەخوای پەروەردگارە، ئەم کارە بەڕاستی خۆ بەزل زانیو درۆ کردنی بەئاشکرایە. خوای گەورە هەمو شتێکی دروست کردوەو لەم دنیایەدا پێویستیان بەو خوایە هەیەو موحتاجی دەستی ئەو خوای پەروەردگارەن، ئەو جار ڕێنومایشی کردونو ئەو ڕێگەیەی بۆ ڕون کردونەوە کەلەژیانیاندا سودی لێ وەردەگرن. دیارە گومانی تێدا نیە هەمو توخمێكو هەمو پۆلێك شێوەو وێنەیەك کەلایەقو گونجاوە بەخۆی پێداوە. هەروەها هەر نێرو مێ یەك شێوەو شکڵی گونجاوی ڕەگەزی خۆی پێداون، لەهاوسەرگیریەتیو جوت بونو ئولفەتو ئالودە بونو خۆش ویستنی یەکتریو کۆمەڵایەتیو بەیەکەوە ژیانو تێکەڵاو بونو بەزەیی هاتنەوە بەیەکتریو بەیەکەوە گونجان، جوێ لەمەش هەمو ئەندامێك لەئەندامەکانی لەشی ئەو دروستکراوە بەو

---

([٥٨]) أ ـ سورة السجدة: (٧).

شێوەیەی پێداوە کەگونجاوە لەگەڵ جەستەو دەروونی خۆی دا و لایەقە بەو دروستکراوە کەلەژیانی دا سوودی لێ وەردەگرن، ئەم بەڵگەوو سەلماندنانە چەند بەڵگەیەکی یەکلا کەرەوەن کەبەڕاستی خوای گەورە پەروەردگاری هەموو شتێکە، و هەر ئەو موستەحەق و شایەنی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردنەو هیچ شت و هیچ کەس و هیچ بەرنامەیەکی تری لەگەڵ دا بپەرسترێت و بەندایەتی بۆ بکرێت...

وفي كل شيء له آية تدل على أنه الواحد(٥٩)

ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە کەمەبەست لەسەلماندنی پەروەردگارێتی - خوای پاک و بێگەرد - بۆ دروستکراوەکانی و تاک و تەنیایەتی خوای گەورە لەو پەروەردگاریەتیەدا: بریتیە لە ڕێنومایی و ڕێ بەدی و بەڵگە هێنانەوە بەوەی کەپێویستە بەندایەتی و پەرستشی بۆ خوای پەروەردگار بکرێت بەتاک و تەنیا و هاوەڵ و هاریکاری بۆ دانەنرێت، کەئەمەیە بەتەنها خواپەرستی خوایەتی، ئەگەر مرۆڤ ددانی نا بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی و ددانی نەنا بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی یاخود بەشێوەیەکی ڕاستی بەو خوا پەرستی یە هەڵ نەستا، ئەوە ئەو کەسە نەموسڵمانەو نەتەنها خوا پەرست(موحد)، بەڵکو کافرێکی بێ باوەڕو دین داپۆشەرە(جاحد)، ئەمە کەخوای گەورە ویستی لەسەر بێت و فرسەتمان بدات لەبەشی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

(٥٩) واتە: ئەو خوای پەروەردگارە لەهەموو شتێکی ئەم بوونەوەرەدا بەڵگەو نیشانەی خۆی هەیە دەیسەلمێنێت کەپەروەردگارێکی تاک و تەنیایەو هیچ هاوبەش و هاوەڵی نین. وەرگێڕ.

## بەشـی پێنجەم

### پەیوەست بونی بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی بەبەتەنها خوا پەرستی خوایەتی یەوە

واتای ئەمەش ئەوەیە کەهەر کەسێك ددان بنێت بەتەنها پەرستی پەروەردگارێتی خوای گەورە، ددان بەوەدا دەنێت کەهیچ دروستکەرو هیچ رۆزی دەرو هیچ هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەرێك نین بۆ ئەم بونەوەرە جگە لەخوای گەورە ـ عز وجل ـ ئەو کاتە پێویستە لەسەری کەددان بەوەشدا بنێت کەکەس موستەهەق شایەنی هەمو بەندایەتیەکان نیە بەهەمو جۆرەکانیەوە تەنیا خوای پاکو بێگەرد نەبێت، ئائەمەیە بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی، دەی کەواتە خوایەتی خۆی لەخۆی دا واتا بەندایەتی بۆ کردن، خوا بەواتا پەرستراو ، بۆیە داوا ناکرێت تەنیا لەخوا نەبێت، پەناو هانا نابردرێت تەنیا بۆ خوا نەبێت، پشت بەکەسی تر نابرێت جگە لەخوا، وەقوربانی سەربڕینو نەزرەکان ناکرێن تەنها بۆ خوای تاكو تەنیا نەبێت، وەهەمو جۆرەکانی بەندایەتیەك ناکرێت تەنیا بۆ زاتی (الله) نەبێت، دەی کەواتە بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی بەڵگەو نیشانەیە لەسەر پەیوەست بونو واجب بونی بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی، هەر بۆیەش خوای گەورە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێتو سەرکۆنەی ئەوانە دەکات کەددان بەپەروەردگارێتی خواو بڕوایان پێ هەیەو بەڵام بڕوایان بەخوایەتی خوا نیەو ددانی پێدا ناهێنن، هەروەکو لەم فەرمایشتەی دا دەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ۝الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (٦٠).

---

(٦٠) أ ـ سورة البقرة (٢١ ـ ٢٢).

ب ـ واتە: ئەی خەڵکینە تەنیا پەروەردگاری خۆتان بپەرستنو بەندایەتی بۆ بکەن کەئێوەشو ئەوانەشی لەپێش ئێوەدا ڕۆیشتونو نەماون دروست کردون بۆ ئەوەی خۆتان لەخوای پەروەردگارتان بپارێزن، ئەو خوایەی کەزەوی بۆ ڕاخستونو لەسەری دەژیەنو دێنو دەچن، هەروەها ئاسمانی کردوە بەتەلارو سەقفو بارانتان لەو ئاسمانەوە بۆ دەبارێنێو سەرچاوەی ئاوتان بۆ فەراهەم دێنێتو بەو ئاوە لەبەرهەمو بەروبومەکان ڕۆزیتان بۆ مسۆگەر دەکات بۆ خۆتانو بۆ مەڕو ماڵاتو وڵساتەکانتان دەی ئێوەش تەنها خوا بپەرستنو هاوەڵو هاوبەشو هاوشێوەو وێنەی بۆ دامەنێن لەکاتێکدا ئێوە دەزانن و ئاگادارن بەو ڕاستیە حاشا هەڵ نەگرە. وەرگێڕ.

خوای پەروەردگار فەرمانی بەئادەمیزادەکان کرد کەبەتەنها خوا پەرستی خوایەتی بکەن، کەبریتیە لەبەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە بەتەنیا، وەسەرکۆنەی کردن لەسەر ئەوەی کەتەنیا خوا پەرستی پەروەردگاریتی ئەنجام دەدەن، ئەو خوایەی خەڵکانی سەرەتاو کۆتای دروست کردون، وەئاسمانو زەوی و ئەو شتانەشی کەتیایاندان دروست کردوە، وەبای رام هیناوە بۆ ئادەمیزادو باران دەبارینیت، وروەکەکان بەو ئاوە دەروینیتو جۆرەها بەروبومیان لێ بەرهەم دینیت کەرۆزی یە بۆ بەندەکانی، دەی کەواتە ئەوە راست نیەو شایەنی ئەوە نیە کە خوایە گەورە بکریتە هاوەڵو هاوبەشی غەیری خۆی واتا هاوەڵو هاو وینەی لەگەڵ دا بریار بدەن، لەوانەی کەناتوانن هیچ شتێك لەوشتانەی کەلەسەرەو ئامازەمان پێ کردنو غەیری ئەوانەش دروست بکەنو بهێننە دی. دەی کەواتە ریگەی فیتری بۆ سەلماندنی تەنها خوا پەرستی بیتیە لە: ریبەدی کردنو ڕینومایی‌و بەڵگە هینانەوەی بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگاریتی، واتا تەنها خوا پەرستی پەروەردگاریتی خۆی لەخۆی دا بەڵگەیە بۆ واجب بونی تەنها خوا پەرستی خوایەتی وپەیوەندی توندو تۆڵیان بەیەکەوە هەیەو تەواوکەری یەکترینو لەیەکتری دانابرین، چونکە مرۆڤ یەکەمجار بەدوای سەرچاوەو چاوگی دروستکردنەکەی‌و، بنچینەو بنەرەتی سودو زیانەکانی دا دەگەریت، ئەمجار دەگوازیتەوە بۆ زانینی هۆکارەکانی لێ نزیك بونەوەی‌و، پێ رازی بونی، وگرێ دانو توندو تۆڵ کردنی پەیوەندی لەنیوانی خۆی‌و ئەو سەرچاوە بنەرەتانە، لەبەر ئەمە بو خوای گەورە لەهاوبەش پەیداکاران ناڕەزا بوو سەرکۆنەی کردنو ئەوا بەم ریگەیە بەڵگەی بۆ هینانەوە، فرمانی بەپێغەمبەرەکەی کرد کەسەر کۆنەیان بکاتو بەڵگەیان بۆ پی بهێنیتەوە هەروەکو دەفەرمویت:﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ۝ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ۝ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۝ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ۝ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ۝سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ﴾[61]،( واتە: ئەی محمدﷺبەو بێباوەرو خوا نەناسانە بڵێ: زەوی‌و ئەوەشی وا تێ ی دایە هی کێنو مولکی

---

([61]) أـ سورة المؤمنون (٨٤ ــ ٨٩)

کێن ئەگەر دەزانن‌و و توزێ هۆشتان هەیە؟ بێگومان لەوەلامدا دەڵێن تەنیا هی خوای پەروەردگارە، دەی تۆش پێ یان بڵێ: ئەدی بۆ بیر ناکەنەوەو یادی ئەو خوایە ناکەن کەخاوەنتانەو بۆ هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن شتێکی تری لەگەڵ دا دەپەرستن!. وەپێ یان بلێ: کێ پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکان‌و پەروەردگاری عەرشی زۆر گەورەیە، بێگومان لەوەلامدا دەڵێن: تەنیا هی خوایەو هەر ئەو پەروەردگاریانە ، دەی پێ یان بڵێ: ئەدی بۆچی هۆشتان نیەو خۆتان لەو خوای پەورەدگارە ناپارێزن وهاوەڵو شەریکی بۆ دادەنێن!، پێ یان بڵێ: ئەوە کێ یە مەلەکوت‌و جڵەوی خاوەنداریێتی هەمو شتێکی بەدەستەو پەنای هەمو شتێك دەداتو پێویستی بەپەنادانی کەس نیەو پێویستی بەهاریکاری کەس نیە ئەگەر عەقڵتان هەیەو هۆشتان بەبەرەوەیەو چ دەزانن؟ دەڵێن تەنیا بەدەست خوایە، دەی پێ یان بڵێ کەوا دەزانن بۆچی وا جادوتان لێ کراوەو بەرچاوتان لێڵ کراوەو خۆڵ کراوەتە چاوەکانتانەوەو لەرێگەی راست لاتان داوەو بۆ بەتەنیا خوای پەروەردگارو بەدیهێنەری راستەقینەی خۆتان ناپەرستن‌و بەندایەتی بۆ ناکەن؟!!. وەرگێر). هەروەها دەفەرموێت:﴿ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ سورة الأنعام: (١٠٢).

خوای گەورە بەڵگەی بە تاك‌و تەنیایی خۆی لەپەروەردگاریێتی دا هێناوەتەوە کەموستەحەق‌و شایەنی بەندایەتی بۆ کردنە،و تەنها خوا پەرستی خوایەتیش ئەوەیە کە دروستکراوەکانی لەپێناودا دروست کردون.، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ سورة الذاريات: (٥٦).

واتای (يعبدون): خوای گەورە دەفەرموێ تا بەتەنیا بەندایەتی بۆ من بکەن‌و وبەس، بەندە بەتەنها خوا پەرست نابێت(موحداً) بەوەی بەتەنیا بروای بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگاریێتی هەبێت،(واتە تەنیا بروای تەواوی بەپەروەردگاریێتی خوا هەبێت بەلام لەپەرستن‌و بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە کەسان‌و شتی ترو بەرنامەی دەستکردی تری لەگەڵ دا بپەرستێت‌و جگە لەخوا هاوار بکاتە کەسی ترو شتی تر و پەنا بۆ پیرو مەزارو پیاو چاکان و پێغەمبەران بەرێت ئەو کات بەتەنها خوا پەرست نیەو هاوبەش پەیداکەرەو خوا پەرستیەکەی تێکەڵ کرد بەپەرستنی کەسان‌و شتگەلێکی تر- وەرگێر-)

به‌ته‌نها خوا په‌رست نیه هه‌تاكو به‌ته‌واوی ددان نه‌نێت به‌ته‌نها خوا په‌رستی خوایه‌تیو به‌ندایه‌تیو په‌رستش جگه له‌خوای گه‌وره بۆ هیچ شتو هیچ كه‌سێكی تر نه‌كات، و به‌ته‌واوی پێ ی هه‌ڵ بستێت، ده‌ی خۆ هاوبه‌ش په‌یدا كه‌رانیش بڕوای ته‌واویان به‌په‌روه‌ردگاریتی خوا هه‌بو، كه‌چی ئه‌مه‌ نه‌یخستنه‌ ناو بازنه‌ی ئیسلامه‌وه‌و موسڵمان نه‌بون، وپێغه‌مبه‌ر ﷺ كوشتارو جه‌نگی له‌گه‌ڵ دا كردن. به‌ڵێ ئه‌وان بڕوایان هه‌بو به‌وه‌ی كه‌خوای گه‌وره‌ به‌ته‌نیا دروستكه‌رو به‌دیهێنه‌رو ڕۆزی ده‌ره‌، ده‌مرێنیو ده‌ژیه‌نێ، هه‌روه‌كو خوای ده‌فه‌رموێ:﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾(٦٢). هه‌روه‌ها:﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ سورة الزخرف: (٩). هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت:﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ﴾(٦٣).

به‌ڵگه‌و ئایه‌ت له‌م بواره‌دا له‌قورئاندا گه‌لێك زۆرن، هه‌ر كه‌سێك بڵێ به‌ته‌نها خوا په‌رستی ئه‌وه‌یه‌ كه‌بڕوات به‌بونی خوا(الله) هه‌بێت، یان ئه‌وه‌یه‌ كه‌بڕوات هه‌بێت كه‌خوای گه‌وره‌ خۆی دروستكه‌رو به‌دیهێنه‌ره‌و هه‌ڵس و كه‌وت له‌بونه‌وه‌ردا ده‌كاتو خۆی هه‌ڵسوڕێنه‌رو به‌ڕێوه‌به‌ریه‌تی، و ته‌نیا له‌م جۆره‌ خوا په‌رستیه‌دا كورت هه‌ڵێت، ئه‌وه‌ ئه‌و كه‌سه‌ له‌واتای ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌و به‌ته‌نها خوا په‌رستی یه‌ نه‌گه‌یشتوه‌ كه‌هه‌مو پێغه‌مبه‌ران بانگه‌شه‌یان بۆ كردوه‌، چونكه‌ ئه‌و كه‌سه‌ له‌ئاست ناچاریه‌كه‌دا(الملزوم) وه‌ستاوه‌و وازی

(٦٢) أ ـــ سورة الزخرف: (٨٧).

ب ـ واته‌: ئه‌گه‌ر لێ یان بپرسیت كێ ئێوه‌ی دروست كردوه‌؟ ده‌ڵێن: خوا ئێمه‌ی دروست كردوه‌ ! .وه‌رگێڕ.

(٦٣)أ ـــ سورة يونس: (٣١).

ب ـ واته‌: ئه‌و هاوبه‌ش په‌یداكارو مولحیدو خوا نه‌ناسانه‌ ئه‌گه‌رلێ یان بپرسیت كێ له‌ئاسمانو له‌زه‌وی دا ڕۆزیتان بۆ فه‌راهه‌م دێنێتو كێ خاوه‌نی بیستنو بینینه‌و كێ گوێچكه‌و چاوی پێ به‌خشیون، ئه‌و گوێچكه‌یه‌ی كه‌ڵ ی ورد ببیته‌وه‌ ج ده‌زگایه‌كی ئاڵۆزو سه‌خته‌ مه‌گه‌ر هه‌ر خوا بۆ خۆی بزانێت چه‌نده‌ ئاڵۆزه‌ ! ئه‌دی ئه‌وه‌ كێ یه‌ زیندو له‌مردو دێنێته‌ ده‌رو مردوش له‌زیندو دێنێته‌ ده‌ر، و كێ كاروباری بونه‌وه‌ر به‌و هه‌مو شتانه‌و ئه‌و هه‌مو گیان له‌به‌رو زینده‌وه‌رانه‌ی كه‌وان تیایدا هه‌ڵ ده‌سوڕێنێتو به‌ڕێوه‌به‌ریه‌تی؟ له‌وه‌ڵامدا ده‌ڵێن: خوا، ده‌ی كه‌واته‌ بۆ هۆشتان نیه‌و خۆ له‌خوای په‌روه‌ردگاری خۆتان ناپارێزنو هاوبه‌شی بۆ په‌یدا ده‌كه‌ن؟! وه‌رگێڕ.

لەپێویستەکە(اللازم) هێناوە، یاخود لەئاست بەڵگەدا یارێبەردا دەوەستن‌و وازی لەمەبەستو ناوەرۆك (المدلول)هێناوە.

وەلەتایبەتمەندیو جیاکەرەوەکانی خوایەتی: تەواویەتی رەها(الکمال المطلق) لەهەمو رویەکەوە کە هیچ ناتەواوی نیە بەهیچ رویەك لەروەکان، بۆیە بەندایەتی کردن‌و پەرستشی هەموی بەتەنها بۆ خوای پەروەردگارەو بەس، هەروەها رێزو شکۆی تەواوو بەگەورە دانانی خوای گەورە، لێ ترسان‌و دوعاو پارانەوەو داوا کردن‌و تکاو گەڕانەوەو پشت پێ بەستن‌و هانا بۆ بردن‌و ئەوپەری سەرشۆڕ کردن‌و ئەوپەری خۆشەویستی، ئەمانە هەر هەمویان بەعەقڵو بەشەرعو بەفیترەتیش دەبێ بەتەنیا بۆ خوای گەورە بن، وەعەقڵو شەرعو فیترەتیش قبوڵی نیەو قەدەغەی دەکات کەبۆ غەیری خوا ئەنجام بدرێن‌و جگە لەخوای گەورە بۆ شت گەلێك‌و کەسانێکی تر بن.

******* ******* *******

## ٢ـ بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی

ئەم بابەتە ئەم لقانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

لقی یەکەم: واتای بەتەنها خواپەرستی خوایەتی کەبابەتی بانگەشەی پێغەمبەران بوە.

لقی دوەم: هەردو شایەتمانەکان. واتاکانیان ـ پایەکانیان ـ مەرجەکانیان ـ داخوازیەکانیان ـ هەڵوەشێنەرەوەکانیان .

لقی سێ یەم: یاسادانان(التشریع) حەلاڵ کردن(التحلیل) ـ حەرام کردن(التحریم) ـ مافی خوا.

لقی چوارەم: لەبەندایەتی کردندا ـ واتاکەی ـ جۆرەکانی ـ گشتگیری و کۆڕایی(شمولها).

لقی پێنجەم: ڕونکردنەوەی چەمکە هەڵەکان لە دەست نیشان کردن و سنوردار کردنی بەندایەتی(وەك کورت بری(التقصیر) لەناوەڕۆك و مەبەستەکانی بەندایەتی دا یاخود زێدە ڕەوی(الغلو) کردن تیایدا.

لقی شەشەم: ڕونکردنەوەی پاڵپشت و پایەکانی بەندایەتی ڕاستەقینە: خۆشەویستی ـ ترس ـ ملکەچی ـ تکا(الرجاء).

لقی حەوتەم: ڕونکردنەوەی مەرجەکانی قبوڵ بون و وەرگرتنی بەندایەتی و کار کردن: کەبریتیە لە نیاز پاکی و ئیخلاسیەت و شوێن کەوتنی شەریعەتی خوا.

لقی هەشتەم: ڕونکردنەوەی پلەو پایەکانی ئایین کەبریتیە لە: ئیسلام ـ بڕوا بون(الإیمان) ـ چاکە کردن . پێناسەکەی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە لەگشتی و لەتایبەتی(عموم وخصوص).

## بەشی یەکەم:

### واتای بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی کەبابەتی سەرەکی بانگەشەی پێغەمبەران بوە.

**بەتەنها خواپەرستی خوایەتی: تەنها خوا پەرستی بریتیە لەبەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە**

بەتەنها خوا پەرستی خوایەتی: بریتیە لەبەتاك دانانی خوای گەورە لەكارو كردەوەكانی بەندەكانی دا كەلەڕوی نزیك بونەوەی شەرعیانە بۆ لای خوا ئەنجامی دەدەن، وەك دوعا كردنو نزاو لەبەر پاڕانەوەو نەزرو قوربانی كردن، داواو تكا كردن(الرجاء)و ترس، پشت پێ بەستن و(التوكل) خواست(الرغبة)و ترس(الرهبة)و گەڕانەوە(الإنابة) بۆ لای خوا، ئەم جۆرە لەبەتەنها خوا پەرستی بابەتو ناوەڕۆكی بانگەشەی پێغەمبەران بوە لەیەكەمیانەوە تا كۆتاییان، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ ﴾ سورة النحل: (٣٦).هەروەها :﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾([٦٤]).

هەمو نێردراوو پێغەمبەرێكی خوا سەرەتا فرمانی بەتەنها خوا پەرستیان بەگەلەكەیان ڕاگەیاندوەو بانگی بەتەنها خوا پەرستیان لێ كردون، هەروەكو نوحو هودو صالحو شعیب بەگەلەكانیان دەگوت كەخوای گەورە لەسەر زمانی ئەوان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:﴿ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ ﴾ سورة الأعراف: (٥٩،٦٥، ٧٣، ٨٥).( واتە: ئەی گەلی خۆم تەنیا خوا بپەرستن، چونكە هیچ خوایەكی تر نین جگە لە خوای پەروەردگار ـ وەرگێڕ ـ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ﴾([٦٥]). هەروەها ئایەتی بۆ محمدﷺدابەزاندو پێ ی فەرمو:﴿ قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ﴾([٦٦]).

---

([٦٤]) أ ـ سورة الأنبياء: (٢٥).

ب ـ واتە: هیچ پێغەمبەرێكمان لەپێش تۆدا نەناردوە كەسروش(وحی)مان بۆ نارد بنو پێمان ڕاگەیاند بن كەهیچ خوایەك جگە لەمن نین كەشایەنی پەرستن بن بەهەق دەی كەواتە من بپەرستنو تەنیا بەندایەتی تەواو بۆ من بكەنو هاوەڵو شەریكم بۆ دانەنێن. وەرگێڕ.

([٦٥]) أ ـ سورة العنكبوت: (١٦).

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {أُمِرتُ أن أُقاتل الناس، حتى يشهدوا أن لا إلــه إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله}(٦٧).

وەیەکەمین شتێك کەلەسەر مرۆڤی باڵغو موکەللەف واجب کراوە: شـایەتمانی(أن لا إله إلاّ الله)و ئەوجار کار کردنە بەو چەمکەو بەجێ هێنانی هەمو داخوازیەکانی. ئەوەتە خوای گەورە دەفـەرموێت:﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ﴾ سورة محمد: (١٩).( واتـە: چاك بزانە کەهیچ خوایەك نیێ کەبەهەق بپەرسترێتو بەندایەتی بۆ بکرێـت جگـە لـەخوای پـەروەردگاری جیهانیـان، دەی داوای لی خـۆش بـونی گونـاحو تاوانـەکانتی لێ بکـە تـا گوناحەکانت ببورێتو لێت خۆش ببێت.ـ وەرگێڕ-).

وەیەکەمین شتێك کەداوا لەهەر کەسێك دەکرێت کەدەیەوێت موسڵمان ببێتو بێتـە نـاو بازنـەی ئیسـلامەوە گـوتنو گـۆکردنی ئـەم دو شـایەتمانەیە، دەی لەمـەوە بۆمـان ڕون دەبێتـەوە: کەبەتـەنها خـوا پـەرستی خوایـەتی مەبەسـتو ئاواتونـاوەرۆکی بانگەشـەی نێردراوانو پێغەمبەرانی خوا بوە، هـەر بۆیـەش وا نـاو نـراوە، چـونکە خوایـەتی وەسـفی خوای گەورەیە کەناوی بەرزی(الله)دەگەیـەنێت، دەی(الله)گیـان خـاوەنی خوایەتیـە، واتـا پەرستراوی هەمو جیهانیانە.

وەپیێ ی دەگوترێت: یـەکبونی بەندایـەتی(توحيد العبــادة)، بـەئیعتباری ئـەوەی کەبەندایـەتی کردن وەسفی بەندەیە، کەپێویسـتە لەسـەری کەبەهـەمو دڵو بـەنیاز پاکیـەوە لـەو بەندایـەتی کردنەدا بەندایەتی بۆ خوا بکاتو بیپەرستێت، لەبەر پێویستی بۆ پـەروەردگاری و هەژاری بەندە

---

ب ـ واتە: کاتێ ئیبراهیم بەگەلەکی گوت: تەنیا خوای پەروەردگار بپەرستنو بەندایەتی تەنیا بۆ ئەو بکەنو خۆتـانی لی بپارێزنو گوێ ڕایەڵی تەنیا ئەو بکەنو داواو هاناو پشت بەهیچ شتێكو بەهیچ کەسی تر مەبەستنو مەکەن. وەرگێڕ.

(٦٦)أ ــ سورة الزمر: (١١).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺبەو بێباوەڕو هاوبەش پەیداکارو خوا نەناسانە بڵێ من فرمانم پێ کراوە کەتەنیا خوا بپەرستمو بەندایەتی هەر بۆ ئەو بکەم بەنیاز بەهەمو دڵێكوبەپاکیو ئیخلاسیەتەوە و هاوەڵی بۆ دانەنێم، چونکە ئاین تەنیا ئایینی ئەوەو هیچ ئایینو ڕێبازێکی تر ڕاست نینو پوچەڵن جگە لەبەرنامەو شەریعەتی خوای گەورە. وەرگێڕ.

(٦٧) أ ــ الحديث رواه البخاري ومسلم.

ب ـ واتـە: فرمـانم پێکـراوە کەکوشـتارو جـەنگ لەگـەڵ خـەڵکی دا بکـەم، هـەتا ئـەو کاتـەی کەشـایەتمان دێننو دەڵێن:شایەتی دەدەم کەلەخوای پەروەردگار بەولاوە هیچ خوایەکی تر نین کەبەهەق بپەرسترێت وەمحمدیشﷺنێردراوو پێغەمبەری خوایە. وەرگێڕ.

بۆ پەروەردگاری‌و هەمیشە موحتاجیەتی، شێخی ئیسلام إبن تیمیة ـ رحمه الله ـ گوتویەتی: (بزانە کەهەژاری‌و پێویستی بەندە بەخوا ئەوەیە: کەبیپەرستێت‌و هیچ هاوبەش‌و شەریکی بۆ دانەنێت، هیچ هاو وێنەی نیە تابەراوردی بکات‌و پێ ی بپێوێت(قیاس بە)، بەلآم وێدەچێ لەهەندێ ڕووەوە پێویستیەتی جەستە بۆ خواردن‌و خواردنەوە، وەلەنێوانیاندا جیاوازیەکی زۆر هەیە، ڕاستیەتی‌و ناوەڕۆکی بەندە دڵ‌و گیانەکەیەتی(قلبه وروحه)، ئەو دڵ‌و گیانـەی بەنـدە بـەهیچ شتێك چاك‌و ڕاسـت نابێـت‌و ئـارام‌و ئـۆقرە ماگرێـت تـەنیا بـەویردو یـادی خـوای پـەروەدگار نـەبێت کـەهیچ خوایەکی تر نین جگە لەو، لەدنیا بەهیچ شتێك ئارام‌و داناسەکنێ تەنیا بەزیکرو یادە ئەو خوای گەورە نەبێت، ئەگەر تۆزێ خۆشی‌و گوشادی‌و شادی‌و ئارامیەکی کەمیش دەسـت بەنـدە بکەوێت لەغـەیری خـوا ئـەوا بـۆ کـاتێکی زۆر کورتـەو بـەردەوام نابێـت‌و زو لـەکیس دەچێت‌و بەهەوادا دەڕوات، بەڵکو هەمیشە لەجۆرێکەوە دەگوازێتەوە بۆ جـۆرێکی تـرو لەکەسـێکەوە بـۆ کەسێکی ترو دڵی ئارام‌و ناداسەکنێ، وەلێ خـوا گیانەکـەی بێگومانـە کەلەهـەمو کـات‌و لەهـەمو حاڵێکداو لەهەر شوێنیك بێت لەگەڵی دایەو لەپشتیەتی)([68]).

ئـەم جـۆرە لەبەتـەنها خـوا پەرسـتی یـە بابـەت‌و نـاوەڕۆکی بانگـەوازی ڕەوانـە کـراوان‌و پێغەمبەرانی خوا بوە، چونکە بناغەو بنەمایەکە کەهەمو کارو کردەوەکانی لەسەر دادەمەزرێن یادادەڕێژرێن، وەبـەبێ بـەدیهێنانی گشت کارەکـان هیچیان دروسـت نـین‌و وەرنـاگیرێن ، دەی ئەگـەر ئـەو ئەرکانـە نەهێنرێنـە دی ئـەوا دژو پێچـەوانەکەی سـەر هـەڵ دەدات‌و دێتـە مەیـدان، کەبریتیە لەهاوبەش پەیدا کردن(الشرك) خوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ سورة النساء: (٤٨ ـ ١١٦). (واتە: خوای گەورە لەو کەسە خۆش نابێت کەهاوبەشی بۆ بڕیار بدات. وەرگێڕ ـ) هەروەها دەفەرموێت:﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ سورة الأنعام: (٨٨).(واتـە: ئەگـەر هاوبـەش بـۆ خـوا بڕیـار بـدات ئـەو کردەوە چاکانەی کـەکردونی هەمویان ڕەش دەبنەوەومایە پوچ دەردەچێت. هەروەها دەفـەرموێت:﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سورة الزمـر: (٦٥). (واتـە: ئەگـەر هاوبـەش بـۆ خـوای گـەورە دابنێیت، هەمو کردەوە چـاکەکانت هـەڵ دەوەشـێنەوەو ڕەش دەبنـەوەو لەکۆتاییـدا مایـەپوچ دەردەچیت‌و لەزیانمەندان دەژمێردرێیت. وەرگێڕ ـ).

---

([68]) مجموع الفتاوى: (١ /٢٤).

چونکە ئەم جۆرە لەبەتەنها خوا پەرستی، یەکەمین واجبێکە لەسەر بەندە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾ سورة النساء: (٣٦) . هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ ﴾ سورة الإسراء: (٢٣). هەروەها خوای گەورەو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾[٦١].(واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەو بێباوەڕو خوا نەناسو لەخوا یاخی بوانە کەبەکەیفی خۆیان شت حەڵاڵو حەرام دەکەن بڵێ: وەرن باپێتان بڵێمو ئەو شتانەی کەخوای گەورە لێ ی حەرام کردون بۆتان بخوێنمەوە کەبریتین لە: هەرگیز هیچ شتو هیچ کەسێك بەوێنەو هاوبەشو هاوەڵ بۆ خوا مەزاننو شەریکی بۆ پەیدا مەکەن، هەروەها لەگەڵ دایكو باوکتاندا باش بنو قەدریان بگرن چونکە ئەوان ئێوەیان لەمنداڵیەوەو هەر لەو کاتەی خوا لەسکی دایکتاندا دروستی کردن پێتانەوە ماندو بونوسارديو گەرمی زۆریان چەشتوەو پەروەردەیان کردونو ئەوان سەرپەرشتیارتانن ڕێزیان بگرنو هەرگیز لەبەریان تەنیا ئۆفێکیش مەکەن چاکەیان لەگەڵ دا بکەنو خزمەتیان بکەنو دڵیان عاجز مەکەن ، چونکە ئەوان زۆر بەئێوەوە ماندو بون تائێوەیان گەیاندۆتە ئەو قۆناغەی ژیانتانو بون بەو مرۆڤە جوانو ڕێکو پێکە بەتایبەتی دایکتان زۆر بەئێوەوە هیلاكو ماندوو شەکەت بوە ئەگەر شەوو ڕۆژ لەکۆڵی بکەنو هەرگیز دای نەنێن بەتاکە ژانێك نابێت کەبەئێوەوەی چەشتوە، ئەوە سەرباری ئەو هەمو شەو نخونیو خەو لەخۆ حەرام کردنو پیسایی شوشتنەوەو ساردیو گەرمی چێشتن بەئێوەو لەپێناو پێگەیاندنی ئێوە، دەی ئێوەش لەکاتی پیریو بەساڵدا چونیان چاکەیان بدەنەوەو بەخێویان بکەنو لەپێناو منداڵو خێزانەکانتان فرێ یان مەدەنە لاکۆڵانو سەر شەقامەکانو، لەبرسانو لەسەرمان ڕەق هەڵێنو گیان لەدەست بدەن، هەروەکو زۆرێکمان بەچاوی خۆمان لەسەر شەقامو لاکۆڵانو بەردەرگاکان دیتن. یان فریان داونە دەشتو چۆڵەکان لەبەر سەرماو سۆڵەی زستانو قرچەی گەرمای هاوین ، خۆشتان لەباوەشی خانمەکانتانداو لەبەر سۆبەی گەرمی زستانو سپلێتی هاوین دەخەوەن. وەرگێڕ).

[٦١] أ ـ سوره الأنعام: (١٥١ ـ١٥٣).

## بەشی دووەم

### هەردو شایە تمانەکان. واتاکانیان ـ پایەکانیان ـ مەرجەکانیان ـ داخوازیەکانیان ـ هەلّوەشێنەرەوەکانیان.

یەکەم: واتای هەردو شەهادەکان:

واتای شەهادەی(لا إله إلاّ الله) بریتیە لەبڕوا بونو بڕیار دانو ددان پێدا نان بەوەی کە بەندایەتی کردنو پەرستنی بەهەق جگە لە(الله)گیان بەولاوە بۆ هیچ شتو بۆ هیچ کەسێکی تردروست نیەو بەتاكو تەنیا شایەنی خوای گەورەیە. نەك هەر ئەمەندە بەڵکو پێویستە لەسەری کەپابەند بێت پێیەوەو کاری پی بکاتو لەکردەوەکانی دا ڕەنگ بداتەوە(فلا إله) واتە هیچ خوای تر نین نەفیو ڕەت کردنەوەی ئەوەیە کەهیچ شتو بونەوەرێکی تر لەهەر پلەو پایەو لەهەر حاڵەتو لەهەر بارێك دا بێت جگە لە(الله) شایەنی بەندایەتی بۆ کردنو پەرستن نیە( إلاّ الله) واتە جگە لەخوا سەلماندنی شایەنیەتیو موستەهقیەتی خوایە بەتاكو تەنیا لەبەندایەتی بۆ کردندا، واتای گشتی ئەو زاراوەیە ئەوەیە کە هیچ پەرستراوێکی تر نین بەهەق بپەرسترێت جگە لەخوای گەورە. وەخەبەری(لا)پێویستە بەهەق(حق) دابنرێت واتە تەقدیر بکرێت، وەناکرێ تەقدیر بکرێت بەبونو هەست پێکراوەکان(موجـــود)، چونکە ئەمە پێچەوانەی واقیعو ڕاستیە، پەرستراوەکان جگە لەخوای گەورە گەلێك زۆرن، پابەند بون بەوەی واتا بیروباوەڕت وابێ کەبەندایەتی کردنی ئەو شتانە بەندایەتی کردنە بۆ خوا، دیارە گومانی تێدا نیە کەئەم بۆچونە پوچەڵ ترین بۆچونو پوچەڵ ترین بیروباوەڕێکە کەدەگیرێتە بەر، ئەمە ڕێبازو بیروباوەڕی ئەهلی یەکبونی بونە یاهەبونە(وحدة الوجود)ئەوانەش بێباوەڕ ترین خەڵکن سەر ڕوی ئەم زەویە. ئەم زاراوەو ئەم وشەیە بەچەندان لێکدانەوەی هەڵە لێك دراوەتەوە کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان هەڵ دێنین:

(أ) واتای ئەوەیە کە: هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە(الله). ئەمەش لێکدانەوەیەکی هەڵەیە، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەهەمو پەرستراوێك بەهەقو بەناهەق، ڕاستو ناڕاست (الله)یە، کەتۆزێك پێشتر ڕونمان کردەوە.

(ب) کەواتای:(لا خالق إلاّ الله)واتە هیچ دروستکارێك نیە جگە لە(الله). ئەمە بەشێکە لەواتای ئەم وشەو زاراوەیە، بەلاَم لەڕاستی دا مەبەست ئەوە نیـە، چونکە ئەمە لەتەنها خوا پەرستی پەروەردگاری بەولاوە هیچی تر ناسەلمێنت بەواتایەکی تر تەنیا تەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی خوا دەسەلمێنێتو بەس، دیارە ئەمەش بەس نیەو ئەمە تەنها پەرستی هاوبەش پەیداکارانە(توحید المشرکین).

(ج) کەواتای:(لا حاکمیة إلاّ الله) واتە حوکمدار نیە جگەلە(الله)، ئەمەش دیسانەوە بەشێکە لەواتاکەیو مەبەستی سەرەکی نیە لەم زاراوەیەو واتای پڕ بەپڕی خۆی نیـە، چونکە ئەگەر بەتەنیا بەحاکم دابنرێتو داوا لەغەیری خوا بکرێتو هەندێ لە بەندایەتیەکان بۆ خوا بکرێت ئەو کات کەسە تەنها خوا پەرست نیـە(لم یکن موحداً)، هەمو ئەم لێکدانەوانە پوچەڵن یان ناتەواون، بۆیە ئاگاداریمان لەو بارەیەوە دا چونکە لەهەندێ لەو کتێبانەی کەبلاّو بونەوەو لەبەر دەستدان هەن.

وەلێکدانەوەی ڕاستو دروست بۆ ئەم زاراوەیە لای پێشینەکانو توێژەروەکاندا هەیە: کەدەڵێن(لامعبود بحق إلاّ الله) واتە هیچ پەرستراوێك نین کەشایەنی پەرستن بن بەهەق جگە لەخوای پەوەردگار. هەروەکو لەرابردودا ڕونمان کردەوە.

٢ـ واتای شایەتمانی(أن محمداً رسول الله) بریتیە لەوەی کەبەونیو بەئاشکرا بڕوات هەبێت کەمحمد بەندەی خوایەو ڕەوانە کراوی خوایە بۆ خەڵکی سەر ڕوی زەوی بەگشتی، ئەوجار هەر ئەمەندە نا بەڵکو پێویستە کاریشی پێ بکەیتو لەکردەوەکانتدا ڕەنگ بداتەوەو گشت داخوازیو داوا کاریەکانی ئەو چەمکە بهێنیتە دی لەگوێ ڕایەڵی کردن بۆ فرمانەکانیو پشت ڕاست کردنەوەو بڕوا بون بەو بەرنامەو شەریعەتەی کەلای خوا هێناویەتی، هەروەها دور کەوتنەوەو کشانەوە لەهەمو ئەو شتانەی کەقەدەغەی کردونو یاساغی کردون. خوا پەرستیو بەندایەتی بۆ خوا نەکات تەنیا بەپێ ی ئەو شەریعەتە نەبێ کەپێغەمبەرﷺهێناویەتی.

## دوەم: پایەکانی هەردو شەهادەتەکە:

أـ لا إله إلاّ الله : دو پایەی هەیە، کەبریین لە: نەرێ یاددان پێدا نەهێنانوسەلماندن (النفي والإثبات).

پایەی یەکەم: نەریّ یاددان پێدا نەهێنان: لا إلـه: واتـە هـیچ پەرسـتراوی بەهـەق نیـە، هاوبەشی پەیدا کردن بەهەمو جۆرەکانیەوە پوچەڵ دەکاتەوە، هەروەها سرینەوەو بڕوا نەبون بەهەمو بەندایەتیەك‌و پەرستشیەك کەبۆ غەیری خوا دەکرێت.

پایەی دوەم: سەلماندن: إلاّ الله: واتە جگە لەخوا، ئەوە دەسەلمێنێ کەبەندایەتی کردن‌و پەرستشی بەهەق شایەن‌و موستەهەقی هیچ کەس‌و هـیچ شتێکی تـر نیـە جگـە لـەخوای پەروەردگار وە پێویستە کاریشی پێ بکرێت‌و بەکردەوە بسەلمێنرێت، واتای ئەم دو پایە لەزۆرێك لە ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆزدا هـاتوە وەك فەرمایشـتی خـوا:﴿ فَمَـنْ يَكْفُـرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ ﴾([70]).

کەدەفـەرموێ:(فمـن يكفـر بالطـاغوت) ئـەوە واتـای پایـەی یەکەمـە( لا إلـه) وەفەرمودەی(ويؤمن بالله) ئەوە واتای پایەی دوەمە(إلاّ الله) .

هەروەها فەرمودەی خوای گەورە دەربارەی ئیبراهیم ـ عليه السلام ـ کەدەفـەرموێ:﴿ إِنَّنِي بَرَاء مِّمَّا تَعْبُدُونَ۝ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي ﴾([71])، کەدەفەرموێ:(إنني براءٌ) ئەوە واتای نەریّ ییە لەپایەی یەکەمدا، وەفـەرمودەی:﴿إلاّ الذي فطـرني﴾ ئـەوە واتـای سـەلماندنە واتـە ددان پێدا هێنان‌و ئەرێییە لەپایەی دوەمدا.

پایەکانی شەهادەی (أنّ محمداً رسول الله): دو پایەی هەن کـەبریتین لـە: (عبده ورسوله) واتـە بەنـدەی خوایـەو ڕەوانەکراویشـیەتی، کەهـەردوکیان کـەم ڕەوی‌و زێـدە ڕەوی لـەمافی پێغەمبەرداﷺ ڕەت دەکەنەوەو ددانی پێدا ناهێنێت واتـە نـەفی دەکـات، چونکە ئـەو بەنـدەو ڕەوانە کراوی خوای گەورەیە، کەتەواو ترین دروسـتکراوەکانی خوایـە لـەو دوسـیفە پیرۆزانـەدا، وەواتای بەندە(العبد) لێرەدا: واتای بەندەیەکی خواپەرستە، واتە: محمدﷺ مرۆڤێکی دروسـت

---

([70]) أـــ سورة البقرة: (٢٥٦).

ب ـ واتە: هەر کەسێك بڕوای نەبێت بەتاغوت‌و بڕوای هەبێت بەخوای گەورە بەڕاستی ئەو کەسە دەستی گرتوە بەپەت‌و بەدەستگیری توندی خواوەو گەر دەستی لی بەر نەدات دەیگەیەنێتە شوێنی مەبەست. تاغوت پەرستن‌و بەندایەتی کردن‌و گوێ ڕایەڵی کردنە بۆ هەر شتێك بەغەیری خوا. وەرگێڕ.

([71]) أـــ سورة الزخرف (٢٦ ـــ٢٧).

ب ـ واتە: کاتێ ئیبراهیم بۆی ڕون بۆوە کەگەلەکەی لەڕێگەی ڕاست لایان داوە پێ ی گوتن: من بێ بەری‌و ئەستۆ پاکم لەوانەی کەئێوە دەیان پەرستن، تەنیا ئەو کەسە نەبێت کەمنی لەنەبونەوە هێناوەتە بون‌و ڕێنومایشم دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست‌و خوا پەرستی. وەرگێڕ.

کراوە لەو شتەی کەمرۆڤی لێ دروست کراوە، ئەوی بەسەر مرۆڤەکاندا دێت بەسەر ئەویشدا دێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾ سورة الكهف: (١١٠) . (واتە: ئەی محمدﷺبەو بێباوەڕو هاوبەش پەیدا کەرانە بڵێ: منیش وەکو ئێوە مرۆڤێکمو هیچم لەئێوە پتر نیە تەنیا ئەوە نەبێت کەمن پێغەمبەری خوامو سروش(وحي)م لای خواوە بۆ دێت. وەرگێڕ.) بە دڵنیاییەوە پێغەمبەرﷺوەفادار بو بەرامبەر بەخوا لەبەندایەتی بۆ کردنو پەرستنی دا. خوای گەورەش بەمە مەدحی پێغەمبەریﷺکردوە، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾[٧٢]. یان دەفەرموێ:﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ﴾ سورة الكهف: (١). هەروەها دەفەرموێ:﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ سورة الإسراء: (١)

وەواتای (الرسول) واتە ڕەوانە کراو: نوێنەرو نێردەیە بۆلای هەمو خەڵك بۆ بانگ کردنی مەردوم بۆلای خوا بەموژدەدەرو بەترسێنەر(بشيراً ونذيراً).

وەبەشایەدی دانی بەم دو سیفەتە: ڕەت کردنەوەی زێدە ڕەویو کورت ڕەویە لەمافی ئەو پێغەمبەرەﷺ، زۆرێك لەوانەی کەلافی ئەوە لێ دەدەن کەلەئوممەتەکەی ئەونو زێدەڕەویەکی زۆریان کردوە لەمافەکانی داو، تێ ی دا ڕۆچون، هەتاکو ئەو ڕادەیەی کە بۆ پلەی بەندایەتی بۆ کردن جگە لەخوای گەورە بەرزیان کردۆتەوە، جگە لەخوا هانایان بۆبردوە ، هەروەها داوای شتێکیان لێ کردوەو لێ ی دەکەن کەلەتوانای ئەودا نیە جگە لەخوای گەورە، لەهێنانە دی پێداویستیەکانیانو ڕزگار کردنو لەسەر لابردنی ناخۆشیو ماتەمینیەکانیان. وەهەندێکی تریان پەیامەکەی پێغەمبەریان ڕەت کردۆتەوە یا پەردەپۆشیان کردوەولەشوێن کەوتنو دوا کەوتنی دا ڕۆچونوزێدە ڕەویان کردوەو پشتیان بەستوەبەبیر و بۆچونو گۆتە دژو پێچەوانەکانی ئەوپەیامەی کە هێناویەتیو، لە لێکدانەوەی هەواڵو حوکمەکانی دا ستەمو زێدە ڕەویان کردوە.

---

([٧٢]) أ ـ سورة الزمر: (٣٦)

ب ـ واتە: کافرو بێباوەڕەکان بەپێغەمبەریان دەگوت: ئەگەر تۆ هیچکە ناوی خواکانی ئێمە کەمەبەستیان بتەکان بو، ئەوا ئێمەش پترت ئازار دەدەین. بۆیە خوای گەورە پێ ی فەرمو مەترسە ئەوانە هیچیان لەدەست نایەو پوچەڵن ئەدی تۆ خوات بەس نیە یا خوا بەس نیە کەبەندەکەی خۆی بپارێزێت لەهەمو شتێك. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٢١١.

سێ یەم: مەرجەکانی هەردو شەهادەتەکان:

أ‌ مەرجەکانی: لا إله إلاّ الله:

گومانی تێدا نیە دەبێ چەمکی (لا إله إلاّ الله) حەوت مەرجی هەبن، ئەوەی کەئەم چەمکە دەڵێ ئەگەر هەر حەوت مەرجەکان تێکدا کۆ نەکاتەوەو نەیان هێنێتە دی ئەوە هیچ سودێك لەگوتنی ئەم چەمکە نابینێت، وا لەخوارەوە بەویستی خوای گەورە هەر حەوت مەرجەکانی ئەم چەمکە ریز بەند دەکەین:

یەکەم: زانست دژو سرەرەوەی نەزانیو نەفامی (العلم المنافي للجهل).

دوەم: دڵنیایی دژی دو دڵیو ڕاڕاییو گومان (اليقين المنافي للشك).

سێ یەم: وەرگرتنو بڕوا کردن دژی وەلا نانو نەویستن یابڕوا نەکردن(القبول المنافي للرد).

چوارەم: پەیوەند بون دژی وازهێنان (الإنقياد المنافي للترك).

پێنجەم: نیاز پاکیو دڵسۆزی دژی هاوبەش پەیدا کردن (الإخلاص المنافي للشرك).

شەشەم: ڕاستگۆیی دژی درۆ (الصدق المنافي للكذب).

حەوتەم: خۆشەویستی نەرێ ی دژەکەی کەبریتیە لەڕق لێ بونەوەو دڵ ڕەشیو دڵ ڕەقیو کینە ..تد (المحبة المنافية لضدها وهو البغضاء).

ئێستاش والەخوارەوە بەویستی خوا بەدرێژی هەر حەوت مەرجەکان شی دەکەینەوە:

مەرجی یەکەم: زانست(العلم):

واتە زانست بەو واتایەی کەمەبەستە لەوەی کەنەرێ ی(النفـــي) ئەو چەمکەیەو لەوەش کەئەو چەمکە دەیسەلمێنێت، بەوەی کەدژی نەزانیو نەفامی بێت. خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ إِلاَّ مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ سورة الزخـــرف: (٨٦). واتە: شایەدی داوە بەوەی کەهیچ خوایەکی تر نین بەهەق بپەرسترێت جگەلە(الله)(وهم يعلمـــون) واتە دڵیان ئاگای لەوە هەیە کەزمانی گوتویەتیو شایەدی بۆ داوەو ئەوەی بەزمان دەیڵێن واتاکەی دەزاننو ئاگایان لێ یەتی، واتە دەبێ بەدڵو بەزمان بڕیاری لەسەر دەداتو ئاگای لێ بێتو واتاکەی بزانێت، دەی ئەوانەی کەبەزمان (لا إله إلاّ الله) دەڵێنو واتاکەی نازاننو نازانن باسی چیش دەکات، بێگومان ئەوە هیچ سودێکی نیەو تۆزقاڵێك کەڵکی لێ

وەرناگرن، چونکە دڵی لەسەر دانامەزریێو نازانێ چ دەگەیەنێت. بەڵکو تەنیا وشەکان بەزمان گۆدەکاتو بەس.

مەرجی دوەم: دڵنیایی یادڵ دامەزراوی(اليقين): واتە ئەوەی کەئەم چەمکە دەڵێت دڵی دامەزراو بێتو دڵنیا بێت لەوەی کەئەو چەمکە دەیگەیەنێتو، چ دەبەخشێت دڵنیا بێتو بەتەواوی بڕوای پێ هەبێتو گومانی لەدل دا نەبێت، خۆ ئەگەر دو دڵیو گومانی لەدڵ دابێت لەوەی کەئەم چەمکە دەیبەخشێت ئەوا هیچ سودو قازانجێکی پی ناگەیەنێتو باوەڕی تەواوو دامەزراو نیە، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ﴾([٧٣]).

خۆ ئەگەر بەگومان بێت ئەوە دو ڕوە(منافقاً)، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {من لقيت وراء هذا الحائط يشهد أن لا إله إلاّ الله مستيقناً قلبه فبشره بالجنّة}([٧٤]). بەڵام ئەوەی بەدڵی نەبوو یەقین لەدڵی دا نەبوو گومانی هەبو ئەوە شایەنی چونە بەهەشت نیە.

مەرجی سێ یەم: وەرگرتن واتە قبوڵ کردن:

واتە وەرگرتنی ئەو دینە کەیەکێکە لەداخوازیەکانی شایەتمان هێنانو بەندایەتی کردن بەتاکو تەنیا بۆ خوای گەورە، واز هێنان لەهەمو جۆرە بەندایەتیەك بۆ غەیری خوا، واتە لەخوا بەولاوە بەندایەتیو پەرستش بۆ هیچ کەسو هیچ شتێکی تر نەکەیت، هەر کەسێك ئەم چەمکەی گوتو کەچی قبوڵی نەبو بەتەواوی وەری بگرێتو پابەند نەبو پێ یەوە، ئەوە لەو کەسانەیە کەخوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت:﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ۝ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴾([٧٥]).

---

([٧٣])أ ــ سورة الحجرات: (١٥).

ب ـ واتە:بڕواداران ئەوانەن کەبڕوایان هەیە بەخواو بەڕەوانە کراوی خواو هیچ گومانو دو دڵیەکیان لەدڵ دا نیەو بڕوای تەواویان هەیە. وەرگێڕ.

([٧٤])أــ الحديث في الصحيح.

ب ـ واتە: ئەگەر لەدوای دیوارەوە بەکەسێك گەیشتیت شایەتمانی هێناو گوتی:(لا إله إلا الله) بەهەمو دڵیەوەو گومانی لەدڵ دا نەبو و بەڕاستی بو ئەوە مزگێنی بەهەشتی پی بدەن، وەرگێڕ.

([٧٥])أ ــ سورة الصافات (٣٥ ــ٣٧).

**مەرجی چوارەم: شوێن کەوتنو خو دانە دەست(الإنقياد المنافي للترك):**

مل نانو شوێن کەوتنی بۆ ئەو شتەی کەئەم چەمکە دەیگەیێنێتو دەیخوازێت، خوای گەورەو بەرز دەفەموێت:﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى ﴾(٧٦). وە(العروة الوثقى): واتە پەتو دەستگیری توندی خوا کەبریتیەلە چەمکی( لا إله إلاّ الله)، واتە ڕوی خۆی داوەتە دەست خوای گەورە، و ملی ناوەو شوێنی کەوتوەو نیاز پاکیو ئیخلاسیەتیشی بۆئەو چەمکە هەیە.

**مەرجی پێنجەم: نیاز پاکی المنافي للشرك(الإخلاص).**

واتە ئەم وشەیەبلێتو لەقولایی دڵیشەوە بڕوای تەواوی پێ هەبێت، بەڵام ئەگەر بەزمان بیلێتو لەدڵەوە بڕوای پێ نەبێتو لەگەروی ئاوا نەبوبێتو دڵی ئاگای لێ نەبێت، ئەوە ئەو کەسە دوڕوەو درۆزنە، خوای بەرزو بێ واتا دەفەرموێ:﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ۞ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ هەتاکو فەرمایشتی خوا: وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾(٧٧)..

---

ب ـ واتە: ئەو بت پەرستو بێباوەڕانە گەپێ یان بگوترایە جگە لەخوای گەورە هیچ خوایەکی تر نین بەهەق بپەرسترێت ئەوا لەخۆیان بایی دەبونو حیدەت دەی گرتنو تورە دەبونو دەیان گوت: ئایا چۆن ئێمە خواکانی خۆمان واز لێ بێنین بۆ قسەی کابرایەکی شێتو تێك چو یا دەیان گوت بۆ کەسێکی جادو لێکراو. وەرگێڕ.

(٧٦)أـــ سورة لقمان: (٢٢).

ب ـ واتە: هەر کەسێك ڕوی خۆی بداتە دەست خوای گەورەو چاکەکار بێت ئەوە ئەو کەسە بەڕاستی دەستی گرتوە بەپەتو دەستگیری توندو پتەوی خوای گەورەو هیچ غەمی نەبێتو دەگات بەشوێنی مەبەستی خۆی ئەگەر دەست لەو پەتە واتە بەرنامەی خوا بەر نەدات. وەرگێڕ.

(٧٧)أ ـــ البقرة: ٨ـــ٩.

ب ـ واتە: زۆرێك لەخەلکی هەن بەزمان دەڵێن بڕوامان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام درۆ دەکەنو لەدڵیاندا بڕوایان نیە، ئەوانە بەخەیاڵی پوچەڵی خۆیان فێڵ لەخوا و لەو کەسانە دەکەن کەبڕوایان هێناوەو موسڵمانن ، بەڵام ئەوانە خەیاڵیان خاوەو فێڵیان پی لەخوا ناکرێت، بەڵکو فێڵ لەخۆیان دەکەنو لەناو دڵیاندا نەخۆشی هەیە واتە دڵی یان نەخۆشە کەبریتیەلە نەخۆشی دو ڕویی و خوای گەورە ئەو نەخۆشیەی لەدڵدا پتر کردوە ، ئەوانە سزایەکی بەسفتو سوێو سەر شۆڕو ڕیسوایان بۆ هەیە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو درۆیەی کەدەی کەن. وەرگێڕ.

**مەرجی شەشەم: پەسەندیو دڵسۆزی پێچەوانەی درۆ(الصدق المنافي للكذب).**

ئەمەش بریتیە لە پارزین کردن واتە پالاوتنی کردەوەکان لەهەمو پیسو پۆخڵیەکی هاوبەشی پەیدا کردن(الشـــرك)، بەوەی کەهەر کاتێك ئەم چەمکە دەڵێت مەبەستی تەماحی ماڵی دنیاو دەست کەوتنی شتێك یان خۆپارێزی نەبێتو مەبەستی رووپامایی(رياء)و ناوبانگو شوهرەت نەبێت، هەروەکو فەرمودەی راستو لەفەرمودەی عتبان دا هاتوە کەفەرمویەتی: { فإنَّ الله حرم على النار من قال: لا إله إلاَّ الله، يبتغي بـذلك وجه الله}([78])

**مەرجی حەوتەم: خۆشەویستی بۆ ئەو وشەیە یابۆئەم زاراوەیە(المحبة لضدها وهو البغضاء).**

خۆشەویستی بۆ ئەم وشەو بۆ ئەو مەبەستەش هەبێت کەئەم وشەیە دەیگەیەنێت، وەبۆ ئەوانەشی کەبەداخوازیەکانی ئەم وشەیە یائەم چەمکەیە هەڵ دەستن واتە بڕوادارن ـ هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا ﴾([79]).

خەڵکی خوا پەرستو ئەهلی(لا إله إلاَّ الله) خوایان خۆش دەوێت بەخۆشەویستیەکی کاکڵەو پوختو نیاز پاکیو بێ فرو فێڵ، بەڵام بێباوەڕانو ئەهلی هاوبەش پەیداکاران (أهل الشرك) خواشیان خۆش دەوێتو کەسو شتی تریشیان لەگەڵ خوادا خۆش دەوێت، دیارە ئەمەش گومانی تێدا نیە کەدژو پێچەوانەی چەمکی(لآ إله إلاَّ الله)یە.

---

([78]) أ ـ الحديث أخرجه الشيخان.

ب ـ واتە: خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لەسەر ئەو کەسە حەرام کردوە کەبڵێ: (لا إلـه إلاَّ الله)و مەبەستی تەنیا خوا بێتو بەنیاز پاکیەوە بۆ خوای گەورە بێتو هیچ مەبەستێکی تری دنیایی نەبێت. وەرگێڕ.

([79])أ ـ سورة البقرة: (١٦٥).

ب ـ واتە: هەندێ لەخەڵکی جگە لەخوا چەند هاو وێنەو هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا کردوەو خۆشیان دەوێنو گوێ ڕایەڵیان دەکەنو بەقەد خوای گەورەیان خۆش دەوێ، وێنەی ئەوانە لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا گەلێك زۆرن وەختە بڵێم زۆرینەی خەڵکن، یان هەر بڕوایان بەخوا نیە یان لەگەڵ خوادا بڕوایان بەچەند شتێکی تر هەیەو یان هەندێ شتیان گرتۆتە بەرو لەخوایان خۆشتر دەوێنو گوێ ڕایەڵی خوا ناکەن بەڵام بەتەواوی گوێ ڕایەڵی ئەو شتانە دەکەن جائەوانە سەرکردەوو دەسەڵاتداران بن یان زانایانو ...تد. لەپێناو ماڵی دنیاو ژیانی کەمو کورتو کۆتا هاتوی دنیادا ، بەڵام بڕوادارانی ڕاستەقینە خوای پەروەردگاری خۆیان زۆر بەگەرمیو گوڕی خۆش دەوێتو تەنیا گوێ ڕایەڵی پەروەردگاریان دەکەنو گوێ بەهیچ کەسو هیچ شتێکی تر نادەن. وەرگێڕ.

ب ـ مەجەكانی شايەتمانی( أنَّ محمداً رسول الله)ش بريتين لەمانەی خوارەوە:

١ـ بڕوا بون بەپەيامەكەی، بڕوا بون لەناخی دڵەوە بەم چەمكی شايەتمانە.

٢ـ گۆ كردنی ئەم چەمكەو بەئاشكرا بەزمان ددانی پێدا بنرێت.

٣ـ شوێن كەوتنی، بەوەی لەكردەوەكاندا ڕەنگ بداتەوەو كار كردن بەو هەقەی كەهێناويەتی، و وازهێنانو دور كەوتنەوە لەو ناهەقو كارو بەندايەتيە پوچەڵانەی كەقەدەغەی كردون.

٤ـ بڕوا بون بەو هەواڵو خەبەرە پەنهانیو كارە غەيبيانەی كەهەواڵی پێداوين لەڕابردوو لەداهاتودا.

٥ـ خۆشەويستيەكی زۆرت بۆی هەبێتو لەخۆتو لەسەرو ماڵ و كەسو كارو منداڵەكانتو لەباوكو لەهەمو خەڵكيت پتر خۆش بوێت.

٦ـ پێش خستنی پێغەمبەرﷺو سەرخستنی قسەو فەرمودەی ئەوﷺ بەسەر قسەی هەموكەسێكو كار كردن بەسوننەتەكەی.

**چوارەم: پێداويستیو داخوازيەكانی ئەم شايەتمانە:**

أـ داخوازيەكانی شايەتمانی(لا إله إلاّ الله): بريتيە لەواز هێنان لەبەندايەتی كردنو پەرستشی جگە لەخوای گەورە بۆ هەمو پەرستراوەكان، كەبە دەستەواژەی(لا إله) ڕەت دەكرێتەوە. وبەندايەتی كردنو پەرستشی خوای گەورە(الله)گيان بەتاكو تەنيا كەهيچ هاوەڵو هاوبەشی نين، كەبەسەلماندن ناوەرۆكو مەبەستەكەی دێتە دی كەبريتيە لەگوتنی دەستەواژەی(إلاّ الله)، دەی زۆرێك ئەم دەستەواژەيە بەزمانو بەدەم دەڵێن كەچی بەپێچەوانەی داخوازيەكانی دەجوڵێنەوەو تەواو پێچەوانەی ناوەرۆكی دەستەواژەی(لا إلـه إلاّ الله)و داخوزايەكانين، بەمە بۆمان دەسەلمێت كەخوايەتی ياخواوەندی بۆ دروستكراوەكانو گۆڕەكانو مەزارەكانو تاغوتەكان واتە ئەو شتو كەسانەی كەبەغەيری خوا گوێ ڕايەڵیوبەندايەتيان بۆدەكرێت، هەروەها بۆ دار ودرەختو بەردەكانو...تد. قەدەغەو دروست نيە.

وەئەوانەی بڕوايان وايە كەبەتنها خوا پەرستی داهێنراوە(بدعـة)يەو، ئينكاری ئەو كەسانەيان كردوە كەبۆ تەنها خوا پەرستی بانگی كردونو بەڕوی دا هەڵ شاخاونەوە،

سەرکۆنەو لۆمەی ئەو کەسانەیان کردوە کەنیاز پاك بون لەبەندایەتی کردن بۆ خوا(ﷲ) واتە ئەو کەسانەی کەتەنیا خوایان بەتاكو تەنیا پەرستوەو ئیخلاسیەتیان لەبەندایەتی کردندا هەبوە بۆ خوای گەورە.

ب ـ داخوازیەکانی شایەتمانی (أن محمداً رسول الله): واتە بڕوا کردن بەپەیامەکەیو گوێ ڕایەڵی کردنو شوێن کەوتنی بەرنامەکەی، کار کردن تەنیا بەسوننەتەکەی ئەو، نەکردنو واز هێنانو کشانەوە لەهەمو شتێك جگە لەسوننەتەکەی ئەو لەداهێنراوەکانو تازەگەریەکان(البدع والمحدثات)، و پێش خستنو سەرخستنی فەرمودەکانی ئەو بەسەر هەمو قسەو گفتارەکانی تردا.

**پێنجەم: هەڵوەشێنەرەوەکانی هەردو شایەتمانەکە:**

بریتین لەهەڵوەشێنراوەکانی ئایینی ئیسلام، چونکە لێرەدا هەردو شایەتمانەکە گوتنو گۆکردنیان واجبەو پێ یان دەچیتە ناو قەڵای ئیسلامەوە، وەگۆ کردنیان ددان نانە بەناوەڕۆكو مەبەستەکەیان، وەپابەند بونو ئەنجامدانو هێنانە دی داخوازیەکانیانو ، ڕاپەڕاندنی دروشمەکانی ئیسلامە، ئەگەر ناتەواویەکی لەپابەند بونی بەم دروشمانە کرد ئەوە ئەو پەیمانە هەڵ دەوەشێنێتەوە کەلەکاتی گوتنو گۆکردنی هەردو شەهاتەکە دەیان ڵێت. وەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام زۆرن کەزانایانی فیقە لەکتێبە فیقهیەکانی خۆیاندا بەشو دەرگایەکی تایبەتیان بۆ تەرخان کردوەو ناویان ناوە(باب الردة)، گرنگەکانیان دە هەڵوەشێنەرەوەن کەشێخی ئیسلام محمد کوڕی عبدالوهاب ـ رحمه الله باسی کردون کەبریتین لە:

**١ ـ هاوبەشی پەیدا کردن لەبەندایەتی کردنی خوادا**، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء ﴾ سورة النساء: (٤٨ـ ١١٦). هەروەها دەفەرموێت:﴿ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾[80]، لەوانە سەر بڕین بۆ غەیری خوا، وەك سەر بڕین بۆ چاكو پیرو مەزارەکان یاسەر بڕین بۆ جنۆکە.

(٨٠)أ ـ سورة المائدة: (٧٢).

**٢ـ هەر کەسێك واسیتە لەنێوان خۆی و خوا دابنێت،** داوا لەو واسیتانە بکات و داوای تکایان لێ بکات و پشتیان پێ ببەستێت، ئەوە بەکۆڕای زانایانی ئیسلام کافرە.

**٣ـ هەر کەسێك بەهاوبەش پەیداکاران بێ باوەڕ نەبێت،** واتە بڕوای بەهاوبەش پەیداکاران نەبێت، وەهەر کەسێك لەکافر بونیان گومانی هەبێت، یان ڕێبازەکەیان بەڕاست بزانێت و بڕوای پێ هەبن، ئەو کوفری کردوە و کافر بوە.

**٤ـ هەر کەسێك باوەڕی وابێت کەغەیری پەیام و هیدایەتی پێغەمبەرﷺ** باشترو تەواو ترە لەپەیام و ڕێنومابیەکەی ئەو، یاخود حوکمی غەیری حوکمی پێغەمبەرﷺ چاکترو باشترە، وەکو ئەوانەی کەحوکمی ستەمکاران و تاغوتەکان بەباشترو چاکتر دەزانن لەحوکمی پێغەمبەرﷺ و حوکمی یاسای دەستکرد لەحوکم و یاساو ڕێساکانی ئیسلام بەباشتر دەزانن و کاریان پێ دەکەن و کار بەحوکمی ئیسلام ناکەن ئەوەش پێ ی کافر دەبێت.

**٥ـ هەر کەسێك ڕقی لەشتێك بێتەوە لەوانەی کەپێغەمبەرﷺ** لەخواوە هێناونی ـ هەر چەندە کاریشی پێ بکات ـ ئەوە کافر بوە.

**٦ـ هەر کەسێك گاڵتە بکات بەبەشێك لەئاینی پێغەمبەرﷺ** ، یابەپاداشتەکانی، یابەسزاکانی، ئەو کافر بوە. بەڵگەشمان بۆ ئەمەفەرمایشتی خوای گەورەیە کەدەفەرموێ:﴿ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ۞ لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾[81].

**٧ـ جادو کردن، لێك کردن** واتە لەبەرچاو ڕەش کردن و خۆشەویستی و ڕاکێشانی سۆز (الصرف والعطف) (کەلەوانەیە مەبەستی کردنی کارێك بێت بۆ نەهێشتنی خۆشەویستی

---

ب ـ واتە: هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت بەهەشتی لێ حەرامەو جێگەو شوێنی حەوانەوەی ناو ئاگری دۆزەخە، ستەمکاران و بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکاران هیچ سەرخەرو پاڵپشت و یارمەتی دەرێکیان نیە لەڕۆژی قیامەتدا. وەرگێڕ.

([81])أـ سورة التوبة (٦٥ــ٦٦).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺ بەو بێباوەڕو خوا نەناسانە بڵێ: ئەوە ئێوە بەخواوبەرنامەکەی خواو ئایەتەکانی قورئان و بەپێغەمبەرەکەیﷺ خوا گاڵتەو قەشمەری دەکەن و بڕوای پێ ناکەن و هاوەبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن، ئەمڕۆ بڕو بیانوو ئەنجەت مەهێننەوەو وپاکانە بۆ خۆتان مەکەن ئەی دو ڕوینە سوێندی درۆینە مەخۆن و پاکانە بهێننەوەأ چونکە ئەمڕۆ پاکانەی درۆزنانە هیچ سودێکی نیە بۆتان، ئێوە بێباوەڕێتی خۆتان ئاشکرا کرد، دوای ئەوەی بەدرۆ بڕاویی خۆتان ڕاگەیاند بوز وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەم ب١ل٤٨٥.

پیاو بۆ ژنەکەی‌و لەپێش چاو ڕەش بونی بەهۆی جادو لێ کردنەوە یا کار کردن بۆ زیاد کردنی خۆشەویستی بۆی یان بۆ ئەوەی ژنەکەی خۆش بوێت)، هەر کەسێك ئەم کارە بکات یان پێ ی ڕازی بێت ئەوە پێ ی کافر دەبێت، بەڵگەشمان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوای گەورەیە:﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَتَكْفُرْ ﴾([82]).

**٨ـ لایەنگیری کردن‌و سەرخستن‌و خۆشەویستی‌و مەیل کردن بۆ هاوبەش پەیداکاران‌و بێباوەڕەکان، یارمەتی دان‌و پشت گرتنیان لەدژی موسڵمانان( کورد گوتەنی کلك‌و وابەستەو جاش‌و خۆفرۆشەکانی هاوبەش پەیداکاران‌و کافرەکان و دوڕوەکان ـ وەرگێڕ ـ)بەڵگەشمان ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە:**﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾([83]).

---

([82])أ ــ سورة البقرة: (١٠٢).

ب ـ واتە: جولەکە خوانەناسەکان‌و سەرسەخترین دوژمنەکانی خواو مسڵمانان بەڵکو هەمو بەشەریەت بەگشتی هەزاران هەزار چەواشەکاری و فرو فێڵیان لەموسڵمانان کردوەو درۆو دەلەسەو هەڵبەستیان پێکەوە ناوەو خستویانەتە ناو شەریعەتی ئیسلام کەپێ یان دەگوترێت(ئیسرائیلیات) بۆ چەواشە کردنی موسڵماناو لادانیان لەئایینی ئیسلام‌و هەڵ گێڕانەوەیان لەبەرنامەی خواو دوژمنایەتی کردن لەگەڵ پێغەمبەرﷺ. بەهەزاران جادوو جادوگەریان بڵاو کردۆتەوە کەباسەکە درێژەو ئێمە لێرەدا ناتوانین بەدرێژی باسی بکەین ئەوەی حەز دەکات ڕاستی ئەم چەواشەکاریانەی ئەو جولەکە پیس‌و پۆخڵانەی بۆ دەر بکەوێت باسەیری تەفسیری گوڵەشەنی مامۆستا نظام الدين عبدالحميد بکات لاپەڕە ٤٣ـ٤٦. جولەکەکان وایان خستۆتە ناو مێشکی خەڵکی یەوە گوایە ئەو دو کەسەی کەلەشاری بابل (حلـة)ی باشوری عێراق کەجادویان فێری خەڵکی دەکرد فریشتە بون‌و خوا ناردونیە خوار تاجادوگەری فێری خەڵکی بکەن، دەك خوا ڕویان ڕەش بکات لەگەڵ بوختانێ کەبەدەم خوای گەورەوە کردیان، خوای گەورە بەدرۆی خستنەوە کەهیچ کەسێك‌و هیچ شتێك لەم بارەوە لەئاسمان نەهاتۆتە خوار ئەوانە هەمو درۆ دەلەسەکانی جولەکە دڕندەکانن، ئەوانە واتە ئەو دو کەسە وایان خۆ نیشان دەدا کەپیاوی چاکن‌و شتێکی باش فێری خەڵك دەکەن، بەڵام ئەوان جادویان فێری خەڵك دەکردو هەر شتێکیان فێری خەڵك بکردایە چونکە حیلەبازو درۆزن بون پێ یان دەگوت: ئێمە تاقی کەرەوەین و ئەوەی فێرت دەکەین بۆ خراپەکاری بەکاری مەهێنەو تۆ بێباوەڕ مەبە، کەچی ئەوان بۆخۆیان هەر شتێکی فێری خەڵکیان دەکردن بۆ مەبەستی خراپەکاری‌و ئاشوب نانەوە بەکاریان دێنا بۆ جیاکردنەوەو لەیەك کردنی خەڵکی و لێك دابڕانی ژن‌و مێرد، وخۆشەویستان لەناو یەکتری داو فیتنەو ئاشوبیان دەنایەوە. هەر چەندە ئەوانە نەیان دەتوانی زیان یا سود بەکەس بگەیەنن مەگەر خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بایە. وەرگێڕ، تەفسیری گوڵشەن ب١.

([83])أ ــ سورة المائدة: (٥١).

ب ـ واتە: ئەی بڕوادران ئێوە جولەکەو گاورەکان مەکەن بەدۆست‌و پشت‌و پەنای خۆتان‌و مەیل‌و خۆشەویستیتان بۆیان هەبێت، لەدژی موسڵمانان یارمەتیان بدەن، هەر کەسێك لەئێوە لایەنگیری ئەوان بکات‌و یارمەتیان بدات‌و خۆشی بون‌و بەپاڵ پشت‌و لایەنگیری خۆیانی بزانێت ئەوە ئەو کەسە لەوانە واتە بێباوەڕ بوەو لەبازنەی موسڵمانەتی‌و ئیسلام

**٩ـ هەر کەسێك باوەڕی وابێت کەهەندی لەخەڵکی دەتوانن‌و بۆیان هەیە لەشەریعەتی** محمد ﷺ دەر بچێت هەر وەك چۆن خدر(الخضر) توانی لەشەریعەتی موسا ـ علیه السلام ـ دەربچێت ئەوە ئەو کەسە کافرە، گوتم: هەروەکو چۆن سۆفیەکان باوەڕیان وایە کەدەگەنە پلەیەك پێویستیان بەشوێن کەوتنی پێغەمبەرﷺنیە.

**١٠ـ لادان‌و پشت کردن لەئاینی خوا**، نەهەوڵی فێر بونی دەدەن، نەکاریشی پێ دەکەن، بەڵگەش ئەم فەرمودەی خوایە کەدەفەرموێ:﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ﴾([٨٤]). هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ ([٨٥])

شێخ محمد بن عبدالوهاب ـ رحمه الله ـ گوتویەتی:(جیاوازی لە هەمو ئەم هەڵوەشێنەرەوانەدا نیە، لەنێوان بەقەستی‌و بەگاڵتە(الهازل)و بەڕاستی‌وجدی(الجاد)و ترساندن و یا لەترسان(الخائف)، مەگەر ئەو کەسەی زۆری لێ بکرێت‌و بەزۆر پێ ی بکەن(المكره). ئەم هەڵوەشێنەرەوانە هەر هەمویان لەوانەن کەزۆر مەسیدارنن و لەزۆرترینی ئەو شتانەن کەڕویان داوەو ڕو دەدەن. بۆیە لەسەر موسڵمانان پێویستە کەخۆیانی زۆر لی بپارێزن‌و زۆر وریا بن‌و بەرچاو ڕۆشن بن، باهەمیشە وریابن‌و خۆیان بپرێزن نەبادا تێ ی بکەون‌و توشیان ببێت، پەنا بەخوا دەگرین لەهۆکارو پاڵنەرەکانی غەزەب‌و تورەیی خوا، وەلە سزای بەسفت‌و سوێ‌و بەئازاری خوا)([٨٦]).

---

دەرچوەو باباشیش بزانێت کەخوای گەورە یارمەتی‌و هاریکاری ستەمکاران‌و بێباوەڕان‌و دوڕوان نادات‌و هەرگیز سەربەرزو سەرکەوتویان ناکات. وەرگێڕ.

([٨٤])أ ــ سورة الأحقاف: (٣).

ب ـ واتە: ئەوانەی کەبێباوەڕو کافرن هەمیشە پشت لەو بەرنامەو پەیامە دەکەن کەلەلایەن خواوە هاتوتە خوارو لێ ی ئاگادار دەکرێنەوە.. وەرگێڕ.

([٨٥])أ ــ سورة السجدة: (٢٢).

ب ـ واتە: کێ لەو کەسە بێباوەڕ تروستەمکار تر هەیە کەئایەت‌و بەرنامەکەی خوای پەروەردگاری دەخرێتە بەردەم‌و یان یادی دەخرێتەوەو بۆی دەخوێندرێتەوەو ئامۆژگاری دەکرێت بەڵام ئەو پشتی تێ دەکات‌و ڕوی خۆی لی وەرگێڕێت‌و وەری نەگرێت‌و لوت بەرزی دەیگرێت، بێگومان ئێمە تۆڵە لەتاوانباران دەکەینەوەو سزای سەختیان دەدەین هەروا بەئاسانی بەسەریاندا ناڕوات.. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل١٠٦٩.

([٨٦]) مجموعة التوحيد النجدية:ص٣٧ــ٣٩.

## بەشـی سێیەم

## لەیاساو دەستور داناندا ( في التشريع )

دەستوورو یاسا دانان مافی خوای بەرزو بێ هاوتایە: وەمەبەستیش لەدەستوورو یاسا دانان بریتیە لەو بەرنامەو یاساو ڕێساو دەستوورو کەتەلۆکەی کەخوای گەورە بۆ بەندەکانی خۆی دەنێرێتە خوار و لەشێوەی مەنهەج و پرۆگرامێکدا کەلەبواری بیروباوەڕو هەڵس و کەوت و مەعامەلاتەکانیاندا لەژیانیادا لەسەری دەڕۆن، لەوحوکم و یاساو ڕێسایانەش حەڵاڵ کردن و حەرام کردن، بۆ هیچ کەسێك نیە شتێك بەبێ فرمانی خوا حەڵاڵ بکات تەنیا ئەوە نەبێت کەخوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردوین، هەروەها ناتوانرێت هیچ شتێك بەبێ فرمانی خوا حەرام بکرێت، جگە لەوەی کەخوای گەورە لەسەری حەرام کردوین، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَـذَا حَلاَلٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ ﴾([٨٧]).هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلاَلاً قُلْ آللّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى اللّهِ تَفْتَرُونَ﴾([٨٨]).

خوای گەورە حەرام کردن و حەڵاڵ کردنی لەلایەن بەندەکانیەوە قەدەغە کردوە، بەبێ بەڵگەو سەلملندن لەقورئان و سوننەتەوە، خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەئەمە درۆیەو بەدەم خوای گەورەوە دەکرێت، هەروەها خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەهەر کەسێك

---

([٨٧])أ ـــ سورة النحل: (١١٦)

ب ـ واتە: ئەی بت پەرست و ئەی بێباوەڕان ئەوەی کەبەزمانی خۆتان دەڵێن و درۆ بەدەم خواوە هەڵ دەبەستن و دەڵێن ئەمە حەڵاڵە کەچی خوای گەورە لەسەری حەرام کردون، یان دەڵێن ئەمە حەرامە لەکاتێکدا خوای گەورەی حەڵاڵی کردوە ، هەر بۆ ئەوەی درۆ بەزمان خواوە هەڵ ببەستن ئەوەی درۆ بەزمانی خواوە هەڵ ببەستێت لەدنیاو لەقیامەتدا هیچیان بۆ نامێنێتەوە تەنیا ڕووڕەشی و بەدبەختی نەبێت. وەرگێڕ.

([٨٨])أ ـــ سورة یونس: (٥٩).

ب ـ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەو بێباوەڕو بت پەرستانە بڵێ: نابینن ئەو نازونیعمەت و ڕۆزیەی کەخوای گەورە پێ ی داون و بۆی دروست کردون و بۆی ناردونە خوار حەڵاڵ و حەرامی بۆ لێك جیا کردونەوە، ئەوەی لێ ی حەڵاڵ کردون کەچی ئێوە لەخۆتانەوە هێندێك حەرام دەکەن و هەندێشکیش حەڵاڵ، توخوا ئەوە خوا بۆی وا داناون و بڕیاری لەسەر داوە، یان خۆتان نەفسی خۆتان وای دەوێ و بەدەم خوای گەورەوە بوختان دەکەن. ئەوەی خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردون هەتا دنیا دنیایە حەڵاڵە و ئەوەیشی حەرامی کردوە هەتا هەتایە هەر حەرامەو بەکەس نەحەرام و نەحەڵاڵ ناکرێت. وەرگێڕ.

هەر شتێك یان هەر كارێك پێویست(واجـــب) بكـاتو شتێك حـەرام بكـات بـەبی بەڵگـەو سەلماندن، ئەوە ئەو كەسـە خـۆی كردۆتـە هاوبـەشو شـەریكی خـوای گـەورەو كـارێكی كردوە كەتەنیا پەیوەندە بەخوای گـەورەو مـافێكی تایبـەتیو لەجیاكاریـەكانی خۆیـەتی كەیاساو دەستور دانان یا داڕشتنە، ئەوەتە خوای گەورە دەفـەرموێت:﴿ أَمْ لَهُمْ شُـرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ﴾(٨٩).

جاهەر كەسێك جگە لەخوای گەورە گوێ ڕایەڵی ئەو یاساو دەستور دانەرە بكـاتو بـش زانێت كەسەرپێچی خوای كردوەو بەبێ فرمانی خـوا ئـەو دەسـتورو یاسـایەی داڕشـتوەو پێشی ڕازی بێتو لەگەڵی دا ڕێك بێتو هاریكاری بكـات، ئـەوە ئـەو كەسـەی كردۆتـە شـەریكی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ سورة الأنعام: (١٢١).

واتە: ئـەوەی كەئـەو شتانە حـەڵاڵ دەكـات لـەمردارەوە بوەكـان، هـەر كەسـێك گـوێ ڕایەڵیان بكات لەوەداو بەقسـەیان بكـاتو لایـەنگیری بكـات ئـەوە هاوبـەش پەیـدا كـەرە (مشرك)، هەروەكو خوای گەورە هـەواڵی پێداوین كەئەگـەر هـەر كەسـێك گـوێ ڕایـەڵی قەشـەو مالمەكان (الأحبار والرهبان) بكات لەحەڵاڵ كردنـی شـتێك كـەخوای گـەورە حـەرامی كـرد بێـت، هەروەها لەحەرام كردنی شتێك كەخوای گەورە حـەڵاڵی كـرد بێـت، ئـەوا ئەوانـە جگـە لـەخوای گەورە چەندان پەروەردگارو دۆستیان بۆ خۆیان بریار داوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَـــهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(٩٠).

---

(٨٩)أ ـــ سورة الشورى: (٢١).

ب ـ واتە: ئایا ئەو بێباوەڕو بت پەرستو خوا نەناسانە هاریكارو ڕاوێـژكارو هـاوەڵی وایـان لـەبێباوەڕیو سـەر لێشێواوو گومڕایی دا هەیە كەئەوا لەدیندا یاساو ڕێساو دەستوریان بۆ دابڕێـژێت، كـەخوای گـەورە ڕێگـەی پـێ نـەداون. چـونكە داڕێژەری دەستورو یاسا تەنیا خوای گەورەیەو بەس. وەرگێڕ.

(٩٠)أ ـــ سورة التوبة: (٣١).

ب ـ واتە: جولەكەكان مالومەكانیانو گاورەكـانیش قەشـەو كامینـەكانو عیسـای كـوڕی مەریەمیان دەپەرستو كردو بویانە خواو پەروەردگاری خۆیان جگە لەخوا دەیان پەرستن؛ ب ـ واتە: ئایا ئەو بێباوەڕو بت پەرستو خوا نەناسانە هاریكارو ڕاوێژكارو هاوەڵی وایان لەبێباوەڕیو سەر لێشێواوو گومڕایی دا هەیە كەئەوا لەدیندا یاساو ڕێساو دەستوریان بۆ دابڕێژێت، كەخوای گەورە ڕێگەی پێ نەداون. چونكە داڕێژەری دەستورو یاسا تەنیا خوای گەورەیەو بەس. وەرگێڕ.

(٩٠)أ ـــ سورة التوبة: (٣١).

کاتێ عدّي کوڕی حاتمﷺئەم ئایەتەی بیست گوتی: ئەی ڕەسولی خوا، ئێمە خۆ ئەوانمان نەدەپەرست، پێغەمبەرﷺفەرموی: {أليسوا يحلون ماحرَّم الله فتحلونــه، ويحرمــون ماأحــل الله فتحرمونه؟} گوتی : بەڵێ، فەرموی: {فتلك عبــادتهم ـ دەی ئەو بەندایەتی کردنو پەرستنی ئەوانە([91]).

شێخ عبدالرحمن کوڕی حسنﷺگوتویەتی:(ئەوەی لەفەرمودەکەدا هاتوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەگوێ ڕایەڵی کردن جگە لەخوای گەورەبۆ مالمو قەشەو زاناکانیان لەسەرپێچی کردنی خوادا، بەندایەتی کردنو پەرستنە بۆیانو لەهاوبەشی پەیدا کردنی گەورەیە(الشرك الأكــبر) و خوای گەورە لەو تاوانە خۆش نابێت، بەگوێرەی فەرمایشتەکەی خوا کەلەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت:﴿ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

وەلەهاوشانو هاو وێنەی ئەمەدا خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّــيَاطِينَ لَيُوحُــونَ إِلَــى أَوْلِيَــآئِهِمْ لِيُجَــادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُــوهُمْ إِنَّكُــمْ لَمُشْرِكُونَ﴾([92]).

ئەم دیاردەو ئەم تاوانە زۆرێك لەخەڵکی تێ ی کەوتون لەگەڵ ئەو کەسانەی کەلاساییان کردونەتەوە، چونکە کاتێ لاسایی کەرەوەکە سەرپێچی کردو هیچ گوێ یان نەدایە بەڵگەشەرعیەکان هیچ ئیعتبارێکیان بۆ بەڵگەکان نەکردواتە گوێ ی نەدایە شەریعەتو یاساو ڕێساکانی خوا کەمەبەست لەقورئانو سوننەتەو بەڵکو ئەو کەسەی پێ ڕاستر بو کەلاسایی دەکاتەوە ، ئەمەش لەو هاوبەشی پەیدا کردنەیە). ..تەواو..

---

ب ـ واتە: جولەکەکان مالومەکانیانو گاورەکانیش قەشەو کاهینەکانو عیسای کوڕی مەریەمیان دەپەرستو کردو بویاننە خواو پەروەردگاری خۆیان جگە لەخوا دەیان پەرستن، لەکاتێکدا ئەوانە فرمانیان پێ کرا بو کەتەنیا یەك خوا بپەرستن کەخوای پەروەردگارە، کەهیچ خوایەکی تر نین بەهەق بپەرسترێت جگە لەو، خوای گەورە پاكو بێگەردەو دورە لەوەی کەکافرو بێباوەڕو بت پەرستەکان بۆی بڕیار دەدەن. گوێ ڕایەڵیو شوێن کەوتنو ڕازی بون بەوەی کەخەڵکیو قەشەو مالمو زاناکانو هەر کەسێکی تر بێت دەیکەن لەحەرام کردنو حەلاڵ کردنو هەر شتێکی تر ئەوە بەندایەتی بۆ کردنو پەرستنە. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل٤٧٣.

([91])أ ــ رواه الترمذي.

ب ـ واتە: ئایا ئەوان شتیان بۆ حەلاڵ نەدەکردو ئێوەش بەحەلاڵتان دەزانی، و شتیان بۆ حەرام نەدەکردو ئێوەش بەحەرامتان دادەنا لەکاتێکدا لای خوای وای لەسەر نەدرا بو؟! وەرگێڕ.

([92])أ ــ سورة الأنعام: (١٢١).

ب ـ واتە:

دەی پابەند بون بەشەریعەتی خواو، واز هێنانو پشت کردن لەهەمو شەریعەتێکی تر، لەداخوازیەکانی (لا إله إلاّ الله). خوای گەورە پالّ پشتو یارمەتیدەرە.

## بەشی چوارەم

## بەندایەتی کردن : واتاکەی، سنورەکەی(گرتنەوەکەی- شمولها )

١- واتای بەندایەتی کردن:

بنەڕەتی بەندایەتی کردن: ملکەچو گەردن کەچی یە.

وەلەشەریعەتدا: پێناسەیەکی زۆری بۆ کراون، و هەمویان یەك واتایان هەیە.

لەوانە: بەندایەتی کردن بریتیە لەگوێ ڕایەلّی خوای گەورە بەجێ بەجێ کردنی فرمانەکانی کەفرمانی پێ کردوە لەسەر زمانی ڕەوانە کراوەکانی.وئەنجامدانی فرمانەکانیو وازهێنانو کشانەوە لەقەدەغە کراوەکانی.

هەروەها لەوانە: بەندایەتی کردن، بەواتا: ملکەچیو گەردن شۆڕی بۆ خوای پاكو بێگەرد : کەبریتیە لەنواندنی ئەو پەڕی ملکەچیو ئەو پەڕی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە.

وەباشترینو کۆك ترین پێناسە ئەوەیە کەبەندایەتی بۆ کردن بریتیە لەناوێکی کۆو گگشتگیرە(الجامع) بۆ هەمو ئەو کاروکردەوەو شتانەی کەخوای گەورە خۆشی دەوێو لێ یان ڕازیە، لەگفتارو قسەوکارو کردەوەکانی ونو ئاشکرا(الظاهرة والباطنة).

ئەو کارو گفتارانەش دابەش بون بەسەر دلّو زمانو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ یاخود هەستیارەکانی مرۆڤ(الجوارح).، ترسانو ئومێد(الخوف والرجاء)، خۆشەویستیو پشت پێ بەستن(المحبة والتوكل)، ویستو ئارەزوو ترس(الرغبة والرهبـــة)ئەمانە بەندایەتیەکانی دلّن، ویردو یادی خواو ستایشو پاك ڕاگرتن (التســـبيح )و (لا إلـــه إلاّ الله) کردن واتە:(التـهليل)، و(الله أكـــبر)کردن، سوپاسگوزاریو شوکرانە بژێری بەزمانو بەدلّ: ئەمانەش بەندایەتی کردنی زمانیو دلّین.

وەنوێژو زەکاتو حەجو تێکۆشان(الجهاد): بەندایەتی کردنی جەستەییو دلّین، ئەمانەو گەلێکی تر لەجۆرەکانی بەندایەتی کردن کەبەسەر دلّو دەرونو زمانو ئەندامەکانو هەستیارەکانی(الجوارح) مرۆڤدا تێ دەپەڕن، کەژمارەیان گەلێك زۆرن.

وەبێگومان بەندایەتی کردن: ئەوەیە کەخوای گەورە دروستکراوەکان واتە بونەوەری لەپێناودا دروست کردوەو هێناوەتە دی، خوای بالا دەستو کاربەجێ دەفەرموێ:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ۝ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ۝ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾. سورة الذاريات (٥٦-٥٨).

خوای پاكو بێگەرد هەواڵی پێداوین کەحیکمەت لەدروست کردنو هێنانە دی جنۆکەو مرۆڤەکان ئەوەیە: کەبەبەندایەتی کردنو پەرستنی خوا هەڵ بستنو تەنیا لەو پێناوەدا دروستی کردون، بەندایەتی ئەوان هیچ سود بەخوا ناگەیەنێتو خوای گەورە هیچ پێویستیەکی بەپەرستنو بەندایەتی ئەوان نیە، بەڵکو ئەوە جنۆکەو مرۆڤەکانن پێویستیان بەخوای گەورە هەیەو هەژارن بەدەستی خوا، دەبێ بەپێ ی شەریعەتەکەی خوا پەرستنو بەندایەتی بۆ بکەن، و دەبێ لەسنوری بەرنامەو شەریعەتی ئەو دەرنەچن، هەر کەسێك ڕازی نەبێتو لاملی بکات کەبەندایەتی بۆ خوا بکاتو لەسنوری شەریعەتەکەی دەربچێت، ئەوە خۆ بەزل زانەو لەخۆ باییە، وەهەرکەسێکیش بەندایەتی بۆ خواو غەیری خواش بکات، ئەوە هاوبەش پەیدا کارە(مشرك)ە وەهەر کەسێکیش تەنیا ئەو بپەرستێتو بەندایەتی تەنیا بۆ خوا بکات بەغەیری ئەوەی کەخوا بۆی دانا بێت واتە بەغەیری شەریعەتی خواو لەبەرنامەکەی خوادا فرمانی پێ نەکرا بێتو زیادەی بخاتە سەر ئەوە داهێنەرو تازە گەرە(مبتدع)ە. وەهەر کەسێکیش بەندایەتیو پەرستشی خوا بکات بەو گوێرەی کەخوا بۆی داناوە واتە بەپێ ی شەریعەتەکەی خوا ئەوە ئەو کەسە بڕوادارێکی بەتەنها خوا پەرستە(موحد)ە.

٢. جۆرەکانی بەندایەتی کردنو شمولیەتی:

بەندایەتی کردن گەلێ چەشنی هەن، هەمو جۆرەکانی گوێ ڕایەڵی ڕواڵەتی واتە بەئاشکرای سەر زمانو ئەندامەکانی جەستە دەگرێتەوە، کەلەدڵەوە دەردەچن، وەك: ستایش کردنو بەپاك ڕاگرتنی خواو(التسبيح)و کردنی(لا إلــه إلاّ الله)و خوێندنەوەی قورئانو نوێژو زەکاتو ڕۆژو،و حەج،و تێکۆشانو فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردنی خراپە، چاکە کردن لەگەڵ خزمو خوەیشو هەتیوانو هەژارانو دەست کورتانو ڕێبواران، هەروەها خوش ویستنی خواو پێغەمبەری ﷺ خوا، ترسان لەخواو گەڕانەوەو بۆ لای

خواو پەشیمان بونەوە، نیاز پاکی(الإخــلاص) لەئاییندا بۆ خوای گەورە، ئارامیو خۆڕاگری بۆ حوکمەکانی خوای گەورەو ڕازی بون بەقەزاو قەدەری خوا، پشت بەستن تەنیا بەخوا، داوا کردنو ئومێد بون بەڕەحمەتو سۆزو بەزەیی خوا، وترسان لەسزاو ئازاردانەکانی، کەهەمو هەڵسو کەوتێکی بڕوا دار دەگرێتەوە، ئەگەر نیەتی بۆ نزیك بونەوەو لەبەر خاتری خوا بێت، هەتاکو عاداتو ئاکارەکانیشی ئەگەر مەبەستی پێی بەهێز بونی جەستە بێت بۆ بەندایەتی کردنو پەرستنوگوێ ڕایەڵیەکانی خواو مەبەستی خۆ لەخوا پارێزی بێت، واتە بۆ ئەوە بێت کەبتوانێت خوا پەرستی تەنها خوا پەرستیانەی پێ بکاتو فرمانەکانی خوا ڕابپەڕێنێتو لەڕێگەی حەڵاڵەوە ژیانی خۆیو خاوو خێزانو کۆرپەلەکانی پێ دابین بکاتو هێزو قوەت بەجەستەیان بدات تابتوانن‌و بەندایەتیو پەرستشی بۆ خوای گەورە بکەنو جەسەتەو لەشێکی پتەوی بەرگری کارانەی هەبێت بۆ وەستان لەبەردەم دوژمنانی ئیسلامو موسڵمانانندا لەکاتی تێکۆشانو ڕو بەڕو بونەوە لەگەڵ هێزو سوپای دوژمنانی ئاییني خوادا، وەکونوستنو خواردنو خواردنەوە، فرۆشتنو کڕینو دلوای ڕۆزی کردنو هاوسەرگیریەتی، ئەم عاداتو ئاکارانە هەمویان ئەگەر نیەتی باشی لەگەڵ دا بن ئەوا دەبنە بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، پاداشتیان لەسەر وەردەگرێتەوە، چونکە بەندایەتی کردن بۆ خوا تەنیا لەچەند دروشمێکی دیاریکراوو ناسراودا کورت هەڵ نەهاتوە.

**** **** ****

## بەشــی پێنجەم

### ڕونکردنەوەی چەمکە هەڵەکان لەدەست نیشان کردن و سنوردانان بۆ بەندایەتی کردن

بەندایەتی کردن براوەیە(توقيفية): واتـا هـیچ شـتێك و هـیچ جۆرێـك لـەجۆرەکانی بەندایـەتی لەخۆوەو بێ بەڵگە لەقورئان و سوننەت داناڕێژرێت، دەی کەنەتوانرێت دابڕێژرێت کەواتە ئەوەی دابڕێژرێت و ئەنجام بدرێت کەلەقورئانەوە سوننەتەوە نەهاتبێت ئەو داهێنراوەو ڕەت دەکرێتەوە و بەســەر چـاوی خۆیـان دادەرێتــەوەو لەسەریشــی ســزا دەدرێــت، هــەروەکو پێغەمبــەری خۆشەویست ﷺ فەرمویەتی: {من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهــو ردٌ}([٩٣]). واتــە کارەکــەی لێ وەرناگیرێت و بەسەر چاوی خۆی دادەدرێتەوە، بەڵکو گوناحبار دەبێــت و لەســەری ســزای بەسفت و ســوێ دەدرێــت، چونکە ئــەوە سەرپێچی و یــاخی بونــە نــەك بەندایــەتی و گوێ ڕایەڵی، وەهەروەها مەنهەجی ڕاست و تەواو لەبەندایەتی کردنی شەرعیانە بریتیە لە:میانە ڕەوی و ئاســانکاری و نــەرمی و تەمبــەڵی و سســتی(التساهلُ والتكاســــــل)،و تونــدی و زێدەڕەوی(التشدد والغلو) دایە. خوای گــەورە بەپێغەمبەرەکــەی ﷺ دەفــەرموێت:﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلاَ تَطْغَوْاْ ﴾([٩٤]).

ئەم ئایەتە پیرۆزە هێڵکاری پلان و نەخشەی مەنهـەجی ڕاسـتی(ســليم) لەئەنجامدان و کردنی بەندایەتیەکانی تێدا کێشراوە، ئەوەش بەبەردەوام بون و پێدا مەزراوی ئەنجامدانی بەڕێگەیــەکی مــام ناوەندیانــە، کەنەزێــدە ڕەوی و نــەکورت ڕەوە تێــدا نیــە، بــەگوێرەی شەریعەت( كما أمرت ـ هەروەك چۆن فرمانت پێکـراوە)ئـەمجار جەختیشــی لێ دەکاتــەوە بەفرمایشتی(وَلاَ تَطْغَوْاْ ـ زێـدەڕەوی و سـتەم مەکـەن)وە(الطغيـــان) بـەواتا تـێ پەڕانـدن و لەسنور دەرچون بەزەبر زەنگ و توندو تیژی و ڕۆچون و زێدە ڕەوی، کەبریتیە لە(الغلــو ـ ڕۆچـون و زێـدەڕەوی)کاتــێ پێغەمبــەر ﷺ گــوێ ی لەقسەو گفـت و گـۆی ســێ کــەس بـو کەلەنێوان خۆیاندا باسی کردەوەکانی خۆیان دەکرد: کاتێ یەکێکیان دەیگوت: من هــەمو

---

([٩٣])أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە: هەر کەسێك کارێك بکات و فرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە بەسەرچاوی خۆی دادەدرێتەوە. وەرگێڕ.

([٩٤])أــ سورة هود: (١١٢).

ب ـ واتە: بەردەوام و پێدامەزراو بە هەروەکو خوای پەروەردگارت فرمانی پێ کردویت هەروەها ئەوانەشی کەلەگەڵ تۆدا بروایان هێناوەو تۆبەیان کردوەو زێدەڕەوی مەکەن، وەرگێڕ.

ڕۆژێ بەڕۆژو دەبمو ڕۆژی بەدوا نادەم واتە هەرگیز نایشکێنم، ئەوی تریان گوتی: منیش شەو ناخەومو هەر شەو نوێژان دەکەم، وەسێ یەمیشیان گوتی: منیش بڕیارم داوە هەرگیز ژن نەهێنم. پێغەمبەرﷺ ی فەرمون: {أما أنا فأصوم وأفطر وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني}([١٠]). ئێستا خەڵکی لەبەندایەتی کردندا بون بەدو دەستەی دژو پێچەوانەی یەکتری کەبریتین لە:

دەستەی یەکەم: لەچەمکی بەندایەتی دا زۆر کورت ڕەونو نەرمی یەکی زۆریان لەئەنجامدانی دا کردوە بەجۆرێك زۆرێك لەجۆرەکانی بەندایەتیان پەك خستوەو نایکەن، لەهەندی کاری سنورداردا کورتیان هەڵێناوە،و کەمێك لەدروشمەکان واتە بەندایەتیەکان تەنیا لەمزگەوتدا ئەنجام دەدەنو بەس، نەلەماڵەوەو لەنوسینگەداو نەلەشوێنی بازرگانی داو نەلەشەقامو نەلەکڕینو فرۆشتنو نەلە سیاسەتو نەلەحوکمی ناکۆکیەکاندا نەلەغەیری ئەمانەش لەکاروبارەکانی ژیاندا.

بەڵێ مزگەوتو ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام پێویستە پێنج نوێژەکان لەمزگەوتدا بەکۆمەڵ بکرێن، بەڵام بەندایەتی کردن هەمو ژیانو قۆناغەکانی ژیانی موسڵمان دەگرێتەوە، لەناو مزگەوتو لەدەرەوەی مزگەوتیش.

دەستەی دوەم: توند ڕەوی کردن لەجێ بەجێ کردنی بەندایەتیەکان تادەگاتە سنوری زێدە ڕەوی، بەجۆرێك ڕێگە پێدراوەکان(المستحبات) بۆ پلەی پێویست(الواجبات) بەرز دەکاتەوە، و هەندێ لەشتە دروستەکان حەرام دەکات، وەهەر کەسێك لەگەڵ مەنهەجو ڕێڕەوی ئەو تێك نەکاتەوەو چەمکەکانی ئەو بەهەڵە دابنێت ئەو کەسەبەسەرلێشێواوو هەڵە دەزانێت، وەباشترینو پڕ بەرەکەت ترین ڕێنومایییەك ڕێگەوو ڕێبازی محمدﷺ، وەخراپترینو سەر لێشێواوترین کار تازە داهێنراوەکانو تازەگەرێتیە.

***** ***** *****

---

([١٠]) متفق عليه.

## بەشی شەشەم

### ڕونکردنەوەی پاڵ پشتەکانی بەندایەتی کردنی ڕاستەقینە

بەندایەتی کردن پاڵی بە سێ کۆڵکە یاپاڵپشت داوە، بەواتایەکی تر پشتی بەسێ کۆڵکەو پاڵپشت بەستوە کەبریتین لە: خۆشەویستی یاخۆش ویستن و ترس و ئومێدا داوا کردن. خوش ویستن لەگەڵ ملکەچی دا، وە ترس لەگەڵ ئومێدوخواست، گومانی تێدا نیە لەبەندایەتی کردندا دەبێ ئەم کاروبارانە بێنە دی و لەو بەندایەتی و پەرستشیەدا ڕەنگ بدەنەوە، خوای بالا دەست دەفەرموێت:﴿ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ ﴾ سورة المائـدة: (٥٤). هەروەها دەفەرموێ:﴿وَالَّذِينَ ءآمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ﴾ البقرة::١٦٥.(واتە: ئەوانەی بڕوادارن خوای خۆیان گەلێك خۆش دەوێت - وەرگێڕ-). هەروەها خوای گەورە لەوەسفی ڕەوان کراوان و پێغەمبەرانی خۆی دا دفەرموێت:﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾([96]).

وەهەندێ لەپێشینەکان گوتویانە: هەر کەسێك بەندایەتی بەتەنیا بەخوش ویستن(الحب) بۆ خوا بکات ئەوە زندیقە، وەهەر کەسێکیش بەندایەتی تەنیا بەهیواو تکاوە(الرجاء) بۆ خوای گەورە بکات ئەوە مەرجەئیە، وەهەر کەسێك بەندایەتی تەنیا بەترس لەسزای خوا بکات ئەوە حەروریە واتە لەخەوارجەکانە، وەهەر کەسێك بەخۆش ویستن و لێ ترسان و هیواو تکاوە(الحب والخـوف والرجـاء) بۆ خوای پەروەدگار بکات ئەوە ئەو کەسە بڕوادارێکی بەتەنها خوا پەرستە.

شێخی ئیسلام ئەمەی لەنامیلکەی(العبودیة)دا باس کردوە، هەروەها ئەویش گوتویەتی:( ئایینی خوا بریتیە لەبەندایەتی بۆ کردن و گوێ ڕایەڵی و ملکەچ و گەرد کەچی بۆ خوای گەورە، وەبەندایەتی بنەڕەتی وداوا کراو بریتیەلە: ملکەچی. دەگوترێ ڕێگایەکی خۆش

---

([96]) أ ـ سورة الأنبياء: (٩٠).

ب ـ واتە: ئەوانە کەمەبەستی زەکەریاو هاوسەرەکەی و یەحیای کوڕیەتی، کەسانێکی خێر خواو چاکەکار بون و هەمیشە پێشبڕکێ یان دەکرد بۆ چاکەکاری و ئیشی باش و خوا پەرستی و هەمیشە بەترسەوەو لەترسی دور کەوتنەوە لەسزای ئێمە بەئومێدو خواست و پر بەدڵ داوایان لێ دەکردین و لەبەرمان دەپاڕانەوەو ملکەچی و گەردن کەچیان بۆ ئێمە نیشان دەداو لێمان دەترسان. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٨٣٠.

کراوە، ئەگەر ڕێگایەك (مذَلّلاً) بێتملکەچی دەستی هەمو کەسێك واتە هەموخەڵکی پێدا ڕۆیشت بێت. بەڵام بەندایەتی کردنی فرمان پێکراو واتای ملکەچی، وواتای خۆش ویستن لەخۆ دەگرێت، کەئەو پەڕی ملکەچی بۆ خوای گەورە بەو پەڕی خۆش ویستنەوە لەخۆ دەگرێت، جاهەر کەسێك ملکەچ بێت بۆ مرۆڤێكو ڕقیشی لێ ببێتەوە ئەوە بەندە نیە بۆی، ئەگەر شتێکی خۆش بوێتو ملکەچی نەبێت ئەوە بەندایەتی کردن نیە بۆ ئەو، هەروەکو چۆن کەسێك کوڕەکەی یان برادەرەکەی خۆی خۆش دەوێت، لەبەر ئەمە بەتەنیا یەکێکیان بەس نیە بۆ بەندایەتی کردنی خوای بەرزو بالاَ دەست، بەڵکو پێویستە خوای گەورە لەهەمو شتێك خۆشەویستر بێت لەلای بەندە، وەدەبێ خوای گەورە لای بەندە لەهەمو شتێك گەورە ترو بەرز تر بێت، بەڵکو هیچ شتێکی تر جگە لەخوای پەروەردگار شایەنی خۆش ویستنو ملکەچی تەواو نیە...) تەواو[97].

ئەمە پایەو کۆڵکەکانی بەندایەتی کردنن، کەبلیمەت إبن القیم لەم ئونیەی خوارەوەدا کۆی کردونەوە:

وعبادةُ الرحمن غايةُ حُبِّهِ
مع ذُلِّ عابده هما قطبان

وعليهما فلكُ العبادة دائر
ما دار حتى قامت القُطبان

ومداره بالأمر أمر رسوله
لا بالهوى والنفس والشيطان

إبن القيم ــ رحمــه الله ـ خولو سورانەوەی بەندایەتی کردنی لەسەر خۆش ویستنو ملکەچی بۆ خۆشەویستەکەی ، کەبریتیە لە خوای گەورە ـ جــل جلالــە ـ بەسوڕانەوەی گەردون بەسەر هەردو جەمسەرەکانی دا چواندوە، وەباسی ئەوەشی کردوە کە جڵەوی هەڵسوڕاندن سوڕانەوەی چەرخی بەندایەتی بەفرمانی پێغەمبەرﷺو ئەو بەرنامەیە کەلەلایەن خواوە هێناویەتی، نەك بەگوێرەی هەواو ئارەزوەکان، ونەبەوەی کەنەفسو شەیتان فرمانی پێ دەکەن، نەخێر ئەمە بەندایەتی کردن نیە، ئەوەی پێغەمبەرﷺبۆی داڕشتوین واتە ئەو پەیامەیە کەلەلایەن خواوە بۆی هێناوین خولگەی بەندایەتی هەڵ دەسوڕێنێت، نەك داهێنانو تازەگەریو ئەفسانەو پڕوپوچەکانو هەواو ئارەزوەکانو چاو لێ کردنو لاسایی کردنەوەی باوكو باپیران.

---

([97]) بڕوانە: مجموعة التوحيد النجدية ص٥٤٩.

## ٣ـ بەتەنها خوا پەرستی ناوو سیفاتەکانی خوای گەورە

**ئەم بەشانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:**

**یەکەم: بەڵگەکانی سەلماندنی ناوە جوانو سیفەتە بەرزەکانی خوا لەقورئانو سوننەتو عەقڵ.**

**دووەم: مەنهەجی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەبارەی ناوو سیفاتەکانی خوای گەورە.**

**سێیەم: بەرپەرچ دانەوەی ئەوانەی ئینکاری ناوو سیفاتەکان دەکەنن یان ئینکاری هەندێکی دەکەن.**

**یەکەم: بەڵگەکانی سەلماندنی ناوە جوانو سیفەتە بەرزەکانی خوا لەقورئانو سوننەتو عەقڵ.**

أ. بەڵگەکانی قورئانو سوننەت:

پێشتر ئاماژەمان پێ کرد کەبەتەنها خوا پەرستی دەکرێت بەسی بەشەوە: بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی، وبەتەنها خوا پەرستی خوایەتی،و بەتەنها خوا پەرستی ناوە جوانو سیفەتە بەرزەکانی خوا، هەروەها کۆمەڵێك بەڵگەمان لەسەر هەردو جۆری یەکەمو دووەم: بەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی، وبەتەنها خوا پەرستی خوایەتی هێنانەوە. ئێستاش بەویستی خوا بەڵگەکانی جۆری سێ یەم دەهێنینەوە کەبریتیەلە بەتەنها خوا پەرستی لەناوو سیفاتەکانی خوادا.

ئێستاش شتێك لەبەڵگەکانی قورئانو سوننەت دەیخەینە بەر دیدی ڕۆشنی خوێنەرانی ئازیز:

**١ـ لەبەڵگەکان لەکتێبەکەی خوادا واتە لەقورئانی پیرۆزدا:** خوای بەرزو بالآ دەست دەفەرموێ:﴿ وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾([٩٨]).

([٩٨])أ ــ سورة الأعراف: (١٨٠).

ب ـ لەبەشەکانی ڕابردودا واتاکەیمان لێك داوەتەوە. وەرگێڕ.

خوای پاكو بێگەرد لەم ئایەتەدا ناوە جوانەكانی بۆ نەفسی خۆی چەسپاندوە، وەهەواڵی پێداوین كەئەو ناوانە جوانو پاكن، پێ یان لەبەر خوا بپاڕێنەوەو بیان كەن بەوەسیلە لەلای خوای گەورە، كەبڵێن: (یاالله، یارحمن، یارحیم، یاحي یاقیوم، یارب العالمین)وەپەیمانی بەو كەسەش داوە كەلەناوەكانی لادەداتو بڕوای پی نیە، واتا لەهەق لادەدەن، یاخود ئەو ناوانە لەخوای گەورە قەدەغە دەكاتو ڕەتیان دەكاتەوە كەهی خوا بن واتە بڕوای پێ نین، یان واتاكانیان دەگۆڕێت بۆ واتایەكی ناڕاست، یاخود دەیان كۆڕێت بۆ جۆرەكانی تری ئیلحادی ، خوای گەورە پەیمانیان پی دەدات كەلەسەر ئەو كردەوە خراپانەی خۆیان سزایان دەداتو تۆڵەیان لی دەكاتەوە.

خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ:﴿ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾(٩٩).:﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ۞ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (١٠٠). ئەم ئایەتانە بەڵگەی بەهێزن لەسەر سەلماندو چەسپاندنی ناوە جوانەكان بۆ خوای گەورە.

---

(٩٩) أ ـــ سورة طـــه: (٨)

ب ـ واتە: ئەو خوایەی كەهیچ خوای تر نین جگە لەو، بەهەق بپەرسترێن، ئەو خوایە خاوەنی ناوە جوانەكانە. وەرگێڕ.

(١٠٠) أ ـــ سورة الحشر (٢٢ـــ٢٤).

ب ـ واتە: لەخوا زیاتر هیچ خوای دیكە نین ئەو خوایە ئاگادارو زانایە لەونو لەئاشكرا كەلەم بونەوەرەدا هەیە و هیچ شتێكی لێ ون نابێت ئەو خوایەی كەبەبەزەیىو خاوەنی میهرەبانیەكی بێ كۆتاییە.ئەو خوایەی كەهیچ خوایەكی تر نین كەبەهەق بپەرسترێت جگە لەو پاشای پیرۆزی هەمو بونەوەرە، هەرچی لەم بونەوەرەدا هەیە هەموی هی ئەوەو بەسەر هەمو شتێكدا زاڵە وخوایەكە دورە لەهەمو عەیبو خەوشێك ئەو خوایەی كەئاشتی بەخشە بەبەندەكانىو هەرگیز ستەمیان لی ناكات، بڕوادارو ئاگادارە بەبڕوای بڕواداران‌و خاوەن دەسەلاتە، ودەسەلاتی بەسەر هەمو شتێكدا زاڵەو هیچ شتێكی لێ ون نابێتو ئاگای لەهەمو شتێك هەیە،بەرزو بڵندەو بەهێزە وهیچ شتێك ناتوانێت بەرامبەری بوەستێت، دورە لەهەمو عەیبو عارێكو ناتەواویەك كەلەبەندەكانی دا هەیە، پاكو بێگەردو دورە لەوەی كەهاوبەش پەیداكاران بۆی بڕیار دەدەن.ئەو خوایەی بەدیهێنەرو دروستكەرە و هەمو بونەوەری هێناوەتە دی، لەنەبونەوە هێناونیە بون، شێوەو شكڵ بەخشە، ئەو خوایەی كەخاوەنی ناوە جوانەكانیەتی هەرچی لەئاسمانەكان‌ولەزەوی دا هەن دەدان بەبڵندیو بەرزی ئەو خوایەدا دێنو بەپاكو بێگەردو بڵندی دادەنێن ئەو خودایە خاوەنی هێزو توانای بێ ئەندازەیە، زاناو داناو خاوەن حیكمەتە لەهەمو فرمانو كاروبارەكانیان. تەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٤٥٩. وەرگێڕ.

**٢ـ بەڵگەکانی سەلماندنی ناوەکانی خوای گەورە لەسونەتی پێغەمبەرﷺ:**

**ئەو فەرمودەیەی کەلە** أبو هريرة **وە ـ**رضي الله عنه**ـ ڕیوایەت کراوە کەپێغەمبەرﷺفەرمویەتی:** {إن لله تسعةً وتسعين إسماً، مئة إلاّ واحداً، من أحصاها دخل الجنة}(١٠١). **ناوەکانی خوا تەنیا لەم ژمارەیەدا کورت هەڵ نەهاتون‌و هەر ئەمەندە نین بەپێ ی ئەو بەڵگەیەی کە**عبدالله **کوڕی** مسعود رضي الله عنه**دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەرﷺفەرمویەتی:** {أسألكَ بكلّ اسم هو لكَ، سَمّيتَ به نفسك، أو أنزلته في كتابكَ، أو علّمتهُ أحداً من خَلْقك، أو استأثرت به في علم الغيب عندك، أن تجعلَ القرآن العظيمَ ربيع قلبي}(١٠٢). **هەر ناوێك لەناوەکانی خوا، سیفەتێك لەسیفەتەکانی خوا لەخۆ دەگرێت، زانیار واتای زانیاری‌و زانست دەگەیەنێت، ژیرو دانا نیاشانەی ژیری‌و دانایی دەگەیەنێت، بیسەرو بینا ئاماژە بەبیستن‌و بینین دەکەن، وە هەروەها هەمو ناوێك ئاماژە بەسیفەتێك لەسیفەتەکانی خوا دەکات یالەخۆ دەگرێت. خوای گەورە دەفەرموێت:**﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ۝ اللَّهُ الصَّمَدُ۝لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ۝وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾(١٠٣).

---

(١٠١) أ ــ متفق عليه.

ب ـ واتە: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەن، سەد کەم یەك هەر کەسێك بیان ژمێرێت‌و لەبەریان بکات‌و بیان خوێنێت‌و بڕوای پێ هەبێ ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە. وەرگێڕ.

(١٠٢) أ ـ رواه أحمد في المسند وصححه إبن حبان ـ ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەناوەکانی خوا تەنیا نەوەدو نۆ ناو نین‌و لەو ژمارەیەدا کورت هەڵ نەهاتون، لەوانەیە مەبەست لەم فەرمودەیە ئەوە بێت ـ خواش لەهەموا زانا ترە ـ کەئەم نەوەدو نۆ ناوە هەر کەسێك داوایان پێ لەخوا بکات‌و بیان کاتە وەسیلە‌و دوعایان پێ بکات و بەندایەتی خوایان پێ بکات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوەو ئەم تایبەتمەندیەکە(خاصيه) بۆ ئەو. واتە بەهەشت.

(١٠٣)أ ــ سورة الإخلاص: (١ ــ ٤).

ب ـ واتە: دەگێڕنەوە کەچەند کەسێك لەبت پەرستان‌و بێباوەڕان بەپێغەمبەریان ﷺگوت: باسی شکڵ‌و شێوەی خوامان بۆ بکە، تابزانین چۆنە؟! خوای پەروەردگاریش ئەم سورەتە پیرۆزەی ناردە خواو دەفەرموێ ئەی پێغەمبەرﷺپێ یان بڵێ: خوا تاك‌و تەنیایە‌و هیچ هاوبەش و هاوەڵی نین‌و بێ وێنە‌و هاوتایە، خوا ئەو زاتە گەورەیە کەبەدەسەڵات‌و بەتوانایە‌و هیچ گەورەو دەسەڵاتدارێك نیە خۆی لەقەرە بدات‌و لەو بەتوانا تر بێت. ئەو خوایەیە کەلەهەمو تەنگانە‌و لی قەومانێکدا تەنیا هاوار بۆ ئەو دەبرێت‌و تەنیا ڕو لەو دەکرێت‌و هەمو کەس پێویستیان بەئەوە‌و ئەو پێویستی بەکەس نیە‌و بێ نیازە. خوا هیچ منداڵێکی نیە‌و بەدورە لەمنداڵ بون‌و خێزانداری‌و هاوسەرگیریەتی لەکەس نەبوە‌و کەسیشی لێ نابێت، خوا لەئەزەلەوە هەر هەبوە. خوای گەورە هیچ وێنە‌و هاوتایەکی نیە، لەم بونەوەرەدا هیچ شتێك نیە شێوەی دروست بون‌و سیفات‌و ڕەوشتی لەخودا ناکات‌و

..نەسەوە ﷺ هاتوە کەگوتویەتی: { پیاوێک لەپشتیوانان پێش نوێژی لەمزگەوتی ..و دەکردن هەر جارێ کەسورەتێکی لەنوێژدا دەخوێند بە سورەتی (قل هو الله أحد) ..تی پێ دەکردو دەیخوێند تالێ دەبوەوە ئەمجار سورەتێکی تری لەگەڵدا دەخوێند ، ..هەمو ڕکاتەکاندا بەم شێوەی دەکرد، هەڤاڵەکانی پێ یان گوت:

.. بەو سورەتە دەست پێ دەکەیت، لەوە دەبیتەوەو دەست بەخوێندنی یەکێکی تر ..کەیت، یان هەر ئەو سورەتە بخوێنیت،یان لەو سورەتەبگەڕێو یەکێکی تر بخوێنە.

.. هەرگیز واز لەو سورەتە ناهێنم، ئەگەر پێتان خۆشە پێش نوێژیتان بۆ بکەم ئەوە ..ان دەکەم، وەئەگەر پێتان ناخۆش بێت ئەوە بۆتان ناکەم.

..ەڵام ئەوان سەیریان کرد ئەو لەهەموان باشترە، پێ یان خۆش نەبو لەو بەولاوە ..سی تر پێش نوێژیان بۆ بکات، کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە لایان ئەوەیان بۆ گێڕایەوە، ..یش فەرموی:

.. یافلانُ، مایمنعك أن تفعل مایأمرك به أصحابك؟ وما حملك علی لزوم هذه السورة في كل ..عة؟ } .

..ن ئەو سوەتەم خۆش دەوێت وحەزم لێ یە لەهەمو ڕکاتێکدا ئەو سورەتە بخوێنم.

{ حبُّكَ إیاها أدخلك الجنة } ([١٠٤]) .

وەلەعائشەوە - رضي الله عنها - هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ پیاوێکی کردە سەر دەستەی سریەیەك، ئەو پیاوە لەنوێژدا قورئانی بۆ هەڤاڵەکانی دەخوێندو بەسورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ ..حد) کۆتایی دەهێنا، کاتێ گەڕانەوە ئەمەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرموی: { سلوه: لأي شيء يفعل ذلك؟ } (واتە: لێ ی بپرسن: بۆچی وا دەکات؟- وەرگێڕ-

---

هاوشێوە نین، هەرچی بەبیرو خەیاڵان دابێت لەخوای گەورە بەدورە، خوای گەورە ئەم بونەوەرەو هەرچی وا تیایدایە لەنەبونەوە هێناونیە بون چۆن دەبێ لەناو دروستکراوەکانی خۆی دا هاو وێنەو هاوشێوەی هەبێت شتی وانیەو لەخوای پاکو بێگەرد دورە. وەرگێڕ

([١٠٤]) أ- رواه البخاري في صحيحه.

ب - ئەی فلان کەس، چی یە نامێڵێ کەبە قسەی هەڤاڵەکانت بکەیت؟ گوتی: من ئەو سورەتەم زۆر خۆش دەوێت بۆیە حەز دەکەم لەهەمو ڕکاتەکاندا بیخوێنم. پێغەمبەر فەرموی دەی خۆشەویستیت بۆ ئەو سورەتەو دەتباتە بەهەشتەوە. وەرگێڕ.

)، کاتێ لێ یان پرسی، گوتی: چونکە ئەم سورەتە هەمو سیفەکانی خوای گەورەو بەبەزەیی (الرحمن) لەخۆ دەگرێت، بۆیە من حەزم لێ یە ئەم سورەتە هەمیشە لەنوێژدا بخوێنم، ئەمجار پێغەمبەرﷺفەرموی: {أخبروه أن الله تعالى يحبه}([105]).(واتە: هەواڵی پێ بدەن کەخوای بەرزو بێ هاوتاش ئەوی خۆش دەوێت. وەرگێڕ).. هەروەها خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەخوا ڕوی هەیە، هەروەکو دەفەرموێت:﴿ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾([106]).( واتە ڕوی خوای بەرزو بەڕێزو بەتوانا هەر دەمێنێت، لەناو چونی بەسەردا نایەت. وەرگێڕ). هەروەها دو دەستی هەن، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴾([107]).(واتە: ئەو مرۆڤەی کەمەبەست ئادەمە من بەهەردو دەستی خۆم دروستم کردوە. وەرگێڕ). یاخود دەفەروێت:﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾([108]).( واتە: جولەکەکان دەیان گوت خوا هەردو دەستی بەستراونو ڕۆوزیمان ناداتێ، خوای گەورە دەفەرموێ: نەخێر بەڵکو دەستی خۆیان داخراوەو ڕەزیلو قرچۆکن، بەڵکو هەردو دەستی خوا هەمیشە کراوەیەو نازو بەخششی بێ ئەندازەیەو دەبەخشێ بەهەر کەسێك مەیلی لێ بێت. وەرگێڕ.)

خوای گەورە ڕازی دەبێتوخۆش ویستنی هەیەو تورە دەبێتو بێزارو ڕقی هەڵ دەستێت، ئەمانەو گەلێ سیفاتی تر کەخوای گەورە خۆی پێ وەسف کردوە، یاخود پێغەمبەرەکەیﷺوەسفی خوای پی کردوە.

**ب ـ بەلام بەڵگە عەقڵیەکانی سەلماندنی ناوو سیفاتەکانی کەشەریعەت ئاماژەی پێ کردون بریتین لەمانەی خوارەوە:**

١ـ ئەو هەمو بونەوەرە دروستکراوە گەورەیە بەهەمو جۆرو چەشنەکانیەوە، و بەجیاوازیەکانیەوە، سیستەمو ڕێکخستنەکانیەوە، لەڕاپەڕاندنو جێ بەجێ کردنی ئەرکوبەرژەوەندیەکانیانو، ڕۆیشتنیان لەسەر ئەو پلانو نەخشەی کەبۆیان کێشراوە،

([105])رواه البخاري في صحيحه.

([106])أـ سورة الرحمن (٢٧).

([107])أ ـ (سورة ص: ٧٥).

([108]) أـ سورة المائدة: (٦٤).

بەڵگەو نیشانەن لەسەر گەورەییو توانای بێ ئەندازەو لەبن نەهاتوی خوای گەورەو، بەڵگەی زانستو حیکمەتو، خواستو ویستو، ئارەزوەکانی خوای پەروەردگارن.

٢ـ بەخششو چاکەکانی خوای گەورەو، لادانی زیانو ڕزگار کردن لەتەنگو چەڵمەکان و ناخۆشیەکان، لابردنی خەمو پەژارەو ئەشکەنجەکان، ئەم شتانە هەمویان دەلالەت لەڕەحمەتو بەزەییو ڕێزو باشی بەخشندەیی خوا دەکەن.

٣ـ سزاو تۆڵە سەندن لەیاخی بوان، دەلالەت لەتورەیی خواو ڕق لێ بونەوەی خوا لەو یاخی بوانە دەکات.

٤ـ ڕێز گرتنو پاداشت دانەوەی گوێ ڕایەڵانی خوا، دەلالەت لەڕەزامەندیو ڕازی بونی خوا لەگوێ ڕایەڵانو خوشەویستی خوا بۆ ئەوان دەکات.

## بەشـی دوەم

## مەنهەجی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەناوو سیفاتەکانی خوادا

مەنهەجی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، لەپێشینەی پیاوچاکو شوێن کەوتوانیان بریتیەلە: چەسپاندنو سەلماندنی ناوەکانی خوای گەورەو سیفاتەکانی، هەروەکو چۆن لەقورئانو لەسوننەتدا هاتوە، وەمەنهەجەکەیان لەسەر ئەم کۆڵکەو پایانەی خوارەوە دامەزراوە یادادەمەزرێت:

١ـ پێشنەی پیاو چاك بڕوایان بەناوو سیفاتەکانی خوا هەیە هەروەك چۆن بەئاشکراو بەڕونی لەقورئانو سوننەتدا هاتوە، وەهەر بەو واتایانەی کەگوفتارو وشەکان دەیگەیەنن ، و هیچ دەستکاریو گۆڕانکاری لەواتای ڕواڵەتی وشەکاندا ناکەن واتە واتای ناوو سیفاتەکان ناگۆڕن، هەروەها لادانو گۆڕانکاری لەشوێنی وشەو زاراوەکانداو ناوەڕۆکەکانیان ناکەن.

٢ـ هەمیشە وێچواندن لەنێوان سیفاتەکانی خواو دروستکراوەکانی دا ڕەت دەکەنەوەو بەتوندی دژی دەوەستن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ سورة الشورى: (١١).

٣ـ لەسنورەکانی ئەو بەڵگەو نیشانانە دەرناچن کەلەقورئانو سوننەتدا هاتون( کورد گۆتەنی لەبەڕەکەی خۆیان پتر پێ ڕاناکێشن ـ وەرگێڕ ـ) لەسەلماندنو چەسپاندنو بڕوا

بـون بـەناوو سـيفەتەكانی خـوای بـەرزو بـێ هاوتـا، هەرچـی خـواو پێغەمبـەری خـوا سەلماندويانە، ئەوانيش بڕوايان تەنيا بەوانە هەيەو چەسپاندويانەو پـتری ناخەنـە سـەرو لێشـی كـەم ناكەنـەوە. هەرچـی خـواو پێغەمبەرەكـەی ڕەتـی بكەنـەوە ئـەوانيش ڕەتـی دەكەنەوە، وەهەرچيەكی خواو پێغەمبەرەكەی لێ ی بێ دەنگ بون ئەوانيش لێ ی بی دەنگن.

٤ـ وەبڕوايان وايە كەدەقـەكانی نـاوو سيفەتەكانی خـوا لەپوختـەترينو تۆكمـە ترين دەقانێكن كەواتاكانيان سادەو سانانو بەئاسانی دەزانرێتو لێك دەدرێنەوە، و لەو دەقو چەمكانە نين كەقابيلی وێچواندن(المتشابه) بن، هەروەها واتاكانيان ناگۆڕێنو سەرپشكيەتی واتانی ناوو سيفاتەكان بەكەس نادەن تەنيا بـە خـوای گـەورە نـەبێت، هـەروەكو هەنـدێ لەوانەی كەدرۆو خيانەتيان لەم بوارەدا بەزمانی پێشينەی پياو چاكەوە هـەڵ بەسـتوە، گوايە واتای نـاوو سـيفاتەكانی خوايـان گۆڕيـوەو دەيدەنـە پـاڵ ئـەوان، يـاخود ئەوانـەی كەلەمەنهـەجو بەرنامـەی پێشـينە حـاڵی نـينو تـێ ی نەگـەيون لەهەنـدێ لەنوسـەرانو دانەرانی هاوچەرخی سەردەم ئەم پڕو پاگەندەيان كردوە.

٥ـ سەرپشكی چۆنيەتی سيفاتەكان دەدەنە دەست خواو تەنيا بۆ خوای بـەرزو بـێ هاوتـای دەگێڕنەوە، هيچ توێژينەوەو لێكۆڵينەوەی تێدا ناكەنو هيچ دەم تێوەردانيچكی تێدا ناكەن.

## بەشی سێیەم:

**بەرپەرچ دانەوەی ئەو کەسەی کەئینکاری لەناوو سیفاتەکان، یان لەهەندێکیاندا دەکات:**

ئەوانەی ئینکاری لەناوو سیفاتەکانی خوادا دەکەن سێ پۆل‌و گروپن کەبریتین لە:

١ـ جەهمیەکان: کەبریتی بون لەشوێن کەوتوەکانی جهم کوڕی صفوان، ئەوانە ئینکاری هەمو ناوو سیفاتەکانیان بەگشتی دەکرد.

٢ـ موعتەزیلەکان: ئەوانەش شوێن کەوتەکانی واصل کوڕی عطاء بون، کەلە مەجلسی الحسن البصري جیا بونەوە، ئەوانە دەیان گوت: ناوەکانی خوا تەنیا چەند وشەو زاراوەیەکی ڕوتن و واتایان نیە، و سیفاتەکانیشیان هەمو ڕەت دەکردەوەو بڕوایان پێ نەبو.

٣ـ ئەشعەریەکان[109] وماتوریدیەکان[110]و شوێن کەوتانیان: ئەوانەش بڕوایان بە ناوەکان و هەندێ لەسیفاتەکان هەبو، وهەندێکشیان ڕەت دەکردەوە. ئەو گومانەی کەئەوانە هەمویان ڕێبازەکانیان لەسەر دامەزراند بو: بەگوتەی خۆیان گوایە ڕاکردنە لەوێچواندنی خوا بەدروستکراوەکانی خۆی، چونکە دروستکراوەکانیش بەهەندێ لەو ناوانە ناو دەبرێن، و بەو سیفاتانە وەسف دەکرێن، ئەو کاتە لەناوو لەسیفەتدا هاوبەش دەبن ئەمەش واتای هاوبەش بون لەحەقیقەتی هەردو لا دەگەیەنێت، وەئەمەش وێچواندنی دروستکراو بەدروستکەرەکەی خۆی دەخوازێت لەدیدی ئەوانەوە، ئەمەش وای لێ کردن کەڕو بەڕوی دو شت ببنەوە:

أـ یان گۆڕینی دەقەکانی ناوو سیفەتەکان لەڕواڵەتی خۆیان، وەك گۆڕینی ڕو(الوجه) بەخود (الذات)، ودەست بەنازونیعمەت.

ب ـ یان گێڕانەوەی دەسەڵاتی واتای ئەو دەقانە بۆ خوای گەورەو تەنیا خوای گەورە واتاکانی دەزانێت، بەوەی کەدەڵێن: خوای گەورە لەهەمو کەسێك زانا ترە بەواتاو مەبەستەکانیان ، لەگەڵ بیروباوەڕیان بەوەی کەواتاو مەبەستەکانیان بەڕواڵەتەکانیان نیە

---

([109]).بریتی بون لەشوێن کەوتوانی أبي الحسن الأشعري ـ پێش گەڕانەوەی بۆ ڕێبازی ئەهلی سوننەت ـ بەڵام ئەوان نەگەڕانەوە بۆ ئەو ڕێگەیەی کەئەو بۆی گەڕایەوەو پەشیمان بوەوە، ئێستا دانە پاڵی ئەوان بۆ ئەو ڕاست نیە.

([110]) ئەوانەش شوێن کەوتوانی أبي منصور الماتوريدي بون.

، (واتە: واتاو مەبەستی ڕواڵەتی ناوو سیفەتەکان مەبەستی ڕاستەقینە نابەخشن بەڵکو تەنیا خوای گەورە خۆی دەزانێت ـ وەرگێڕ ـ).

یەکەمین کەسێك کەئینکاری کردنی ناوو سیفاتەکانیان لێ بیستراوو زانرا: هەندێ لەهاوبەش پەیداکارانی عەرەب بون، ئەوانەی کەخوای گەورە ئەم فەرمایشتەی خۆی لەڕودا ناردە خوار کەدەفەرموێت:﴿ كَذَلِكَ أَرْسَلْنَاكَ فِي أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَا أُمَمٌ لِّتَتْلُوَ عَلَيْهِمُ الَّذِيَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ ﴾([111]).

وەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بریتیە لەوەی: کەقوڕەیش کاتێ گوێ یان لەپێغەمبەرﷺبو باسی خوای ڕەحمانی دەکرد، ئینکاریان کردو بڕوایان نەبو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ ناردنە خوار:﴿ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ ﴾. إبن جرير گوتویەتی: ئەمە لەپەیمانو سولحی حودەیبیەدا بو، کاتێ نوسەری پەیمانەکە کێشەی سولحەکەی نوسیەوە کەلەنێوان قوڕیشیەکانو لەنێوان پێغەمبەرداﷺڕوی داو نوسی:﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ قوڕیشیەکان گوتیان: بەڵام(الرَّحْمَنِ)، ئێمە ئەوە ناناسین.

هەروەها إبن جرير لە إبن عباسەوە ڕیوایەتی کردوەکە: ڕەسولی خواﷺلەکڕنوش بردندا دەی فەرمو:{يارحمن يارحيم} هاوبەش دانەران گوتیان: ئەوە وا دەزانێ لەتەنیا کەسێك پاڕاوەتەوەو داوای لەیەك کەس کردوە، لەکاتێکدا ئەو داوا لەدو کەس دەکات. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوار:﴿قُلِ ادْعُواْ اللّهَ أَوِ ادْعُواْ الرَّحْمَنَ أَيًّا مَّا تَدْعُواْ فَلَهُ الأَسْمَاء الْحُسْنَى ﴾([112]).

---

([111])أ ـ سورە الرعد: (٣٠).

ب ـ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺهەروەکو چۆن لەپێش تۆدا چەندان پێغەمبەری ترمان ناردون بۆ لای گەلەکانیان هەر ئاواش تۆمان ناردوە بۆ لای گەلەکەی خۆت کەچەندان گەلو قەومی ترمان لەپێش ئەواندا هاتونو پێغەمبەرانمان هەر لەخۆیان بۆ ناردون بۆ ئەوەی ئەم قورئانەو ئەم پەیامەیان بۆ بخوێنیتەوەو پێ یان ڕا بگەیەنیت کە بەهۆی هاوبەشو هاو وێنە پەیدا کردنەوە بڕوایان بە خوای ڕەحمانو ڕەحیم نیەو نەماوە. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢٦٢٤.

([112])أ ـ سورة الإسراء: (١١٠).

ب ـ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەخەڵکی بڵێ: هەمیشە ناوی خوا بەبەرزو بڵند بەرنو بێنن و بانگی بکەن ج بەناوی(الله)و ج بەناوی(رحمان) بێت جیاوازی نیە هەردوکیان هەر ناوی خوانو یەکێکن لەناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە، چونکە ئێوە بەهەر ناوێك بەهەر سیفەتێك لەناوە جوانو سیفەتە بەرزەکانی خوا بانگ بکەنو لەبەری بپاڕێنەوەو داوای

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ ﴾[113].

ئەو هاوبەش پەیداکارانە پێشینەی جەهمیەکان، وموعتەزیلەکانو ئەشعەریەکان بون، ئەوانەی کە ئەو ناوو سیفاتانەی کەخوای گەورە بۆ خۆی داناونو چەسپاندونی، یاپێغەمبەرەکەیﷺ بۆ خوای پەروەردگاری چەسپاندوە ڕەتیان کردەوەو بڕوایان پێ نەبوو نەفیان کردن، بەڕاستی خراپترینو قێزەون تریننو بێزراو ترین پێشینەیەکن(السلف) بۆ خراپترینو قێزون ترین پاشینەیەك(الخلف).

**بەرپەرچ دانەوەیان لەم چەند ڕوانەی خوارەوە:**

ڕوی یەکەم: خوای پاكو بێگەردو بەرزو بێ هاوتا ناوە پیرۆزو سیفەتە جوانەکانی بۆ خۆی بڕیار داونو چەسپاندونیو گۆڕانیان بەسەردا نایە، هەروەها پێغەمبەرەکەشیﷺ بۆ خوای گەورەی چەسپاندونو گۆڕانیان بەسەردا نایەت، جانەفی کردنیان یان نەفی کردنی هەندێك لەو ناوو سیفەتانەو داڕنینیان لەخوای گەورە واتا نەفی کردنو داڕنینی ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی بۆ خوای گەورەیان چەسپاندوە، بێگومانە کەئەمەش دوژمنایەتی کردنو پێ لەسنور تێ پەڕاندنە بەرامبەر بەخواو بەپێغەمبەریﷺخوا.

ڕوی دوەم: هیچ پێویست ناکات ئەم سیفاتانەی خوای گەورە بونیان لەدروستکراوەکانی خوادا هەبێت، یاخود هەندێ لەدروستکراوەکانی خوای گەورە بەو ناوانە ناوبنرێن کەلەگەڵ ناوو سیفاتەکانی خوادا پێك دەچنو هاو شێوەنو لەنێوان خوای پەروەردگارو دروستکراوەکانی هاوبەش بن یان وەك یەك بن، خوای پاكو بێگەرد ناوو سیفاتی پیرۆزی تایبەتی خۆی هەنو دروست نیە ئەو ناوو سیفەتانە لە دروستکراوەکانی بنرێنو پێ ی بانگ بکرێن، هەروەها دروستکراوەکانی خوای پەروەردگاریش ناوو

---

لی بکەن هەر دروستە وهیچ جیاوازیەکیان نیە خوای گەورە گەلێك ناوو سیفەتی بەرزو پیرۆزی هەیە. وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب2ل733.

([113])أ ـــ سورة الفرقان: (٦٠).

ب ـ واتە: ئەگەر بەو بت پەرستانەو بەو بێ باوەڕانە بگوترێت کڕنوش بۆ خوای بەبەزەییو میهرەبان(الرحمن) بەرن ، دەڵێن: ڕەحمان کێ یەو چی یە؟ تاکڕونوشی بۆ بەرین، ئەی محمدﷺ تۆ دەتەوێت کڕنوش بۆ کەسێك بەرین کەنایناسینو نازانین کێ یە؟. وەرگێڕ.

سیفاتی تایبەتی خۆیان هەیە، دەی هەروەکو خوای گەورەو پاکو بێگەرد خود واتە زاتی تایبەتی خۆی هەیەو ناکرێ بەخود واتە زاتی دروستکراوەکانی خۆی بچوێندرێت. ناوو سیفاتی تایبەتی خۆی هەیەو بەناوو سیفاتەکانی دروستکراوەکانی ناچوێندرێت، وەدەبێ ئەوەش بزانین کەهاوبەش بونی ناوێكو واتای گشتی هاوبەش بون لەڕاستەقینە(الحقيقة)دا ناگەیەنێتو پێویست(واجب) ناکات. خوای گەورە خۆی بە(زانا یازانیار ـ عليماً، هێدی وهێمنو لەسەرخۆ ـ حليماً) ناو ناوە، وە هەندێ لەبەندەکانیشی بە(زانیار ـ عليماً) ناو نراوە، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴾([114]). واتە ئیسحاق، وەیەکێکی تری بەحەلیم ناو ناوەکەدەفەرموێ:﴿ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾([115]). واتە: ئیسماعیل. وەزانیار وەك زانیاریو زانایيو دانایی خوا نیە، هەروەها ئەم میهرەبانیە وەك میرەبانیەتی خوا نیە، هەروەها خوای گەورە ناوی خۆ ناوە کەدەفەرموێت:﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾([116]). هەروەها هەندێ لەبەندەکانی خوا بەم ناوە ناو نراون واتە: بە(سميعاً بصيراً)، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾([117]).( واتە: ئێمە ئادەمیزادمان لەدلۆپە ئاوێکی تێکەڵاو دروست کردوە، دوایش دەیخەینە ژێر تاقی کردنەوە، هەروەها بیسەرو بینامان کردوە واتە ئامرازی بیستنو بینینمان بۆ دروست کردوە کەدو شتی زۆر پێویستن بۆ نەك هەر مرۆڤ بەڵکو بۆ هەمو گیان لەبەرێك. وەرگێر). وەنەبیستنی خوا وەك بیستنی ئێمەو نەبینینی خوا وەك بینینی ئێمەیە.

هەروەها خوای گەورە خۆی بەبەزەییو میهرەبانو دڵسۆز ناو بردوەن هەروەکو دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ

---

([114])أ ـــ سورة الذاريات: (٢٨).

ب ـ واتە: کاتێ فریشتەکان لەماڵی ئیبراهیم بون، ئیبراهیم لێ یان ترسا کاتێ دەستیان بۆ خوردنەکە نەبرد، فریشتەکان گوتیان: مەترسە ئێمە فریشتەی خواینو مزگێنی کوڕێکی زاناو زانیاریان پێ دا کەخوا پێ یان دەبەخشێت کەناوی إسحاقە.وەرگێر.

([115]) أ ـــ سورة الصافات: (١٠١).

ب ـ واتە: فریشتەکان مزگێنی حەلیم یان پێدا. کەمەبەستی لەئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە. وەرگێر.

([116])أ ـــ سورة النساء: (٥٨).

ب ـ واتە: خوای گەورە بیسەرو بینایە. وەرگێر.

([117]) أ ـــ سورة الإنسان: (٢).

رَّحِيمٌ﴾([118]).( واتە: ئەی خەڵكینە ! ئێوە پێغەمبەرێكتان لەخۆتان بۆ هاتوە، بۆ ئەوەی پەیامی خواتان پێ ڕابگەیەنێتو زۆر بەخەم ئێوەوەیەو لەدو ڕوییو خراپەكاری ئێوە زۆر دڵ تەنگ دەبێتو ئازاری دەدات، بەڵێ زۆر بەپەرۆشەوەیە بۆ ئێوەو خەمی گەورەی ئەوەیە ئێوە بێنە سەر ڕێگای ڕاستو خوا پەرستیو بڕوا بهێنن، زۆر دڵ نەرمو بەبەزەییو میهرەبانە لەگەڵ بڕواداران. وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب١ل٥١٠). وەئەم میرەبانیو بەبەزەییەی ئێمە وەك میهرەبانیو دڵسۆزیو نەرمو نیانی خوا نیە هەرگیز وەك ئەو نابێت([119]).

هەروەها خوای گەورە خۆی بەچەند سیفاتێك وەسف كردوەو وە بەندەكانیشی بەهەمان سیفاتی هاوشێوە وەسف كردوە، وەك دەفەرموێت:﴿ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ ﴾([120]). ئەوەتە خۆی بەسیفەتی زانستو زانیاری وەسف كردوە، هەروەها بەندەكەشی بەزانستو زانیاری وەسف كردوە، هەروەكو دەفەرموێت:﴿ وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ سورة الإسراء: (٨٥).هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ ﴾ سورة

---

([118])أ ــ سورة التوبة: (١٢٨).

([119]) ئەو ناوو سیفاتانەی كەئێمەی مرۆڤ هەمانە وەك ناوو سیفاتەكانی خوا نیە، بۆنمونە: خوای گەورە بیسەرە، ئێمەش بیسەرین بەڵام ئایا بیستنی ئێمە وەك بیستنی خوا وایە؟ بێگومان نەخێر، بیستنی ئێمە سنور دارە ئێمە لەیەك كاتدا ناتوانین دەنگو بانگی هەمو جیهان ببیستن، ئێمە تەنیا دەتوانین ئەوەی بەگوێ ببیستن كەلێمانەوە نزیكەو دەنگی ئەو خاوەنی ئەو دەنگە بمان گاتێ، بەڵام بیستنی خوا ڕەهایە(مگلق)ە خوای گەورە لەیەك كاتدا لەم بونەوەرەدا هەمو دروستكراوەكانی بانگی لێ بكەن هەمویان دەبیستێ، هەروەها بینینی ئێمە وەك بینینی خوا نیە، بینینی ئێمە سنور دارە ئەوەی لەبەر چاومان نەبێت نای بینین، بەڵام بینینی خوا ڕەهایە(مگلق) پەردەو دیوارو بەربەستی بۆ نیە بەزانستو زانیاری خۆی هەمو شتێك لەم بونەوەرەدا دەبینێت، ئێمە ناتوانین لەژێر چینەكانی زەویو لەدڵی زەوی دا گیان لەبەرێكی ورد(دقیق) ببینین بەڵام خوای گەورە بەزانستی خۆی ببینێت بەڵام ئێمە نایبینین، تەنیا ئەوە نەبێت كەلەبەر چاومانە، وەئەوی گەردیلەی زۆر زۆر بچوكە ئێمە زەڕە بین بەكار بهێنین ئەمجاریش بەباشی نایبینین بەڵام خوای گەورە ونو ئاشكرا بەزانستی خۆی دەیبینێت.

هەروەها كەبەمرۆڤ دەگوترێت بەبەزەییو نەرمو نیانو دڵ نەرمە ئەوە واتای ئەوە نیە ئەو بەزەییو نەرمییو بەخشندەییەی وەك هی خوای گەورە وابێت بەڵكو ئەو سیفەتەی ئێمە سنور دارەو هەرگیز لەهی خوای گەورە ناچێتو ئەویش هەر بەخشندەوو نەرمیو بەزەیی خوایە كەبەهەندێ لەدروستكراوەكانی خۆی دەبەخشێت، وەڵێ بەزەییو ڕەحمو شەفەقەتی خواو بەخشندەیی خوا بێ سنورو ڕەهایە و كەس لەو ناچێتو كەس وەك ئەو نیە. وەرگێڕ.

([120])أ ــ سورة البقرة: (٢٥٥).

ب ـ واتە:كەس نیە ئابڵوقەی زانستو زانیاری خوا بداتو پەی بەزانیاریەكانی خوا بەرێتو هیچێكی لێ بزانێت مەگەر ئەوەی بۆ خۆی پێ ی خۆش بێتو ویستی لەسەر بێت. وەرگێڕ.

القصص: (٨٠). وەخوای گەورە خۆی بەبەهێز وەسف کردوە، هەروەك دەفەرموێت:﴿ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ سورة الحج: (٤٠).:﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾ سورة الذاريات: (٥٨). هەروەها بەندەکانیشی بەبەهێزی وەسف کردوە هەروەکو دەفەرموێت : ﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ﴾[١٢١]. هەروەها گەلێك سیفەتی تر.

ئەوەی ڕوون و ئاشکراوڕاست و دروستە ئەوەیە کەناوەکانی خواو سیفاتەکانی تایبەت و شایستەن بەخۆی، وەناوی دروستکراوەکانیشی تایبەت و شایستەن بەخۆیان، هیچ پیویست نیە کەهاوبەشی هەبێت لەناودا واتاهاوبەشی بون لەناوەڕۆك و حەقیقەتدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەهیچ هاوچونیەك و چون یەکیەك لەنێوان هەردو ناونراوەکان(المُسَمَّيْن)و هەردو وەسف کراوەکاندا(الموصوفين) نیە، ئەمەش دیارو ئاشکراو ڕواڵەتی واتاو مەبەستەکانە، سوپاس بۆ خوای گەورە.

ڕوی سێ یەم: ئەوەی کە سیفاتی تەواو(کمال)ی نیە، بەهیچ شێوەیەك بەکەڵکی ئەوە نایەت کەبکرێتە خوا(إلهاً)، هەر لەبەر ئەمە بو ئیبراهیم بەباوکی گوت:﴿ لِمَ تَعْبُدُ مَا لاَ يَسْمَعُ ولاَ يُبْصِرُ ﴾ سورة مريم: (٤٢).(واتە: بۆچی شتانێك دەپەرستن کەنەهیچ شتێك دەبیستن و نەهیچ دەبینن. وەرگێڕ). هەروەها خوای گەورە لەبەرپەرچ دانەوەی ئەوانەی کەگوێرەکەیان دەپەرست دەفەرموێت:﴿أَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّهُ لاَ يُكَلِّمُهُمْ وَلاَ يَهْدِيهِمْ سَبِيلاً ﴾[١٢٢].( واتە: ئایا نابینن ئەو گوێرەکەیەی کەدەی پەرستن نەدەتوانێت قسەیان لەگەڵ دا بکات

([١٢١])أ ـــ سورة الروم: (٥٤).

ب ـ واتە: گەورەیی و دەسەلات بۆ ئەو خوایەی کە ئێوەی لەبی هێزی دروست کردوە واتەلە دڵۆپە ئاوی بێ هێزی باوك و هێلکۆکەی دایك دروست کردوە، هەروەها لەبێ هێزیتان لەناو سکی دایکتان و ئەمجار قۆناغی بێ هێزی منداڵی و ساوایی، دوایی وردە وردە گەورە دەبن و گەشە دەکەن و گەنج دەبن و دەبنە کەسێکی بەهێز ، ئەمجار کەگەیشتنە سەر لوتکەی گردو قوچکەی ژیان سەرەو شۆڕ دەبنەوە بەرو خوار بۆ تەختایی ژیان بەرەو بێ هێزی دەڕۆنەوەو پیر دەبن و جەستەتان دادڕزێ و بەرەو مردن دەڕۆن و دەمرن. وەرگێڕ.

([١٢٢])أ ـــ سورة الأعراف: (١٤٨) .

نەدەتوانێت ڕێنومایی‌و هیدایەتیان بدات و نەدەتوانێت سودیان پێ بگەیەنێت‌و نەدەتوانێت زیانیان لێ لابدات‌و نەدەتوانێت تەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشیان لەسەر لابدات. وەرگێڕ).

ڕوی چوارەم: چەسپاندن‌و سەلماندنی سیفاتەکان تەواویەو نەفی‌و دارنینیان ناتەواویە، دەی ئەو کەسەی یائەو شتەی کەهیچ سیفاتی نین، یان هەر نیەو یان ناتەواوە، خوای گەورە پاک‌و بێگەردەو لەوە بەدورە.

ڕوی پێنجەم: هەڵ گێڕانەوەو گۆڕینی سیفاتەکان لەڕواڵەت‌و ڕوی ڕاستەقینەی خۆیان هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو بونی نیە،و پوچەڵ‌و باتڵە، دەی سەرپشکیەتی(تفـويض) واتای ئەوە دەگەیەنێ کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بەشتێك دەمان دوێنێت کەلەواتاکەی ناگەین، کەچی ئەوەتە فرمانمان پێ دەکات کەبەناوەکانی خوا داوا لەخوا بکەین‌و لەبەری بپاڕێینەوە، دەی کەوابێ چۆن دەتوانین بەشتێك داوای لێ بکەین کەلەواتاکەی تێ ناگەین، هەروەها خوای گەورە فرمانمان پی دەکات کەلەقورئان ورد ببینەوەو واتاو مەبەست‌و حوکمەکانی تی بگەین‌و لێ ی شارەزا ببین، ئەی چۆن فرمانمان پێ دەکات لەشتێك ورد ببینەوەو لێ ی بکۆڵینەوە کەواتاکەی تی ناگەین؟

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەگومانی تێدا نیە دەبێ ناوو سیفاتەکانی خوا بەو شێوەیەو بەو ڕوە بچەسپێنین کەلایەق‌و شایستەیە بەخۆی، لەگەڵ نەفی کردن‌و وەلا نانی وێچونی خوا بەدروستکراوەکانی‌و بەبونەوەر، هەروەکو خۆی دەفەرموێت: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ سورة الشورى: (١١) . (واتە: هیچ شتێك لەوێنەی خوا دا نیەو خوای گەورە لەهیچ ناچێت‌و بیسەرو بینایە واتە دەبیستێت‌و دەش بیستێ. وەرگێڕ).

خوای گەورە وێنا کردن‌و وێچواندنی شتەکانی لەنەفسی قەدەغە کردوە، وەسیفاتی بیستن‌و بینینی بۆ خۆی بڕیار داوەو بۆ خۆی چەسپاندون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسەلماندن‌و چەسپاندنی سیفاتەکان وێچواندن‌و چونیەکی هەڵ ناگرێت‌و لێ ی بەدورە، وەبەڵگەشن لەسەر واجبیەتی سەلماندن‌و جێگیر کردنی سیفاتەکان وێڕای وەلا نان‌و نەفی کردنی وێچواندن(المشـابهة)، وەئەمەش واتای دەق‌و ناوەڕۆکی قسەو بیرو ڕای ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتە لەنەفی‌و لەسەلماندنی ناوو سیفاتەکان: سەلماندن‌و جێگیر کردن بەبێ نواندن‌و وێنا کردن(تمثيل) و پاك ڕاگرتن(تنزيه) بەبێ پەك خستن‌ولەکار خستن(بلاتعطيل).

****** ***** *****

## دەرگـــای سێ یەم

## ڕونکردنەوەی هاوبەش پەیدا کردنو لادان(الإنحراف) لەژیانی مرۆڤایەتی دا

## چاو پیدا خشاندنێکی مێژویی دەربارە کوفرو ئیلحادیو هاوبەش دانانو دو ڕویی

وەئەم لقانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: پێ هەڵخلیسکانو لادان لەژیانی گەلانی جیهاندا.

بەشی دوەم: هاوبەش دانان ـ پێناسەو جۆرەکانی.

بەشی سێ یەم: کوفر ـ پێناسەو جۆرەکانی.

بەشی چوارەم: دو ڕویی ـ پێناسەو جۆرەکانی.

بەشی پێنجەم: ڕونکردنەوەی ڕاستەقینەی هەر یەکێ لە: نەفامیو نەزانیو ناحاڵی بون (الجاهلية) ـ دەرچون لەدینو خراپەکاری(الفسق) ـ گومڕاییو سەرلێشێواوی(الضلال) ـ هەڵ گەڕانەوە لەدین (الردة): بەشەکانی، حوکمەکانی.

## بەشی یەکەم

## پێ هەڵخلیسکان و لادان لەژیانی گەلانی جیهاندا.

خوای گەورە دروستکراوەکان واتە بونەوەری بۆ بەندایەتی کردنی خۆی دروست کردون، ووەهەرچیەکی پێویستیان هەیە لەژیانیاندا لەرۆزی و پێداویستیەکانی ژیانیات بۆ ئامادە کردون و خستونیە بەردەستیان، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ۝ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ۝ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾ سورة الذاريات (٥٦-٥٨).

وەنەفسی مرۆڤ هەر لەفیترەتی خۆی دا وایە ئەگەر لێ ی بگەڕێن، بۆ خۆی دان بە خوایەتی خوای گەورە دا دێنێت و بروای پی ی هەیەو، خوای خۆی خۆش دەوێت، دەی پەرستێت و بەندایەتی بۆ دەکات و هیچ هاوبەشیەکی بۆ دانانێت. بەڵام کاتێک شەیاتینیەکانی جنۆکەو مرۆڤەکان خوتخوتەیان دەخەنە دڵ و کارەکانیان بۆ دەرازێننەوە لەو رێڕەوە خوا پەرستی و بەندایەتی کردنە بۆ خوای گەورە لای دەدەن و پێ یان هەڵ دەخلیسکێنن و تێك دەچن و بەرەو گومرایی و سەر لێشێواوی دەڕۆن و رێگەیان لی گوم دەبێت، بەوەی کەسروش بۆ یەکتری دەبەن بەقسەی لوس و زاق و بریقی هەڵفریوێنەرانە بەندەکانی خوا هەڵ دەفرێوێنن و لەرێگەی خوا پەرستی لایان دەدەن. دەنا هەر بەفیترەت بەتەنها خواپەرستی پشت ئەستورە (مركوز بالفطرة)و خوای گەورە لەسەر فیترەتی ئیسلام دروستی کردون، بەڵام هاوبەش دانان(الشرك) کارێکی نامۆو لەپڕو لەدوایی دا سەری هەڵداوەو شتێکی دەرەکی وهاوردەیە بۆ ناو بازنەی تەنها خوا پەرستی. خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴾([123]).

---

([123])أ ــ سورة الروم: (٣٠).

ب ـ واتە:خوای گەورە ڕو دەکاتە پێغەمبەرﷺو پێ ی دەوفەرموێت: ڕو بکەرە ئایینەکەت و بەردەوام و پی دامەزرا بەو لەهەمو ڕێگەو ڕێبازێکی تر ڕو وەرگێڕەو لێ ی دور بکەوەرە، ئەو ئایینە پاك و نەرم و نیان و میانە ڕەوو لێ بوردەیە ئایینێکی ڕاست و فیترەتە کەخوای گەورە لەدڵی بەندەکانی خۆی چەقاندوەو لەسەرەتاوە لەسەر ئەم ئایینە فیترەتە دروستی کردون، هەر شتێکیش کەخوای گەورە دروستی کرد بێت و هێنا بێتیە دی ئیدی تازە گۆڕانی بەسەردا نایە. تەفسیری گوڵشەن ب٢ل١٠٤٤. وەرگێڕ.

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {کل مولود یولد علی الفطرة فأبواه یهودانه، وینصرانه، أو یمجسانه}[١٢٤]. ئادەمیزادەکان لەبنەڕەتدا لەسەر تەنها خوا پەرستین و لەسەر ئایینی فیترەتن.

وەئایینی ئیسلام، ئەو ئایینە بو کەئیبراهیم ـ علیه السلام ـ لەسەری بو، هەروەها ئەوانەشی کەلەوەچەکانی ئەو هاتون بەدرێژایی سەدەکان هەمویان هەر لەسەر ئەم ئایینی ئیسلامە بون، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾[١٢٥]..

وەبۆ یەکەمجار هاوبەش دانان و لادان لەلەبیرو باوەڕی ڕاستەقینە لەناو گەلی نوح دا ڕوی داو سەری هەڵدا، نوح یەکەمین پێغەمبەرو ڕەوانەکراوە کەبۆ بەشەریەت نێردراوە دوای ڕودانی هاوبەش دانان لەناو ئادەمیزادەکاندا:﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ ﴾[١٢٦].

إبن عباس گوتویەتی:(لەنێوان ئادەم و نوح دا ـ علیهما السلام ـ دە سەدەیەو هەر هەمویان لەسەر ئایینی ئیسلام بون، (واتە هەزار ساڵی ڕەبەق خەڵکی لەسەر تەنها خوا پەرستی بون و بەپاکی و پوختی خوایان دەپەرست و هیچ پیس و پۆخڵیەکی هاوبەش دانان و بێ باوەڕی و ملهوڕی نەبو، هەمو ئادەمیزادەکان لەسەر خوا پەرستی پاک و بێ غەڵ و غەش بون، خوا ناسی کاکڵە و بێ خڵتە بون، دوایی شەیتان فریوی دان و بەهۆی

---

([١٢٤])أـ في الصحیحین من حدیث أبي هریرة.

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا لێك داوەتەوە. وەرگێڕ.

([١٢٥]) أـ سورة البقرة: (٢١٣).

ب ـ واتە: خەڵکی یان ئادەمیزادەکان هەر هەمویان لەسەر یەك تاکە بیرو باوەڕو ئایین بون کەئایینی ئیسلامە، کەمەبەستی سەرەتای ئادەمیزادە، بەڵام کەزۆر بون و چەندان گەل و هۆزو تیرەو وەچەیان لی کەوتنەوە شەیتان هەڵی فریواندن ولەڕێگەی ڕاستی خوایی و ئەم ئایینی ئیسلامە لای دان و گومڕاو سەرلێشێواوی کردن بۆیە خوای گەورە بەپێ ی کات و زەمینەو پێداویستیەکانی مرۆڤەکان پێغەمبەران و ڕەوانەکراوەکانی خۆی بۆ دەناردن و بۆ هەر کامێکیان کتێب و بەرنامەو کەتەلۆکی ژیانی بۆ دەناردنە خوار بۆ ئەوەی بەپێ ی ئەو بەرنامەیە ژیان بەرنە سەرو بگەڕێنەوە سەر ئایینی خواو ڕێگەی ڕاستی خوایی، بەترساندن لەسزای خواو بەدۆزەخ و بەمزگێنی دان بەپاداشت دانەوەو بەچونە ناو بەهەشتی خوایی. وەرگێڕ.

([١٢٦])أـ سورة النساء:(١٦٣).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺئێمە سروش(وحی)یمان بۆ تۆ ناردوە هەروەکو چۆن بۆ نوح و بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کەلەدوای ئەو هاتون. وەرگێڕ.

مردنی پێنج پیاوچاکو وەلیەکانی خوا (یەعوقو یەغوثو نەسرو ودو صواع) کە لە سەدەی یەکەمدا وێنەو پەیکەری پێ تاشینو پێ ی گوتن لەماڵو لەشوێنی پەرستگاکانتاندا دایان بنێنو هەڵیان بهاوەسنو تەماشایان بکەنو بەندایەتی بۆ خوا بکەن، بەڵام نەچن ئەوانە بپەرستنو تەنیا خوا بپەرستن چونکە ئەوانە زانا بونو ئایینتان لەوان وەرگرتوەو لێ یانەوە فێر بون. شەیتانێ فێڵبازێکی زۆر زیرەك بەئارامو خۆراگرە سەدان ساڵ خۆی ڕاگرت هەتا ئەو بەرانە(الجيل) ڕۆیشتنو بەرەی تازە بەسەردا هاتنو ئەو بەرەیە نەمانو مردن ئەمجار بۆ بەرەی دوەم بەرەکانی پێش خۆیان بیر چوەوەو شەیتان ئەمجار کەوتە سەر سکەی مەبەستی ڕاستەقینەی خۆیو فێڵی لێ کردنو گوتی: بابو باپیری ئێوە وایان نەدەکرد بەڵکو ئەو پێنج پیاوچاکانەیان دەپەرستو کڕنوشیان بۆ دەبردن ئێوەش کڕنوشیان بۆ بەرن ئەوانە پەرستراوانی ئێوەنو لەخواتان نزیك دەکەنەوە ئیدی بەم شێوەیە هەڵی فریواندنو فێری بت پەرستیو پەرستنی غەیری خوای کردنو بەم جۆرە بت پەرستی لەناو ئادەمیزادەکاندا سەری هەڵ داو یەکەمین بت پەرستی لەسەردەمی نوح دا سەری هەڵدا، ئەوە بو دوای بڵاو بونەوەو تەشەنە کردنی بت پەرستی وگومڕایی و سەر لێشێواوی خوای گەورە نوحی بۆ ڕەوانە کردن، نوح نۆ سەدو پەنجا ساڵ بانگی کردن بۆ تەنها خوا پەرستیو کشانەوە لەبت پەرستی و هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، بەڵام نەیتوانی شوێنەواری شومی ئەو شەیتانە بسڕێتەوە چونکە ئەوەندە خراپی فریو دابونو ئەو بت پەرستی وهاوبەش دانانە لەگەڵ خوێنو گۆشتیان تێکەل بوبو هەر کاتێك نوح بانگی دەکردن بۆ خوا پەرستیو کشانەوە لەهاوبەشی دانان بۆ خوای گەورە ئەوانە ڕایان دەکردو گوێ یان بۆ نەدەگرتو گوێکانی خۆیان دەئاخنیو جلو بەرگەکانیان بەسەر سەرو گوێلاکی خۆیاندا دەدا تاکو گوێ یان لەقسەکانی نوح نەبێت، نۆ سەدو پەنجا ساڵ بانگی کردن کحەچی کەمتر لەهەشتا کەس بڕوایان هێنا، ئائەنجام نوح لەبەر دەستیان بێزار بو و دوعای لێ کردن فەرموی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لاَ تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ۞ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلاَ يَلِدُوا إِلاَّ فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ سورة نوح: (٢٦ـ ٢٧) واتە: خوایەگیان تۆوی کافران لەسەر گۆی زەوی نەهێڵیت چونکە ئەگەر هەر ئەوا لێ یان بگەڕێیت ئەوەندە موسڵمانانەی کەبڕوایان هێناوە

ئەوەنەش هەڵ دەگێڕنەوەودەیان کەئەوە بت پەرستو هاوبەش دانەرو ئەوەی لەداوێنیشیان دەکەوێتە هەر کافرو بێباوەڕی تاوانبار دەردەچن. ئەوە بو خوای گەورە دوعاکەی قبوڵ کردو لافاوە بەناو بانگەکەی نوحی(طوفان نوح) لەسەر زەوی بۆ بەرپا کردنو تەنیا ئەوانەی لەناو کەشتیەکەدا مانەوە لەبرواداران ڕزگاریان بو سەرجەم ئادەمیزادە بت پەرستو هاوبەش پەیداکارەکان خنکانو لەناو چون - وەرگێڕ)

إبن القيم گوتویەتی:(ئەم قسەیە بەتەواوی ڕاستە، خوێندنەوەی أبي إبن كعب واتا بۆ ئەم ئایەتەی سورەتی(البقرة) ئەوەیە:(دوایی جیاوازیو جیاڕایی کەوتە نێوانیانەوە لەبیرو باوەڕداو خوای گەورەش پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردن)([127]).

هەروەها پشت ڕاست کردنەوەیو شاهیدی ئەم خوێندنەوەیە ئەم فەرمودەیەی خوای گەورەیە لەسورەتی یونس کەدەفەرموێ:﴿ وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَاحِدَةً فَاخْتَلَفُواْ ﴾([128]).

إبن القيم - رحمه الله - دەڵێ: ناردنو ڕەوانە کردنی پێغەمبەران هۆکارەکەی ئەو جیاوازیو جیاڕاییە بو لەئاینی ڕاستەقینەی خوایی دا کەکەوتە ناویانەوەو بو بەهۆی پەرتەوازە بونیانو لادانیان لەبیروباوەڕی ئاینی ئیسلام.، هەروەکو چۆن عەرەبەکان لەسەر ئاینی ئیبراهیم - عليه السلام - بون، هەتا ئەو کاتەی کە عمرو کوڕی لحي الخزاعي هاتو لەئاینی ئیبراهیم لای دانو وەری گێڕان، وبتەکانی هێنانە ناو خاکی عەرەب، بەسیفەتێکی تایبەتیش بۆ ناو خاکی حیجاز، بەمە لەئاینی خوا دور کەوتنەوە، وهاوبەش دانان(الشرك) لەوڵاتە پیرۆزەکان (البلاد المقدسة)و دەورو پشتی دا بڵاو بوەوە، هەتا ئەو کاتەی کەخوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی محمد ﷺ کۆتای پێغەمبەرانی

([127])أ ــ إغاثة اللهفان:(٢/ ١٠٢).

ب - واتە: بت پەرستیو هاوبەش دانانو خوا نەناسیو دەرچون لەئاینی خوا سەری هەڵداو پەرتەوازەییو جیاڕایی کەوتە ناو چینو توێژەکانی ئادەمیزادەکانو فیسقو فەسادی پەیدا بو بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرانو پەیامەکانی خۆی بۆ ناردنە خوا بۆ ئەوەی لەو زەلکاوی گومڕاییو سەر لێشیواویە دەستیان بگرن و بیان هێننە دەرو لەدەستی شەیتانو فرو فێڵەکانی شەیتانو شەیتانیەکان ڕزگاریان بکەن. وەگێڕ.

([128])أ ــ سورة يونس: (١٩) .

ب - واتە: سەرەتا خەڵکی هەمویان لەسەر یەك ئاینو بیروباوەڕ بون کەئاینی ئیسلامە، بەڵام دوای ئەوەی جیاوازیو پەرتەوازەییو جیاڕایی کەوتە نێوانیانەوە بەهۆی شەیتانی نەفرین لێکراو وفریوی دانو لەئاینی خوایی لای دان. وەرگێڕ.

ڕەوانە کردو بانگی خەڵکی کرد بۆ بەتەنها خوا پەرستی خوای گەورە، وشوێن کەوتنی ئایینی ئیبراهیم، وەبەڕاستی ئەو زاتە ماندو نەناسە لەڕێگەی خوادا تێکۆشاو نوچی نەداو نەسرەوت، هەتاکو بیروباوەڕی بەتەنها خوا پەرستیو ئایینی ئیبراهیم گەڕایەوە، وهەمو بتەکانی تێك شکاندنو وردو خاشی کردنو خوای گەورە ئایینی ئیسلامی پێ تەواو کردو گەیاندیە مەنزڵو جێگەی مەبەست، وبەخششو نازو نیعمەتی خۆی بەسەر جیهانیاندا تەواو کردو پێ ی بەخشین کەبریتیە لەنیعمەتو بەخششی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام، دوای خۆشی چەندان سەدەی پڕ خێرو بەرەکەت لەسەرەتای ئەم ئوممەتی ئیسلامە لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئەوﷺ ڕۆیشتن، هەتاکو لەسەدەکانی دوایی دا نەفامیو نەزانیو گومڕایی لەناودا بڵاو بوەوەو جارێکی تر گەڕایەوە بۆ ناو ئوممەتی ئیسلام، سەدان شتی نامۆو دەرەکیان لەئایینە پوچەڵەکانی تر هێنایە ناو ئەم ئایینە پیرۆزە، دیسان سەر لەنوێ هاوبەش دانانو هاوەڵ بڕیاردان(الشــرك) بۆ زۆرێك لەم ئوممەتی ئیسلامە گەڕایەوە، بەهۆی بانگەشەکارانی گومڕاو سەرلێشێواوو وەبەهۆی دروست کردنی خانو لەسەر گۆڕو مەزارەکان، بەهۆی بەگەورە دانانو بەپیرۆز زانینی خۆشەویستانی خواو(الأولياء)و پیاوچاکان، دەربڕینی خۆشەویستی بۆیان، هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەگڵکۆو مەزاریان لەسەر گۆڕەکانیان دروست کردن، تابونە چەند بتو کۆتەڵێكو جگە لەخوا دەیان پەرستن، چەندان قوربانیان بۆ دەکردنو بۆیان دەکەن، بەجۆرەها شێوە خۆیان لێ نزیك دەکەنەوەو داوایان لێ دەکەنو لەبەریان دەپاڕێنەوەو هانایان بۆ دەبەن، نەزرو سەر بڕینیان لەسەر گۆڕو مەزارو گڵکۆکانیان بۆ سەر دەبڕن، ئائەم هاوبەش دانانەیان بە: وەسیلە دانانی پیاوچاکان واتەکردنی پیاو چاکان بەواسیتە لەنێوان خۆیانو خوادا ناو بردو ناو دەبەنو گوایە بۆ دەربڕینی خۆشەویستیە بۆیان نەك پەرستنو بەندایەتی بۆ کردنیان، هەروەکو خۆیان دەڵێن، بێ ئاگا لەوەی کەئەم کارو قسانەیان هەمان گۆتەوەو قسەی هاوبەش پەیداکارانی سەرەتاو پێش خویانن کەدەیان گوت : ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ﴾ سورة الزمر: (٣). ( لەبەشەکانی ڕابردودا واتاکەیمان نوسیوە - وەرگێڕ-) .

لەگەڵ ئەو هاوبەشی پەیدا کردنەشدا کەبەشەریەتی تێ کەوتوە لەکۆن و تازەدا، سوپاس بۆ خوا هێشتاکو زۆرینەی ئادەمیزادەکان بڕوایان بەتەنها خوا پەرستی خوای گەورە هەیە، بەڵکو تەنیا لەبەندایەتی بۆ کردندا(العبادة) هاوبەش و هاوەڵ دادەنێن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾[129]. واتە هاوبەش پەیداکارن بۆ خوای گەورە.

بەشێکی زۆر کەم نەبێت لەئادەمیزادەکان بونی پەروەردگار ڕەت ناکەنەوەو بڕوایان پێ ی هەیە، وەك فرعەون و بێباوەڕو لەئاین دەرچوەکانی سەردەم، کۆمۆنیست و مارکسیستەکانی ئەم زەمانە. بڕوا نەبون و ڕەت کردنەوەکەشیان لەڕوی کەللە ڕەقی و سەرکەشی و خۆ بەزل زانیانەوەیە، بەڵام لەناخی خۆیاندا ناچارن کەدەبی بڕوایان بەبونی خوای پەروەردگار هەبێت و ددانی پێدا بنێن، و دڵ و دەرونیان بڕیاری لەسەر بدات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾ سورة النمل: (١٤).

عەقڵیان دەزانێت و هەست بەوە دەکات و ددان پێدا دێنێت کەدەبێ هەمو دروستکراوێك و بەدیهاتوێك دروستکارو بەدیهێنەری هەبێت و هیچ شتێك لەخۆوە دروست نابێت و نایەتە بون، وەئەم سیستمە ڕێك و پێکەی ئەم بونەوەرە ڕێك و پێك و وردە کاریە شتێکی بەڵگە نەویستەو گومانی تێدا نیە کەدەبێ هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەرێکی زۆر ژیرو داناو ، بەتواناو زاناو زانیار هەبێت، هەر کەسێك کەئینکاری بونی ئەو دروستکارو بەدیهێنەرە بکات ئەوە یان عەقڵی لەدەست داوە، یاخود خۆ بەزل زان و کەللە ڕەق و سەرکەش و ملهوڕە کەبەڕاستی عەقڵی پوچەڵ بوەو بەتەواوی ژیری و فامیدەیی خۆی لە دەست داوەو نەفسی خۆی سوك و چروك کردوەو گەوج بوە، ئەمەش هیچ جێگەی وانەو پەندو ئاوڕ لێدانەوە نیە.

******　　　*****　　　*****

---

([129])أ ـ سورة یوسف: (١٠٦).

ب ـ واتاکەیمان لەبەشەکانی ڕابردودا لێك داوەتەوە. وەرگێڕ.

## بەشـــی دووەم

### هاوبەش دانـان ـ پێناسەو جۆرەکانی.

أـ پێناسـەکەی: هاوبـەش دانـان: بریتیـە لـەدانانی هاوبـەش بـۆ خـوای گـەورە لـە پەروەردگارێتیو لەخوایەتی خوای گەورەداو بەزۆریش هاوبەش دانـان لەخوایـەتی خـوای پـەروەردگاردا ڕو دەدات، بـەوەی کەلەگـەڵ خـوادا داوا لەغـەیری خـوا بکـەیت، یـاخود ئەنجامدانی جۆرێك لەبەندایەتیەکان بۆ غەیری خوای گەورە، وەك سەربڕینو نەزر کـردن، وترسـانو داواو ڕجـا کـردنو خۆشەویسـتی. وەهاوبـەش دانـان لەگوناحـە گەورەکانـە، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك:

١ـ چونکە وێچواندنی بەدیهێنەرە بەدروستکراوەکانی لەتایبەتمەندیو جیاکاریـەکانی خوایەتی دا، هەر کەسێك هەر شتێك بکاتە هاوبەشی خوای گەورە ئەوە بەخوای گـەورەی چـواندوە، دیـارە شـتێکی بەڵگـە نەویسـتە کەئـەم کارەگـەورەترین ستەمێکەو لـەخوای گەورەی دەکات، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێت:﴿ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ سورة لقمـان: (١٣).(واتە: هاوبەشی دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە لەخوا دەکرێت. وەرگێڕ).

پێناسەی ستەم(الظلم): بریتیە لەدانانی شتێك لەغـەیری جێگـەی ڕاسـتەقینەی خـۆی، جاهەر کەسێك شتێکی تر یاکەسێکی تر غەیری خوا بپەرستێتو بەندایەتی بۆ بکات ئەوە بەندایەتی کردنی لەغەیری جێگەی ڕاستەقینەی خـۆی داناوەو بـۆ کەسـێکی تـری ناشایسـتەی خۆی کردوەو بۆ ئەو کەسـەی ئـەنجام نـەداوە کەتـەنیا لایـەقو شایسـتەیە بـەو کەخوای پـاكو بێگەردە، دەی کەواتە ئەوە گەورە ترین ستەمێکەو لەخوای پەروەردگاری کردوە.

٢ـ خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوینو پێ ی ڕاگەیاندوین کەهەرگیز لەو کەسە خۆش نابێت کە هاوبەشو هاوشان بۆ خوای گەورە دادەنێت ئەگەر تۆبە نەکات، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء ﴾[١٣٠].

٣ـ خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەبەهەشتی لەهاوبـەش پـەیداکاران حـەرام کـردوە، وەبەهەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوەو تیایدا نـەمرە، خـوای بـاڵا دەسـتو کـار بـەجێ

(١٣٠)أ ـــ سورة النساء: (٤٨)

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا شی کردۆتەوە. وەرگێڕ.

دەفـەرموێت:﴿ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّـالِمِينَ مِـنْ أَنصَارٍ﴾([131]).

**٤ـ هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە هەمو کارو کردەوە چاکەکان دەسڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ:**﴿ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَـنْهُم مَّـا كَـانُواْ يَعْمَلُـونَ﴾([132]). **هـەروەها دەفـەرموێ:**﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُـونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سورة الزمر: (٦٥).**(واتاکەیمان لەڕابردودا شی کردۆتەوە ـ وەرگێڕ).**

**٥ـ هاوبەش دانەر خوێن و ماڵی لەموسڵمانان حەڵاڵە واتە دەبی بکوژرێ، خوای گەورە دەفەرموێ:**﴿ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُـلَّ مَرْصَدٍ﴾([133]). **هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:**{أُمرت أن أُقاتلَ الناس حتى يقولوا: لا إله إلا الله، فإذا قالوها عصموا مني دِماءهم واموالهم إلا بحقها}([134]).

**٦ـ هاوبەش دانان لەگوناحە گەورەکانەن پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:**{ألا أنبئكم بأكبر الكبائر} قلنا: بلى يارسول الله، قال:{الإشراك بالله، وعقوق الوالدين...}([135]).

**ئاودارو بلیمەت إبن القـیم گوتویەتی:(خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەمەبەست لەدروست کردن و هێنانەدی خەڵك وفرمان کردن: ئەوەیە کەخوای گەورە بەناوو سیفاتەکانی بناسن، ویەتەنیا بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن و هیچ کەس و هیچ شتێکی**

---

([131]) أ ــ سورة المائدة: (٧٢).

ب ـ واتاکەیمان لەبەشەکانی ڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

([132]) أ ــ سورة الأنعام: (٨٨).

ب ـ واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێن هەمو کردەوە چاکەکانیان کەکردویانن ڕەش دەبنەوەو هیچیانی لێ وەرناگیرێت. وەرگێڕ.

([133]) أ ــ سورة التوبة: (٥).

ب ـ واتە: هاوبەش دانەران بکوژن لەهەر شوێنێك توشیان بون، بەدیلی بیان گرن و تەنگیان پێ هەڵ بچنن و دەورەیان بدەن، بۆیان دانیشن هەمو ڕوانگەو بۆسەیەکیان لێ بگرن و بەهیچ شێوەیەك بواریان مەدەن. وەرگێڕ.

([134]) أ ــ رواه البخاري ومسلم.

ب ـ واتاکەیمان لەبەشەکانی ڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

([135]) أ ــ سورة التوبة: (٥).

ب ـ واتە: ئایا گەورە ترینی گوناحەکانتان پێ بڵێم، گوتمان: بەڵێ ئەی ڕەسولی خوا، فەرموی:{هاوبەش دانان بۆ خوا، و توڕە کردن و ڕێز نەگرتن و ئازار دانی دایك و باوك}. وەرگێڕ.

لەگەڵ دا مەکەنە هاوبەش‌و هاوشان، وە ئادەمیزادەکان بەدادپەروەریو هەق پەروەری هەڵ بستن‌و دادپەروەر بن، ئەو دادپەروەریەی کەئاسمانەکان‌و زەوی لەسەر وەستاوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾ سورة الحديد: (٢٥).

خوای پاك‌و بێگەرد پێی ڕاگەیاندوین کەنێردراوەکانی خۆی بۆ ڕەوانە کردوین، وەهەروەها کتێبەکانی خۆی بۆ ناردوینە خوار بۆ ئەوەی بەپێ ی ئەو بەرنامانە ئادەمیزادەکان بڕۆن بەڕێوەو دادودادپەروەری لەناو خەڵکی دا بڵاو بکەنەوە بەدرێژایی ژیانی مرۆڤایەتی، وەگەورە ترین داد پەروەریو ڕاستیش بریتیە لە: بەتەنها خوا پەرستی کەبریتیە لەسەری دادو دادپەروەریو کۆڵەکەو پاڵپشتەکانی(قوامـه)، وەلەبەرامبەریشدا هاوبەش دانان ستەم‌و ستەمکاریە هەروەکو خوای گەورە دەفەموێت:﴿ :﴿ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ سورة لقمان: (١٣). دەی کەواتە هاوبەش دانان ستەمترینی ستەمانە، و بەتەنها خوا پەرستیش ڕاست ترین‌و دادپەروەرترین دادو دادپەروەریەکانە، توند ترین‌و سەر سەخت ترین پێچەوانەو دژێك بۆ ئەم مەبەستە بریتیە لەگەورە ترینی گوناحەکان(أكبر الكبائر). هەتا ئەو شوێنەی کەدەڵێ:(لەبەر ئەوەی کەهاوبەش دانان بەخودی خۆی پێچەوانەو دژی ئەم مەبەست‌و واتایەیە، بەڕەهایی ئەوەواتە هاوبەش دانان لەگەورە ترینی گوناحەکانە، و خوای گەورە بەهەشت لەهەمو هاوبەش دانەرێك حەرام دەکات، خوێن‌و ماڵ‌و خاوو خێزانی بۆ ئەهلی بەتەنها خوا پەرستان حەلاڵ دەکات، وەبیان کەن بەکۆیلەو بەندەی خۆیان لەبەر ئەوەی بەندایەتی کردن‌و پەرستنی خوایان واز لێ هێناوەو لەدینی خوا لایان داوە.، خوای گەورە قەدەغەی کردوە کەهیچ کارێك لەکارەکانی هاوبەش پەیداکار وەربگیرێت. یاخود هیچ تکایەکیان لێ وەر بگیرێت، لەدوایی دا وەلامی دوعای بدرێتەوە، یارچاو داواکانی وەر بگیرێت، هاوبەش دانەر لەنەفام ترین‌و نەزان ترینی نەزان‌و نەفامەکانە لەبارەی خوای گەورەوە، چونکە لەدروستکراوەکانی خۆی دا هاو وێنەو هاوشێوەی بۆ خوای خالق داناوە، دیارە ئەمەش دیار ترین‌و ڕونترین نەزانی‌و نەفامیە بەرامبەر بەخوای گەورە، هەروەکو ئەوە ئەوپەڕی

ستەمو ستەمكاریە لەخوای گەورە دەكرێت، خۆ ئەگەر هاوبەش دانەر لەواقعدا ستەمیش لەپەروەردگاری نەكات، بەدڵنیاییەوە ستەم لەنەفسی خۆی دەكات)..تەواو.

٧ـ هاوبەش پەیدا كردن بۆ خوای گەورە ناتەواوی‌و بونی خەوش‌و عەیب دەگەیەنێت كەخوای پەروەردگار لەو دو سیفەتە بەدورەو پاك‌و بێگەردە، هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت ئەوە بۆ خوای دەسەلمێنی‌و جێگیر دەكات كەخوای گەورە خۆی دور خستۆتەوەو خۆی لێ پاك‌و بێگەرد كردوە، كەسیفەتی ناتەواوی‌و بونی عەیبە (خوای گەورە پەنامان بدات)، وەئەمەش گومانی تێدا نیە ئەو پەڕی دژایەتی كردن‌و لەسنور تێ پەڕاندنە بەرامبەر بەخوای پەروەردگار، وئەوپەڕی سەركەشی‌و كەللە ڕەقی‌و دوژمنایەتی كردنی خوای گەورەیە(المعاندة والمشاقّة لله).

ب ـ جۆرەكانی هاوبەش دانان(الشرك):

هاوبەش دانان دو بەشی هەیە:

جۆری یەكەم: هاوبەش دانانی گەورە(شرك الأكبر): هاوبەش دانانی گەورە پێ ی لەئایینی خوا دەردەچێت، وەخاوەنەكەی بەهەمیشەیی لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو تیایدا نامرە، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتەدا مردو تۆبەی نەكرد، كەبریتیە لەئەنجامدانی هەندێك لەجۆرەكانی بەندایەتی كردن بۆ غەیری خوا، وەك دوعاو داوا كردن لەغەیری خوا، وەخۆ نزیك كردنەوە بەسەربڕین‌و نەزر كردن بۆ غەیری خوا لەگۆڕو نەزرگەو مەزارەكان‌و جنۆكەو شەیاتینیەكان، ترسان لەمردوان‌و جنۆكە یاشەیاتینیەكان كەگوایە زیانیان پێ دەگەیەنێت‌و توشی بەڵاو تەنگەبەریان دەكات یان توشی نەخۆشیان دەكات(كورد گوتەنی دەیهەنگێوێت. وەرگێڕ)، هەروەها ڕجاو پاڕانەوە لەبەر غەیری خوا لەشتێكدا كەكەسی تر توانای بەسەردا ناشكێت جگە لەخوای پەروەردگار لەهێنانە دی‌و جێ بەجێ كردنی پێداویستیەكان، ڕزگار كردن لەناكۆكی‌و بەڵاو تەنگژەكان، لەوەی كەئەمڕۆ لەدەوری گڵكۆو نەزرگەو مەزارەكانی كەلەسەر گۆڕی دۆستانی خواو پیاو چاكان دروست كراون دەكرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللّهَ بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي

الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ سورة يونس: (١٨).(واتاكەيمان لەبەشەكانی ڕابردودا شی كردۆتەوە. وەرگێڕ).

**جۆری دوەم: هاوبەش دانانی بچوك(شرك الأصغر):** ئەم جۆرەیان پێ ی لەئایینی خوا دەرناچیت، بەڵام لەبەتەنها خوا پەرستی كەم دەكاتەوە، هۆكارێكیشە بۆ گەیشتن بەهاوبەشی دانانی گەورە، ئەمەش دو بەشی هەیە:

بەشی یەكەم: ئەو هاوبەشی دانانەیە كەلەسەر زمانو ئەندامەكانی جەستە ئەنجام دەدرێت: كەبریتیە لە گۆكردن واتە گوتن بەزمانو ئەنجامدان بەكردەوە، گوتن بەزمان واتە گۆ كردن وەك سوێند خواردن بەغەیری خوا، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك}[١٣٦]. هەروەها گوتنی: (ماشاء الله وشئت ـ ئەگەر خواش‌و تۆش بتانەوێت)، پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بەو پیاوەی كەپێ ی گوت:(ماشاء الله وشئت) فەرموی:{أجعلتني لله نداً؟! قُلْ : مَاشاء الله وحده}[١٣٧].. هەروەها گوتنی:(لولا الله وفلان ـ ئەگەر خواو فلانە كەس نەبوایە)، بەڵكو ڕاستیەكەی ئەوەیە‌دەبێ بڵێ ی :(ماشاء الله ثم شاء فلان ـ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت‌و ئەمجار تۆش حەزت لێ بێت)وە(لولا الله ثمَّ فلان ـ ئەگەر خوا نەبایەو ئەمجار فلان)، چونكە وشەی(ثُمَّ ـ پاشان یائەمجار) واتای ڕیز بەندی و یەك لەدوای یەك دەگەیەنێت لەگەڵ سستی‌و لێك دور كەوتنەوەیەك لەنێوان خواو بەندەكانی دا واتە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت ئەمجار دوایی تۆش حەزت لێ بێت، وەئەمە وادەگەیەنێت كەویست‌و حەزی بەندە پاشكۆی ویست‌و حەزو‌ئارەزەكانی خوا بێت، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[١٣٨]. بەڵام پیتی(واو): بەڕەهایی بۆ كۆو هاوبەشی بەكار دێت. وڕیز بەندی‌و

---

([١٣٦]) أ ـــ رواه الترمذي وصححه الحاكم.

ب ـ واتە: هەر كەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوە كافر بوە یان هاوبەشی بۆ خوا داناوە. وەرگێڕ.

([١٣٧])أ ـــ رواه النسائي.

ب ـ واتە: ئەوە منت كردە هاو وێنە بۆ خوا؟! جارێكی تر وامەڵێ؛ بەڵكو بڵێ ئەگەر خوای گەورە بەتاكو تەنیا ویست‌و ئارەزوی لێ بێت. وەرگێڕ.

([١٣٨])أ ـــ سورة التكوير: (٢٩).

یەك لەدوای یەك ناگەیەنێت، هەروەها لەوێنەی ئەم جۆرە گۆتانە:(مـالي إلا الله وأنـت ـ لەخواو لەتۆ بەولاوە هـیچ کەسی تـرم نیـە)، وە( هـذا برکـات الله وبرکاتـك ـ ئەمـە لەبەرەکەتو پیرۆزی خواو بەرەکاتی تۆیە).

بەڵام کردەوەکان(الأفعال): وەکو لەدەست کردنی بازنە یائاڵقە(الحلقـة) خێتو پـەڕۆو بەن(پەت)و گشتەكو وێنەی ئەوانە بـۆ لابردنـی بـەڵاو موسیبەتو تەنگژەکان. هـەروەها وێنەی هەڵواسینی نوشتەو گشتـەك لەترسی چاوەزارو ئـەو جۆرە شتانە، ئەگـەر بـیرو باوەڕی وا بێت کەئەو شتانە دەبنە هۆی لابردنی ئەو بـەڵاو موسیبەتانە، ئـەوە هاوبـەش دانانی بچوکە، چونکە خوای گەورە ئەم شتانەی نەکردونەتـە هۆکـارو سـەبەبو وەسیلە لەم بوارانـەدا، بـەڵام ئەگـەر بـاوەڕی وابێـت کەئـەو شتانە بـۆ خۆیان بـەڵاو موسیبەتو کێشـەکانیان لەسـەر لادەبـەنو خـودی خۆیـان ڕزگاریـان دەکـەن ئـەوە هاوبـەش دانـانی گەورەیە چونکە پەیوەست بوە بەغەیری خواوە واتە داوای لەغەیری خوا کـردوەو هانـای بۆ غەیری خوا بردوە.

بەشی دوەم لەهاوبەش دانانی بچوك: هاوبـەش دانـانی نادیـار(الخفـي): کەبریتیـە لـە هاوبەش دانان لە ویستو ئیرادەو نیەتدا، وەك ڕوپامـاییو ناوبـانگ(السمعة) وەك ئـەوەی کەکارێك بکات کەپێ ی لەخوا نزیك دەبێتـەوە، بـەڵام مەبەسـتی ئـەوەی لەگـەڵدا هەیـە کەخـەڵکی باسـی بکـەنو مـەدحی بکـەن، هـەروەها وەکـو ئـەوەی نوێـژەکانی بـەجوانی دەکات، یاخود خێرو خێرات دەکاتو دەبەخشێت، لـەپێناوی ئـەوەی کەخـەڵکی مـەدحی بکەنو سوپاسی بکەن، یاخود ویردەکان بـەدەنگ دەخوێنێـتو دەنگـی خـۆش دەکـاتو دیڕازێنێتەوەو دەیلەرێنێتەوە لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا بۆ ئـەوەی خـەڵك گـوێ ی لێ بێتو مەدحی بکەنو ستایشی بکەنو پێ ی بڵێن بەخوا فـلان کـەس دەنگـی خۆشـە. وە ڕیایی ئەگەر تێکـەڵ بەهـەر کارێـك بکرێـت ئـەو کـارە پوچـەڵ دەکاتـەوە، خـوای گـەورە

---

ب ـ واتە: ئێوە هیچ شتێکتان ناوێتو بۆتان ناگونجێتو چتان لەدەست نایەت، مەگەر خوای گەورە مەبەستی بێتو ویستو ئارەزوی لەسەر بێتو بۆتان ئەنجام دەدات. وەرگێڕ.

دەفەرموێ:﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾[١٣٩].

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {أخوف ماأخاف عليكم الشرك الأصغر} قالوا: يارسول الله، ومالشرك الأصغر؟قال: {الرياء}[١٤٠].

هەروەها کار کردن لەپێناو تەماح و ماڵی دنیادا واتە بۆ دنیا خۆری، وەك ئەو کەسەی کەدەچێتە حەج یابانگ دەدات یاپێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکات لەپێناو دەست کەوتنی ماڵی دنیا، یاخود زانستە شەرعیەکان فێری خەڵکی دەکات، یان تێدەکۆشێت(يجاهد) لە پێناو وەدەست کەوتنی ماڵی دنیا. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {تعس عبد الدينار، و تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أُعطيَ رضى، وإن لم يعط سخط }[١٤١].

پێشەوا إبن القيم ـ رحمه الله ـ گوتویەتی:(بەڵام هاوبەش دانان لەویستو ئیرادەو نیەتدا، ئەو دەریایەیە کەهیچ کەنارێکی نین، کەم کەس هەیە ڕزگاری ببێت لێ ی، هەر کەسێك لەکارەکەی دا مەبەستی غەیری خوا بێت، وەنیەتی شتێکی تر بێ لەغەیری نزیك بونەوە لەخواو بەمەبەستی پاداشت وەر گرتنەوە، ئەوە هاوبەشی لەنیەتو ئیرادەکەی دا پەیدا

---

([١٣٩])أ ـــ سورة الكهف: (١١٠).

ب ـ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەو بێباوەڕانەی کەباوەڕ بەپێغەمبەرێتیت ناهێنن بڵێ: منیش وەکو ئێوە مرۆڤێکم و هیچم لەئێوە پتر نیەو تەنیا ئەوە نەبێت کەخوای گەورە وەک پێغەمبەرێک ڕێزی لێ ناوم و سروش(وحی)ـم بۆ دەنێرێت کەپێتان ڕابگەیەنم کەئێوە تەنیا تاکە خوایەکتان هەیە کەبەهەق بیپەرستن و بەندایەتی بۆ بکەن و هیچ کەس و هیچ شتێکی تر جگە لەخوای گەورە مەپەرستن و بەندایەتی بۆ مەکەن و هاوڵی بۆ دامەنێن، جاهەر کەسێکی کەدەیەوێت لەڕۆژی دوایی دا بەدیداری خوای خۆی شاد ببێت باکردەوەی چاک بکات و هیچ هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوای تاک و تەنیا دانەنێت. وەرگێڕ.

([١٤٠])أـــ رواه أحمد والطبراني والبغوي في شرح السنة.

ب ـ واتە: ئەوەی لەهەمو شتێك پتر لێتان دەترسم کەتێ ی بکەون هاوەبەش دانانی بچوکە، گوتیان: ئەی ڕەسولی خوا: هاوبەش دانانی بچوك چی یە؟ فەرموی: ڕوپاماییە(الرياء). وەرگێڕ

([١٤١]) أـــ رواه البخاري.

ب ـ خاکەساری و کلۆڵی و قوڕ بەسەری بۆ بەندەی دینار، و قوڕ بەسەرو خاکەساری بۆ بەندەی دیرهەم، و قوڕ بەسەری بۆ بەندەی ورگ پڕ کار کەهەمیشە خەمەکانی تەنیا ورگ پڕ کردنە، خاکەساری بۆ بەندەی باخ و باخات و ماڵی دنیا، ئەگەر بیدرێتێ و هەی بێت ئەوە ڕایەو کەیف خۆشە، وەئەگەر نەیدرێتێ و نەی بو ئەوا تورەو تەنگاو گرژو مۆنە و بێزارە. وەرگێڕ.

کردوە، وەنیازپاکی(الإخلاص): ئەوەیە کەنیەتو نیاز پاکی تەنیا بۆ خوایە لەکارو چالاکیەکانو گفتارو قسەو ئاخاوتنەکانی دا، هەروەها لەنیەتو ویستو ئیرادەو خواستەکانی دا. ئائەمەیە پاکیەتیو نەرمیو نیانیو لێ بوردەیی ئایینی ئیبراهیم کەخوای گەورە فرمانی بەهەمو بەندەکانی کردوە کەتەنیا ئەم ئایینو ئەم ڕێگەو ڕێبازە بگرنو بەم لاو بەولادا ملی کوێرە ڕێ یان مەگرن، وەغەیری ئەم ئایینە لەهیچ کامێك لەبەندەکانی قبولْ ناکاتو وەر ناگرێت، کەئەمەش ڕوی ڕاستەقینەی ئایینی ئیسلامە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ سورة آل‌عمران: (٨٥). کەبریتیە لەئایینی ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ کەهەر کەسێك لەم ئایینە لابداتو هەڵ بگەڕێتەوە ئەوە لەسوكو چروك ترین کەسو سوکەڵەو چروکەکانە)[١٤٢].. تەواو.

پوختەی ئەوەی کەلەڕابردودا باس کرا چەندان جیاوازی لەنێوان هاوبەش دانانی گەورەو بچوك دا هەن کەلەم چەندا خاڵانەی خوارەوەدا بەیان گوشین:

١ـ هاوبەش دانانی گەورە: پێ ی لەئایین دەچیتە دەر، بەڵام هی بچوك پێ ی لەئایین دەرناچیت، بەڵام لەتەنها خوا پەرستی کەم دەکاتەوە.

٢ـ هاوبەش دانانی گەورە هەمو کردەوە چاکەکان ڕەش دەکاتەوە، بەڵام هی بچوك هەمو کردەوەکان ڕەش ناکاتەوە، تەنیا ڕیابازیو کار کردن لەپێناو ماڵی دنیا ئەو کردە چاکانە ڕەش دەکاتەوە کەتێکەڵیان بکرێت.

٣ـ هاوبەش دانانی گەورە خاوەنەکەی بەهەمیشەییو نەمری لەدۆزەخدا دەهێڵێتەوە، وەلێ هی بچوك خاوەنەکەی بەهەمیشەییو نەمری لەدۆزەخدا ناهێنێتەوە ئەگەر چوە ناویەوە.

٤ـ هاوبەش دانانی گەورە خوێنو سەرو ماڵ حەڵاڵو ڕێگە پێ دەدات، بەڵام هاوبەش دانانی بچوك حەڵاڵیان ناکاتو ڕێگەیان پی نادات.

******* ******* *******

(١٤٢) الجواب الكافي ص١١٥.

## بەشـــی سێیەم

## کوفر(الکفر): پێناسەکەی ـ جۆرەکانی

**أ ـ پێناسەکەی:**

کوفر لەزماندا: داپۆشین‌و پەردە پۆش کردن([143])، وەکوفر لەشەرعدا: دژی بڕوا بـون‌و باوەڕ کردنە، دەی کوفر: بریتیە لەبڕوا یاباوەڕ نـەبون بـەخوای گـەورەو بەپێغەمبـەران‌و ڕەوانە کراوەکانی، چاچ درۆی لەگەڵ دا بێت، یاخود درۆی لەگەڵ دا نەبێت، بـەڵکو تـەنیا گومان کردن یا پشت هەڵ کردن یا ئیرەیی(حسد)، یاخود خۆبەزل زانی‌و کەللە ڕەقی، یا شوێن کـەوتنی هەنـدێ لەهـەواو ئارەزوەکـانی کـەڕێگرن لەشـوێن کـەوتنی پـەیامی خـوا. وەئەگەر درۆزن (المکذب) گەورە ترین کوفر ی هەبێت، یاخود نکوڵی لەپەیامی خوا بکات ، هەروەها نکۆڵیکار یاکافر(الجاحد)و درۆزن ئیرەچی(حسـدا) بێـت واتـە ئیرەیـی بکـات، لەگەڵ دڵنیا بونیشی لەڕاستگۆیی پەیامبەران واتە پێغەمبەران([144]).

**ب ـ جۆرەکانی:**

کوفر دو جۆری هەیە:

**جۆری یەکەم: کوفری گەورە پیێ ی لەئایین دەچیتە دەر، کەئەمیش پێنج بەشن:**

بەشی یەکەم: کوفری بـەدرۆ خسـتنەوە(التکـذیب)([145])، بەڵگـەش ئـەم فەرمایشـتەی خوای گەورەیـە:﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِـي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ﴾([146]).

---

([143]) کافر واتا داپۆشەر، هەر کەسێك شتێك داپۆشێت پیێ ی دەڵێن(کافر) کفر بەواتا دای پۆشی ، بۆیـەش بـەو کەسـەی کەلەئایینی خوا دەردەچێت دەڵێن کـافر چـونکە ڕاسـتی‌و واقعیـەتی بەرنامـەو پەیامەکـەی خـوای داپۆشـیوە. هـەروەها بەجوتیارانیش دەڵێن (کافر)، بۆ پیێ دەڵێن کافر؟ چونکە تۆو دانەوێڵەکان بەزەوی وەردەکات‌و دوایش دەیکێڵێت‌و بـەو کیلانـە تـۆو دانەوێڵـەکان بـەو گڵـە کێڵـدراوە دادەپۆشـێت، واتـە ئـەو جوتیـارە تـۆو دانەوێڵـەکانی داپۆشـی واتـە داپۆشەرە(کافر)ە، وەرگێڕ

([144])مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام إبن تيمية(١٢/ ٣٣٥).

([145]) واتە: بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەران‌و پەیامی خواو بڕوا نەکردن بەو بەرنامەیەی کەخوای گەورە بۆ مرۆڤی ناردۆتە خوارو بڕوا نەکردن بەپایەکانی ئیمان‌و ئیسلام. وەرگێڕ.

([146])أ ـــ سورة العنكبوت: (٦٨) .

بەشی دوەم: کوفری نەویستن‌و ڕەت کردنەوە(الإباء)وە خۆ بەزل زانین(الإستكبار) لەگەڵ ئەوەشدا کەبەڕاستیشی دەزانێت‌و باوەڕیشی پێ یەتی، بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورە:﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾[147].

بەشی سێ یەم: کوفری گومان‌و دو دڵی(الشك)، کەبریتیە لەکوفری گومان بردن(الظن) ، بەڵگەش ئەم فەرمودەی خوای گەورەیە:﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا ۞ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ۞ قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا ۞ لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا﴾[148]

---

ب ـ واتە: کێ لەو کەسە ستەمکار ترە کەدرۆ بەدەم خواوە هەڵ دەبەستێت‌و دەڵێ: خوای گەورە هاوەڵی هەیە ، یاخود هەق‌و ڕاستی کەبۆ هاتە خوار کەمەبەست لەقورئانی پیرۆزە بەدرۆی دەزانێت‌و باوەڕی پێ ناکات‌و دەڵێ: ئەمە لەلایەن خواوە نەهاتوە ، ئایا جێگەی حەوانەی کافران‌و بێباوەڕو ملهوڕان ناو ئاگری دۆزەخ نیە؟ تەفسیری گوڵشەن ب٢ل ١٠٣٦. وەرگێڕ.

([147])أ ـــ سورة البقرة: (٣٤).

ب ـ واتە: کاتێ بەفریشتەکانمان گوت: کڕنوشی ڕێز گرتن بۆ ئادەم بەرن،نەك سوجدەی پەرستن چونکە ئەمەیان تەنیا بۆ خوا دەکرێت. هەمویان فرمانی ئێمەیان جێ بەجێ کرد تەنیا ئیبلیس نەبێت سەرپێچی کردوو نەیویست‌و خۆی بەزل زانی‌و چوە ڕیزی کافرانەوە. وەرگێڕ.

([148])أ الكهف:٣٥ـــ ٣٨.

ب ـ واتە: کاتێ چوە ناو باخ‌و باخاتەکەی لەبری ئەوەی سوپاس‌و ستایشی خوا بکات لەسەر ئەو هەمو نازو نیعمەتەی کەخوا پێ ی بەخشیوە بەڵام ئەو ستەمی لەخۆی کردو لەخۆی بایی بوو بەهاوڕێکەی گوت: من باوەڕ ناکەم هەرگیز ئەم باخ‌و باخاتە جوانە لەناو بچێت‌و هەر دەمێنێت‌و بەردەوام دەبێت، هەروەها گوتی: من باوەڕناکەم ڕۆژی دوایی هەبێت و بێتە دی. دەی خۆ ئەگەر هەش بێت‌و بگەڕێنرێمەوە لای پەروەردگارم لەوێش لێرە باشتر دەبم و ماڵ‌و سامان‌و جێگەم لێرە باشتر دەبێت، هاوڕێکەی پی ی گوت: ئەوە تۆ لەئایین هەڵ گەڕاویتەوەو باوەڕت بەو خوای پەروەردگارە نیە کەتۆی لەگڵ‌و دواییش لەدڵۆپە ئاوێکی قێزەونی باوکت‌و لەمێلکۆکەی دایکت دروست کردوە دوای ئەوەی ئەو دڵۆپە ئاوە دەچێتە زاماڵی دایکتەوەو دروستی کردی‌و دوایی لەدایك بوی‌و گەورە بویت‌و کردویی بەپیاوە جوان‌و ڕێك‌و پێك‌و خاوەن بەژن‌و باڵایە، هەروەها پێ ی گوت: کەتۆ دەڵێیت شتی وا نابێت واتە ڕۆژی قیامەت نیەو دانایە کەچی من باوەڕی تەواوم پێ ی هەیەو تەنیا خوای پەروەردگار بەخوای پەروەردگاری خۆم دەزانم‌و منی لە نەبونەوە هێناوەتە بون‌و ڕۆزیم دەدات‌و دەمژیەنێت‌و دەم مرینێت‌و دیسان زیندوم دەکاتەوەو هیچ هاوەڵ‌و هاوبەشی بۆ دانانێم. بەتاك‌و تەنیا دەیپەرستم‌و بەندایەتی بۆ دەکەم. وەگێڕ

بەشی چوارەم: کوفری پشت تێ کردن(الإعراض): بەلگەش ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە:﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ﴾([149]).

بەشی پێنجەم: کوفری دوڕوویی(النفـاق)، بەلگەشمان ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگارە:﴿ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ﴾([150]).

جۆری دوەم: کوفری بچوك: کەپێ ی لەئایین دەرناچێت، کەبریتیە لەکوفری کردەوەیی(العملـي)، وەبریتین لەو گوناحانەی کەلەقورئانی پیرۆزو لەسوننەتدا هاتونوئاماژە پێ کراون کەبەکوفر ناو براون، ئەو کوفرانەن کەناگەنە سنوری کوفری گەورە، وەك کوفری نیعمەت کەلەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتوە کەدەفەرموێ:﴿ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ ﴾([151]).

هەروەها وەکو کوشتنی موسڵمانو جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان لەفەرمودەی پێغەمبەرﷺ:{سباب المسلم فسوق وقتالـه كفـر}([152]). وەلەفەرمودەیەکی تردا ﷺ فەرمویەتی:{ لاترجعوا بعدى كفاراً يضرب بعضكم رقاب بعض}([153]).

---

([149]) أ ـ سورة الأحقاف: (٣).

ب ـ واتە: ئەوانەی کەکافرو بێباوەڕن پشتیان هەڵ کرد لەو ڕۆژەی کەلێ ی ئاگادار دەکرانەوەو لەو سزایەی کەلێ ی دەترسێنران و باوەڕیان بەپەیامەکەی خوا نەهێنا. وەرگێڕ.

([150]) أ ـ سورة المنافقون: (٣).

([151]) أ ـ سورة النحل: (١١٢) .

ب ـ واتە: خوای گەورە نمونە بەئاوەدانیەك یا وڵاتێك دێنێتەوە کەخوای گەورە ژیانێکی خۆشو سفتو لوسو پرئارامیو دڵنیایی پێ بەخشیبونو ڕزقو ڕۆزی لەهەمو لایەکەوە بەسەردا دەباراندنو هیچ ناتەواوو ئاگروریەکیان نەبو کەچی ئەوان لەبری ئەوەی خوای گەورە بەباشی بپەرستنو شوکرانە بژێری خوا بکەن، کەوتنە خراپەکاریو فیتنەو ئاژاوە نانەوەو بروا نەبون بەخوای گەورەو کوفریان هەڵ بژاردو هاوبەشیان بۆ خوا داناو شوکرانەی نازو نیعمەتەکانی خوایان نەکردو خوای گەورەش سزای دانو توشی تورەیی خواو بونو عەزابێکی توندو تیژی بەسەردا باراندن. وەرگێڕ.

([152]) أ ـ رواه البخاري ومسلم.

ب ـ واتە جنێو دان بەموسڵمان لەڕێ لادانو خراپەکاریەو کوشتنی یاجەنگ لەگەڵ کردنی کوفرە. وەرگێڕ.

([153]) أ ـ رواه الشيخان .

ب ـ واتە: لەدوای من هەل نەگەڕێنەوە بۆ کوفرو هەندێکتان بدەن لەگەردنی هەندێکتان واتە جەنگو کوشتاری یەکتری بکەن. وەرگێڕ.

هەروەها وەکو سوێند خواردن بەغەیری خوا، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك}([154]).

خوای گەورە ئەنجامدەری گوناحی گەورەی بەبڕوادار داناوە، ئەوەتە دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ﴾([155]). بکوژ(ألقاتل) لەکۆمەڵی بڕواداران ناچێتە دەرو بڕوادارە، و خوا کردویەتی بەبرای خزمو کەسو کارو سەرپەرشتیاری کوژراوەکە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ}([156]). بێگومان لێرەدا مەبەست لەبرایەتی ئایینیە. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ﴾([157]). هەتا فەرمودەی خوای گەورە:﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾([158]). تەواو

---

([154]) أ ـ رواه الترمذي وحسنه وصححه الحاكم.

ب ـ واتە: هەر کەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات کافر بوە یان هاوبەشی داناوە بۆ خوای گەورە. وەرگێڕ.

([155]) أ ـ سورة البقرة: (١٧٨).

ب ـ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە خوای گەورە تۆڵەی کوشتنی لەسەر فەرز کردون. وەرگێڕ.

([156]) أ ـ سورة البقرة: (١٧٨).

ب ـ واتە: ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، یەکێك لەو کەسانەی کەمافی تۆڵە سەندنەوەی هەیە وەکو برای کوژراوەکە لێ ی خۆش بوو بەوەرگرتنی خوێن ڕازی بو، ئەوە دەبی ئەوانی تر لەخزمانی کوژراوەکە بەمە ڕازی بنو واز بهێنن، چونکە هەقی تۆڵە سەندنەوەیان نامێنێتو دەبی بەو خوێن وەرگرتنە قایل بن. هەروەها دەبێ کەسو کاری کوژراوەکە خوێنەکە بەلەسەرخۆییو هێدی وهێمنانە وەربگرنو هەڵشەیی نەکەنو کابرا تەنگەتاو نەکەن، هەروەها لەسەر بکوژەکەش پێویستە پەلە بکات لەپی دانی ئەو پارەی خوێنەی کەبۆی دانراوە و بەزوترین کاتو بەخۆشیەوە بیداتو کەمتەر خەمی لێ نەکات. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو کە ڕێگەتان پێدراوە کەخوێن بدەن لەبری تۆڵە سەندنەوە واتە کوشتنەوەی بکوژەکە ڕەحمەتو ئاسانکاریەکە لەخوای گەورەوە بۆتان کراوە ، بەڵام دوای قایل بون بەوەرگرتنی پارەی خوێنەکە قایل بوو وەری گرتو دوایش دەست درێژی کردو کابرای بکوژەکەی کوشتەوە ئەوە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە سزایەکی زۆر بەئێشو ئازارو بەسفت و سوێ ی دەدات. وەرگێڕ، لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل٧٠.

([157]) أ ـ سورة الحجرات: (٩).

ب ـ واتە: ئەگەر دو دەستە یا دوگروپ لەبڕواداران بەشەڕ هاتنو کوشتاری یەکتریان کرد سوڵحیان لەنێواندا بکەنو بۆیەکیان بێننەوەو ئاشتیان بکەنەوە. وەرگێڕ.

([158]) أ ـ سورة الحجرات: (١٠)..

لەشەرحی(الطحاوية) بەکورت کردنەوە ([159]): وەکورتەی جیاوازیەکانی نێوان کوفری گەورو کوفری بچوك لەم چەند خاڵانەدا کورتیان هەڵ دێنین:

١ـ کوفری گەورە پێ ی لەئایین دەردەچیت،و کردەوە چاکەکانت ڕەش دەکاتەوە. بەڵام کوفری بچوك پێ ی لەئایین دەرناچیتو کردەوەکان ڕەش ناکاتەوە، بەڵام بە گوێرەی ڕێژەی کوفرەکە پلەی کردەوەکان دادەبەزێت، خاوەنەکەی دوچاری سزاو دەکات.

٢ـ کوفری گەورە خاوەنەکەی بۆ هەمیشەیی و بەنەمری لەئاگری دۆزەخدا دەهێڵێتەوە، بەڵام کوفری بچوك ئەگەر خاوەنەکەی بچێتە ناو ئاگرەوە بەهەمیشەیی پێ ی دا نامێنێتەوە، لەوانەیە خوای گەورە تۆبەی لی وەربگرێتو هەر نەشچێتە ناو ئاگرەوە.

٣ـ کوفری گەورە خوێنو سەرو ماڵی خاوەنەکەی حەڵاڵ دەکاتو ڕێگەی پێ دەدات، بەڵام کوفری بچوك خوێنو ماڵی خاوەنەکەی حەڵاڵ ناکاتو ڕێگەی پی نادات.

٤ـ کوفری گەورە دوژمنایەتی نیاز پاکانە لەنێوان خاوەنەکەی‌و بڕواداراندا پێویست(واجب) دەکات، بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بۆ بڕوادران کەهەرگیز خاوەنی کوفری گەورەیان خۆش بوێتو مەیلیان بۆی هەبێت هەر چەندە لەنزیك ترین کەسەکانی خۆشی بێت، بەڵام کوفری بچوك خۆشەویستی‌و دۆستایەتی نەکردن بەڕەهایی قەدەغە ناکات، بەڵکو دۆستایەتی‌و خۆشەویستی بڕوادارانی بۆ هەیە بەگوێرەی ڕیژەی بیرو باوەڕەکەی‌و چەندە زۆر ترو بەهێز تر بێت پێویستە ئەو دۆستایەتی‌و خۆشەویستیەش پترو بەهێز تر بێت، هەروەها ڕق لێ بونەوەو دوژمنایەتی کردنیشی هەر بەپێ کەمی‌و زۆری ڕێژەی ئیمانو باوەڕەکەی‌و سەپێچیەکانی دەبێت.

---

ب ـ واتە: بڕواداران هەمویان برای یەکترین، دەی کەناخۆشی کەوتە نێوانیانەوە سولحو ئاشتەوایی لەنێوان براکانتاندا بکەن.و ئاشتیان بکەنەوە. وەرگێڕ.

([159]) لاپەڕەی(٣٦١) چ نوسینگەی ئیسلامی(ط المکتب الإسلامي).

## بەشـــی چوارەم:

## دو ڕوویی(النفاق): پێناسەکەی، جۆرەکانی

أ ـ پێناسەکە:

دو ڕوویی لەزماندا: چاوگی(نافق ـ دو ڕوویی کرد)نـە، دەگوترێـت(نافق ينافق ومنافقة) وەلـە وشـەی(النافقاء) کەیەکێکـە لـەدەرگاو شـوێنی دەرچـون لـەکونی جرج کەدەیشـارێتەوەو ئەوانی تری دەردەخات، ئەگەر لەو دەرگای کونەدا بەدوای دا گەڕان بـەودەرگای تـری دا دەردەچێتو ڕا دەکات، هـەروەها دەڵـێن لـە( النفـــق ـ تـونێڵ یاگونجە کـەخۆی تێدا دەشارنەوە([160]).

بـەڵام دو ڕوویی(النفـــاق) لـەزاراوەی شـەرعدا واتـا: دەرخسـتنی ئیسلامو خێـرو چاکە بەڕواڵـەتو لەسـەرەوە، پـەنهان کردنـی کـوفرو شـەڕو خراپـەکاری لـەژێرەوە یالەبنـەوە، بۆیەش بەم ناوە نـاو نـراوە چـونکە لەدەرگایەکـەوە دەچـێتە نـاو شـەرعو لەدەرگایـەکی ترەوە دەردەچێت، لەسەر ئەمەیە کەخوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ سورة التوبة: (٦٧) . واتە لەشەرع دەرچون.

هەروەها خوای گەورە دوڕوەکانی بەخراپ تر لەکافرەکان داناون، ئەوەتە دەفـەرموێت :﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّـارِ وَلَـن تَجِـدَ لَهُـمْ نَصِـيرًا﴾([161]). هـەروەها دەفەرموێت:﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ ﴾ سورة النساء: (١٤٢). (واتە: ئەو دوڕوانە بەئاقڵی خۆیان فێڵ لەخوا دەکەنو خوا دەخەڵەتێنن، بەڵام نەخێر ئەوانە خۆیـان دەخەڵەتێننو فێڵ لەخۆیان دەکەن چونکە خوای گـەورە هـەمو نهێنـیو پەنهانیـەکانی لا دیارەو لی ی گوم نابنو سزای توندو تیژیان دەداتەوە. وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێت:﴿ يُخَادِعُونَ اللّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ﴾([162]).

---

([160]) النهاية لابن الأثير(٥/ ٩٨) بەواتای خۆی(بمعناه).

([161]) أ ــ سورة النساء: (١٤٥).

ب ـ واتە: دوڕوەکان لەبنی بنەوەی ئاگری دۆزەخ دان. وەرگێڕ.

([162]) أ ــ سورة البقرة: (٩).

ب ـ واتە: ئەو دو ڕوانە بەعەقڵی خۆیان خواو بڕوادارانیان خەڵەتاندوەو فێڵیان لێ کردون، بەڵام نەخێر ئەوانە لەڕاستی دا نەفسی خۆیان هەڵ خەڵەتاندوەو هەستیش بـەخۆیان ناکـەن چـونکە خـوای گـەورە پێغەمبـەرﷺوبڕواداران ئاگادار

ب ـ جۆرەكانی دو ڕویی:

دو ڕویی دو جۆری هەن:

جۆری یەكەم: دو ڕویی بیروباوەڕی(الإعتقادی): ئەمەش بریتیە لە دوڕویی گەورە كەخاوەنەكەی موسڵمان بونی خۆی بەڕواڵەت ڕادەگەیەنێت، بەڵام لەژێرەوەش لەدڵ دا كافرەو كافر بونی خۆی دەشارێتەوە، ئەم جۆرە دوڕوییە بەتەواوی خاوەنەكەی لەئایین دەردەكات، و خاوەنكەی لەبنكی بنەوەی ئاگری دۆزەخ دایە، خوای گەورە ئەهلی ئەو جۆرە دوڕوییەی بەهەمو سیفەتە شەڕەنگێزیەكان وەسف كردوە: لەكوفرو بڕوا نەبون، وگاڵتە كردن بەئایینو بەبڕواداران، بەسوك سەیر كردنو تێز پێ كردنیان، و مەیلو خۆشەویستیو دۆستایەتی كردنی تەواوی دوژمنانی ئایینی ئیسلام، بەهۆی بەشداری كردنو هاریكاری كردنی كافران لەدوژمنایەتی كردنی ئیسلامدا. دیارە گومانی تێدا نیە كەئەم دو ڕوانە لەهەمو كاتو سەردەمو زەمینەیەكدا هەن، بەتایبەتیش لەكاتێكدا كەهێزو دەسەڵاتی ئیسلام زۆر دەبێتو توانای بەرگری كردنی ڕواڵەتیان نابێتو ناتوانن لەبەرامبەری موسڵماناندا بەئاشكرا بوەستن، ئەوا ئەو كاتە ئیسلام بونی خۆیانو بەدرۆ پابەند بونی خۆیان بەئایینیو موسڵمانیەتی خۆیان دەردەخەن ، لەپێناو فێل كردن لەئیسلامو لەبڕواداران لەپەنهانی دا واتە لەسەرەوەوە موسڵمانو لەدڵیشدا بێباوەڕ، بۆ ئەوەی لەگەل موسڵماناندا بژیەنو لەسەرو ماڵو بەرژەوەندیەكانیشیان ئەمین بن، دو ڕوان بڕوا بونی خۆیان بەخواو بەفریشتەكانو بەكتێبەكانو بەپێغەمبەرانو بەڕۆژی دوایی دەردەخەنو ڕادەگەیەنن هەر كاتێك بی دەسەڵات بونو توانای بەرگری كردنیان ڕو بەڕو لەگەڵ موسڵماناندا نەبو، بەڵام لەبنەوەو لەدڵ دا ئەو بڕوا بونەیان بەتەواوی لەدڵو دەرونی خۆیان داڕنیوەو بڕوایان بەهیچ كامێك لەوانەی كەباسمان كردن نیەو درۆزنن. نەبڕوای بەخوا هەیەو، نەبڕوای بەوە هەیە كەخوای گەورە بەقسەو گفتار قسەی كردوەو بۆ ئادەمیزادی ناردۆتە خوارو كردویەتیە پێغەمبەری خۆی بۆ ئەوەی پەیامەكەی خوایان

---

دەكاتەوە لەو دو ڕوییەی وا لەدڵیاندایەو خوای گەورە هیچ شتێكی لێ ون نابێت، ئەوانە دڵەكانیان نەخۆشە كەنەخۆشی دو ڕوییەو خوای گەورە نەخۆشی دڵی یان پتر دەكاتو لەڕۆژی دوایشدا ئازارێكی زۆر بەئێشو توندیان دەدات بەهۆی ئەو درۆیە زلە بێ ئابڕوییەی كەلەگەڵ خوایاندا كردوە. وەرگێڕ.

پێ ڕابگەیەنێت‌و ڕێگەی ڕاستی خوا پەرستشی‌و چۆنیەتی بەندایەتی کردن نیشانی خەڵکی بدات‌و دەستی خوڵکی بگرێت‌و ڕێنومایيان بکات بۆ ڕێگەی هیدایەتی خوا لەسەر مۆڵەت‌و ئیزنی خوای گەورە، وەبیان ترسێنێت لەتورەیی و لەسزای خوا، خوای گەورە پەردەی لەڕوی ئەو دو ڕوانەدا هەڵ ماڵیوەو هەمو نهێنیەکانی ناو دڵیانی لەقورئانی پیرۆزدا ئاشکرا کردوە، وە هەمو هەڵس‌و کەوت‌و کاروبارێکی بۆ بەندەکانی خۆی دەرخستوەو هەمو شتێکی شاراوەو پەنهانەکانی ئەو دوڕوانەی پەردە لەسەر هەڵماڵیون‌و هەرچی لەبن بەرەیان دا شارد بۆوە هێنانیە سەر بەرەی، بۆ ئەوەی موسڵمانان لەدو ڕویی‌و لەئەهلی دوڕوان ئاگادارو وریا بنۆ خۆیانیان لێ بپارێزن. لەسەرەتای سورەتی (البقرة)دا هەر سێ دەستەکانی باس کردون: بڕواداران، کافران، و دو ڕوان، بڕوادارانی لەچوار ئایەتدا باس کردون‌و کافرانیشی لەدو ئایەتدا باس کردون، و دو ڕوانیشی لەبەر زۆریان‌و لەبەر دوچار بونی ئادەمیزادەکان بەگشتی (عمـــوم) بەم سیفاتە قێزەونە لە سێزدە ئایەتدا باس کردون، هەروەها لەبەر زۆری و توندو تیژی‌و تەوژمی فیتنەو ئاشوبی ئەو دو ڕوانە لەسەر ئیسلام‌و موسڵمانان، کۆست‌و کارەساتەکانی ئیسلام کەبەهۆی ئەو دوڕوانەوە توش دەبن گەلێك زۆر و بەهێزو گرچو بڕن، چونکە ئەوانە بەڕواڵەت لەناوخۆ دان‌و بەشێکن لەئیسلام‌و سەر خستن‌و خۆشەویستی ودۆستایەتی کردنی موسڵمانان، بەڵام لەڕاستی دا ئەوانە دوژمنانی سەر سەختی ئیسلام‌و موسڵمانانن، چونکە لەهەمو قالبێك دا دوژمنایەتی‌و بوغزی خۆیان بەرامبەر موسڵمانان دەردەبڕن بەڵام بابای نەزان‌و نەفام کەنایان ناسێت وا دەزانێت ئەمە زانست‌و چاکخوازی‌و ئیسلاحە، کە ئەمە ئەو پەڕی نەفامی‌و خراپەکاریە(الإفساد)([163]).

## وەئەم دو ڕوییە شەش جۆرن([164]):

١. بەدرۆ خستن‌و بڕوا نەکردن بەپێغەمبەرﷺ.

٢. بەدرۆخستنی بڕوا نەکردن بەهەندێ لەو پەیامەی کەپێغەمبەرﷺهێناویەتی.

---

([163]) لەنامیلەیەك کەهی(إبن القیم) ە لە ڕونکردنەوەی سیفاتەکانی دوڕوان.

([164]) مجموعة التوحيد النجديةص٩.

٣. ڕق بونەوە لەپێغەمبەرﷺ.

٤. ڕق بونەوە لەهەندێ لەو پەیامەی کەپێغەمبەرﷺهێناویەتی.

٥. سور بونو مکوڕ بونیان لەسەر نزم کردنو کەم کردنەوە لەپلەو پایەی ئایینی پێغەمبەرﷺو سوکایەتی پێ کردنی.

٦. پێ ناخۆش بونو تەنگە تیلکە بون واتە ڕق هەستانو پێ ناخۆش بونیان بەسەرکەوتنی ئایینی پێغەمبەرﷺ کەئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

جۆری دوەم: دو ڕویی کردەکی(العملي): بریتیە لەکردنی شتێك لە کردەوەکانی دو ڕوان، لەگەڵ مانەوەو جێگیر بونی باوەڕ لەدڵ دا، ئەم جۆرە پێ ی لەئایین دەرناچێت، بەڵام هۆکلرێکی خراپە بۆ گەیشتن بەو دو ڕوییە، خاوەنەکەی باوەڕو دو ڕویی لەدڵ دایە، وەئەگەر بەرەو پتری چوو زۆر بو، ئەوا بەم هۆیەوە دەبێتە دو ڕوی پوختە(خالص)، بەڵگەش ئەم فەرمودەی پێغەمبەرەﷺ {أربعٌ من كنَّ فيه كان منافقاً خالصاً، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها، إذا أئتمن خان، وإذا حدث كذب، وإذا عاهد غـــادر، وإذا خاصم فجر}([١٦٥]). جاهەر کەسێك ئەو چوار سیفاتەی تێدا کۆ ببنەوە ئەوە بەڕاستی شەڕو خراپەکاری تێدا کۆ بۆتەوەو سیفاتەکانی دوڕوانی تێدا گرد بونەتەوەو دو ڕوێکی کاکڵەیە، وەهەر کەسێك یەکێك لەو سیفاتانەی تێدا بێت، ئەوە سیفەتێکی دو ڕویی تێدایە، زۆر جار هەیە لەوانەیە بەندە سیفەتی چاکی تێدا بێت، وەسیفەتی خراپو شەڕیشی تێدا بێتو سیفەتی باوەڕی تێدا بێت، وە سیفەتی کوفرو دو ڕویشی تێدا بێت، و شایستەی پاداشتو سزاش بێت بەگوێرەی تێدا بونی ئەم سیفاتانە.

هەروەها لەسیفەتی دو ڕویی: کەمتەر خەمیو تەمەڵی کردن لەئەنجامدانی نوێژ بەکۆمەڵ(الجماعة) لەمزگەوتدا. گومانی تێدا نیە کەئەمەش یەکێکە لەسیفاتەکانی دو ڕوان، وە دو ڕویی خراپ واتە شەڕ، گەلێك ترسناكو مەترسیدارە، هاوەڵان زۆر زۆری لێ دەترسان کەتێ ی بکەون، و زۆریان خۆ لێ دەپاراست، إبن أبي مليكة گوتویەتی: (أدركت ثلاثين من أصحاب رسول اللهﷺ كلهم يخافون النفاق على نفسه)([١٦٦]).

---

([١٦٥]) أ ــ متفق عليه.

([١٦٦]) واتە: سی لەهاوەڵانی ڕەسولﷺم بینین هەر هەمویان دەترسان کەدوڕویی لەنەفسی خۆیاندا هەبێت. وەرگێر.

**جیاوازی لەنێوان دو ڕویی گەورەو دو ڕویی بچوك دا :**

١ـ دو ڕویی گەورە لەئایین دەردەچێت، بەڵام دو ڕویی بچوك لەئایین دەرناچێت.

٢ـ دوڕویی گەورە: جیاوازی پەنهانیو ئاشکرایی لەبیروباوەڕدایە، دوڕویی بچوك: جیاوازی پەنهانیو ئاشکرایی لەکردەوەدایە نەك لەبیرو باوەڕ.

٣ـ دوڕویی گەورە لەبڕوادارەوە دەرناچێت، بەڵام دوڕویی بچوك لەبڕوادارەوە دەردەچێت.

٤ـ دوڕویی گەورە زۆربەی وایە خاوەنەکەی تۆبە ناکات، وەئەگەر تۆبەشی کرد جیاوازی هەیە لەقبوڵ کردنی تۆبەکەی لای حاکم. بەپێچەوانەی دوڕویی بچوك، تۆبە لای خوا دەکاتو خواش تۆبەکەی لا وەردەگرێت، شێخی ئیسلام إبن تیمیة [١٦٧] گوتویەتی:(زۆر جار هەیە بڕوادار دوچاری لقێك لەلقەکانی دوڕویە دەبێت، دوایی تۆبە دەکات، لەوانەشە هەندێ لە شتانە بگەڕێتەوە سەر دڵی کەدوڕویین بەڵام خوای گەورە لێ ی لادەداتو ڕزگاری دەبێت، هەروەها بڕوادار توشی خوت خوتە واتە وەسوەسەی شەیتان دەبێت، وە بەوەسوەسەی کوفر بڕوادار سینگی تەسكو تەنگەبەر دەبێت، هەروەکو هاوەڵان دەیان گوت:ئەی ڕەسولی خوا جاری وایە یەکێك لەئێمە شتی وای بەسەر دڵو دەروندا دێت حەز دەکات لەئاسمانەوە فڕی بدرێتە خوار نەك ئەو قسەیە بکاتو دەری ببڕێت، پێغەمبەرﷺفەرموی: {ذلك صريح الإيمان}[١٦٨]. وەلەڕیوایەتێکی تردا: زۆری پێ گەورەو ئەستەمە کەبیڵێتو دەری ببڕێت، پێغەمبەرﷺفەرموی: {الحمد لله الذي ردَّ كيده إلى الوسوسة}، واتە توش بونی وەسوەسە، لەگەڵ ئەم هەمو پێ ناخۆشیەزۆرو گەورەیەشدا، وەلادانو فڕێدانی لەدڵ دا، ئەوە گومانی تێدا نیە کەئەوە کاکڵەو پوختەی ئیمانە) ..تەواو.

بەڵام ئەهلی دوڕویی گەورە، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت:﴿ صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ﴾ سورة البقرة: (١٨). (واتە: ئەوانە کەڕن، هیچ ڕاستیەك نابیستنو ئەوانەشی لاڵن قسەیان پێ ناکرێتو داوای ڕاستی ناکەنو ئەوانەشی کوێرن هەرگیز شت نابینن تاڕاستیەکان بەچاوی خۆیان ببینن، بۆیە هەرگیز لەسەرکەشیو بێباوەڕی خۆیان ناگەڕێنەوە چونکە

---

([١٦٧])بڕوانە: كتاب الإيمان، ص٢٣٨.

([١٦٨]) أ ـ رواه أحمد ومسلم.

ب ـ دەی ئەوە کاکڵەو پوختەی باوەڕە واتەئیمانە. وەرگێڕ.

باوەڕەکەیان ئەوەندە پتەو نەبوە تابەری بای بەهێزو مەزنی بیروباوەڕە چەوتو گومانەکانیان بگرن. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١٠ )

واتە بۆ ئیسلام لەپەنهانی دا. هەروەها دەربارەیان دەفەرموێت:﴿ أَوَلاَ يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لاَ يَتُوبُونَ وَلاَ هُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾[169].

شێخی ئیسلام إبن تيمية گوتویەتی:(زانایان جیاوازن لەوەرگرتنی تۆبەکەیان لە ڕواڵەتدا، لەبەر ئەوەی کەنازانرێ‌و نادیارە، چونکە ئەو دو ڕوانە هەمیشە لەسەرەوەو لە ڕودا موسڵمانێتی خۆیان دەر دەبڕن)[170].

---

(169) أـ سورة التوبة: (١٢٦).

ب ـ واتە: ئایا ئەو دو ڕوانە نابینن کەهەمو ساڵێك جارێك یان دو جار بەتاقی دەکرێنەوەو بەڵاو ناخۆشیان بەسەر دێت بێ هێز دەبن‌و تێ دەشکێن‌و سەرشۆڕ دەبن بەهۆی ئەم دو ڕویەیان کەخوای گەورە ئاشکرای دەکات بۆ پێغەمبەرو بڕوادارانی ڕون دەکاتەوە کە ئاگاداری فرت‌و فێڵەکانیان بن، ئەو نەهامەتی‌و بەڵایانەی کەدێت بەسەریاندا خۆی لەخۆی دا نیشانەو بەلگەیەکی ڕونە لەسەر ڕاستی ئایینی ئیسلام‌و پێغەمبەرەکەی، بەڵام ئەوان هەرگیز تۆبە ناکەن‌و تۆزێ هۆش ناهێننەوە بەر خۆیان‌و هەرگیز بیرو هۆشیان ناخەنە گەڕوو ڕاستیەکان نابیستن‌و هەرگیز واز لەو دوڕەییەیان ناهێنن. تەفسیری گوڵشەن ب١ل٥٠٩. وەرگێڕ.

(170) بڕوانە: مجموع الفتاوى(٢٨/٤٣٤ـــ٤٣٥).

## بەشی پێنجەم

### ڕونکردنەوەی ڕاستەقینەی هەر یەکێ لە:

### نەفامیو نەزانیو ناحاڵی بون (الجاهلية) ـ دەرچون لەدینو خراپەکاری (الفسق) ـ گومڕاییو سەرلێشێواوی (الضلال) ـ هەڵ گەڕانەوە لەدین (الردة): بەشەکانی، حوکمەکانی.

**١ـ نەفامیو ناحاڵی بون:**

ئەو حاڵەتە بو کەعەرەب لەسەری بون لەپێش ئیسلام، لەنەفامیو نەزانیو سەرکەشیو کەللە ڕەقی بەرامبەر بەخواو بەپێغەمبەرانی، وەشەریعەتو یاساو ڕێسا ئاینیەکان، و نازین بەنەژادی باوکو باپیرانیان، و خۆبەزل زانیو خۆبەدەسەڵات زان(التجبر)، وئەمانەو گەلێ سیفاتی تر(١٧١)، کەهەمویان سیفاتی نەفامینو دژو پێچەوانەی زانینو بەرچاو ڕۆشنیوزانستو زانیارین، یاخود پشت تێ کردنوشوێن نەکەوتنی زانستو زانیاری، شێخی ئیسلام إبن تيمية گوتویەتی:(هەرکەسێك کەهەقو ڕاستی نەبیستێو گوێ ی بۆ نەگرێتو نەیناسێت ئەوە نەفامو نەزانێکی سادەوساویلکەیە، بەڵام ئەگەر بڕوای بەناکۆکیو جیاوازیەتی هەق هەبو ئەوە نەزانونەفامێکی ئاوێتەیە(جهلاً مركباً)، ئەگەر گوتی پێچەوانەی هەق زانایە بەهەق، یانازانایە، ئەوە دیسانەوە هەر نەزانو نەفامە، ئەگەر ئەمە ڕون بوەوەو خەڵکی لەپێش ناردنی پێغەمبەرﷺلەنەفامیو نەزانی دا بونو سەر بەنەفامی بون، ئەوە ئەوەی کەلەسەری بون لەگفتارو ئاخاوتنو کردەوەکان، نەفامو نەزان بۆی دروست کرد بون، و پیشەی نەزانو نەفامەو نەزانو نەفام ئەنجامی دەدات، هەروەها هەمو ئەوانە ئەنجامی دەدەن کەپێچەوانەو جیاواز بون لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕەوانە کراوانی خوادا، لەجولەکەکانو گاورەکان، ئەوە نەفامیو نەزانیە، ئەوەی پێش ئیسلامیش نەفامیەتی گشتی بو.

بەڵام لەدوای ناردنی پێغەمبەرﷺ نەفامی لەشوێنێکولەوڵاتێکدا هەیە، ولەشوێنێکی ترو لەوڵاتێکی تردا نیە، هەروەکو ئێستا لە خانەو لانەی کافراندا هەیەو بەچاوی خۆمان دەیبینین، وەلەوانەیە لەکەسێك دا هەبێتو لەکەسێکی تردا نەبێت وەك ئەو کەسە پێش ئەوەی موسڵمان ببێت ئەوە لەنەفامی دایە، وەئەگەر لەخانەو لانەی ئیسلام

---

(١٧١) النهاية لابن الأثير(١/٣٢٣).

دابودوای ناردنی محمدﷺ نەفامی نیە، بەڵام لەکاتی ڕەهادا، هێشتاکو لەئوممەتی محمدﷺ دەستەو گروپ هەن کەلەسەر هەق و ڕاستی دەڕۆن هەتاکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەمێنن، وە نەفامیەتی پابەند(الجاهلية المقيدة) لەهەندێ لەوڵاتانی موسڵماناندا هەیە، هەروەها لە زۆرێك لەكەسانی موسڵماناندا ئەم نەفامیو نەزانیە هەیە، هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {أربع في أمتي من أمر الجاهلية...}([172]). هەروەها بەأبي ذری فەرمو: {إنك امرؤ فيك جاهلية}([173]).وەهەروەها لەم جۆرانە)([174]). تەواو.

کورتەی ئەمە: نەفامی: بەگەڕاندنەوەی بۆ نەفامیو نەزانی، بریتیە لەنەبونی زانستو زانیاری واتە نەزان، وەدەکرێت بەدو بەشەوە:

١ـ نەفامیەتی گشتی(الجاهلية العامة): بریتیە لەو نەفامیو نەزانیەی کەلەپێش ناردنی پێغەمبەرﷺ هەبوو بەناردنی ئەو کۆتایی هات.

٢ـنەفامێتی تایبەت(جاهلية خاصة) بەهەندێ لەدەوڵەتان،و هەندێ لەوڵاتان، وهەندێ لەكەسان(الأشـــخاص)، ئەم جۆرەیان هێشتاکو هەر هەیەبەمە ئەو هەڵەیەمان بۆ دەردەکەوێت کەلەم سەردەمەدا ئەو نەفامیە بەگشتگیری باس دەکەنو دەڵێن: نەفامیەتی ئەم سەدەیەیانەفامیەتی سەدەی بیستەم، ولەم شێوانە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە بگوترێ: نەفامیەتی هەندێ لەخەڵکی ئەم سەدەیە، یازۆربەی خەڵکی ئەم سەدەیە، بەڵام بەگشتگیر کردن ئەوە ڕاست نیەو دروست نیە، چونکە بەناردنی پێغەمبەرﷺ نەفامیەتی گشتی کۆتایی هاتو نەما.

**٢ـ دەرچون لەدینو خراپەکاری(الفسق):**

لەدین دەرچون(الفسق) لەزماندا: واتە دەرچون(الخروج)،وەمەبەست پێ ی دەرچونە لە شەریعەتدا: دەرچون لەگوێ ڕایەڵیو بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، و ئەم دەرچونە

---

([172]) أـــ رواه مسلم.

ـ واتە: لەئوممەتی مندا چوار شت یاسیفات هەن کە سیفاتی نەفامین. وەرگێر.

([173]) أ ـــ في الصحيحين.

ب ـ واتە: ئەی أبی ذر تۆ پیاوێکی سیفەتی نەفامیت تێدایە. وەرگێر.

([174]) اقتضاء الصراط المستقيم(١/٢٢٥ـــ٢٢٧) تحقيق الدكتور ناصر العقل.

دەرچونی گشتیو تەواو لەهەمو بوارەکان دەگرێتەوە، بۆیە بەکافر دەگوترێ: لەئایین دەرچو واتە(فاسق)، بەلاّم لەدەرچونی بەشی یاهەندی(الجزئـــي) دا، بەبابای بڕواداری ئەنجام دەری گوناحێك لەگوناحە گەورەکان دەگوترێت: گوناحکار یاخراپەکار(فاسق).

دەی کەواتــە لــەئایین دەرچــون یاخراپــەکار دو جــۆرن: دەرچــونێك کــەئایینی لیّ دادەڕندرێت کەئەمە کوفرە، ئەوە پیّ ی دەگوترێت کافری لەئایین دەرچو، هەروەکو خوای گەورە باسی ئیبلیسی کرد کەدەفەرموێ:﴿ فَفَسَقَ عَــنْ أَمْــرِ رَبِّــهِ ﴾([175]). ئەم دەرچونەی لەفرمانی خوا کوفر بو.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَأَمَّا الَّــذِينَ فَسَــقُوا فَمَــأْوَاهُمُ النَّــارُ﴾ مەبەستی کافرەکانە، کەئەم فەرمایشتەی لەهەمان ئایەتدا ئەم مەبەستە دەگەیەنێت:﴿ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ}([176]).

ئەنجامدەری گوناحی گەورە لەناو موسڵماناندا بەئایین دەرچو(فاســق) نـاو دەبرێت، بـەلام ئـەم گوناحکـاریو دەرچـونەی لـەئایینی ئیسـلام دەری ناکـات واتـە ئەنجامـدانی گونـاحی گـەورە لـەئایینی دەری ناکـات، خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿وَالَّــذِينَ يَرْمُــونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُــمْ شَــهَادَةً أَبَــدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾([177]).هـەروەها دەفـەرموێت:﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَرَضَ فِــيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ ﴾ سورة البقرة: (١٩٧).

([175]) أ ــ سورة الكهف: (٥٠).

ب ـ واتە: لەفرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو کافر بو، کاتیّ خوای گەورە فرمانی پیّ کرد سوژدەی ڕێز بۆ ئادەم بەرێت خۆی بەزل زانیو فرمانی خوای بەجیّ نەکەیاندو گوتی: من لەئادەم باشترم . ئادەم لـەقوڕ دروست کراوەو من لەئاگر. ئیدیّ بەم ملهوڕیەی لەدین دەرچو واتە کافر بو. وەرگێڕ.

([176]) أ ــ سورة السجدة: (٢٠).

ب ـ واتە: ئەوانەی لەخوا یاخی بونو لەئایین دەرچون کەمەبەستی لەکافرەکانە جێگەو شوێنی حەوانەوەیان ناو ئاگری دۆزەخە هەر کاتێك بیانەوەی لەو ئاگرە بێنە دەر دەیان گێڕنەوەو دەیان خەنەوە ناو ئاگرەکەو بەتێزەوە پیّ یان دەڵێن: دەی دەبچێژن سزای ئەو ئاگرەی کەلەدنیادا لیّ ی دەترسینران کەئەگەر لەئایینی خوا دەر بچن سزای ئەوە ئاگرە دەچێژن بەلاّم ئێوە باوەڕتان پیّ ی نەبو دەتان گوت ئەوە درۆیەو شتی وا هەرگیز نیە. وەرگێڕ.

([177])أ ــ سورة النــــور: (٤).

لێرەدا زانایان لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتویانە: مەبەستی لەسەر پێچیو یاخی بونە([178]).

۳ـ گومڕاییو سەر لێشێواوی(الضلال):

گومڕایی: لادان لەڕێگـەی ڕاسـت، کەپێچـەوانەوەو دژی ڕێنومـاییو هیدایەتـە، خـوای گەورە دەفەرموێت:﴿مَّنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ﴾([179]).

وەسەرلێشێواویو گومڕایی(الضلال) بۆ گەلێك واتا بەكار دەهێنرێت:

۱ـ جارێك بۆ کوفر دەهێنرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِاللّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ سورة النساء: (١٣٦).

۲ـ وەجارێکیش بۆهاوەڵ دانان بەکار دێت، خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا ﴾ سورة النساء: (١١٦).

۳ـ وەجایێکی تریش بۆ سەرپێچی کردنی لەژێر کوفرەوە بەکار دێت، هەروەکو دەگوترێت: گروپە گومڕاکان: واتە سەرپێچیو لاساری کارانو سەرکەشانو کەللە ڕەقان.

٤ـ وەجارێکیش بۆ هەڵە کردنو گونـاح کـردن بـەکار دێـت، وەك قسـەی موسا ـ سـەلامی خوای لەسەر بێـت ـ:﴿ قَالَ فَعَلْتُهَا إِذًا وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ﴾ سورة الشعراء: (٢٠). (واتـە: بـەڵێ ئەم کارەم کردو من ئەو کات نەزانو نەفام بومو هێشتا نەبوبومە پێغەمبـەری خـوا. وەرگێڕ لەتەفسیری گوڵشەن ب٢).

٥ـ وەجارێکیش بۆ لەبیر چون(النسيان) بەکار دێت، لەوانە فەرمایشتی خوای گـەورە:﴿ أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى ﴾ سورة البقــرة: (٢٨٢).(واتـە: ئەگـەر یـەکێکیان لەبیری چوەوە ئەوی تریان بیری دەهێنێتەوە. وەرگێڕ).

---

ب ـ واتە: ئەو کەسانەی کەبوختان بەئافرەتانی داوێن پاك دەکەنو تاوانباریان دەکەن ئەگەر چوار شاهیدیان نەهێنا لەسەر ئەو قسەی کەدەیکەن ئەوە دەبی هەشتا دار شەللاقیان لێ بدرێت، وەلێرەش بەولاوە بەهیچ شێوەیەك شاهیدی ئیدی لێ وەرناگیرێت ، چونکە ئەوانە لەئایینی خوا دەرچونوخراپەکارن واتە فاسقن. وەرگێڕ. لەتەفسیری گوڵشەن ب٢.

([178])کتێبی (الإيمان) لەنوسینی شێخی ئیسلام إبن تيمية ل٣٧٨.

([179]) أ ـــ سورة الإسراء: (١٥).

ب ـ واتە: هەر کەسێك ڕێگەی هیدایەتو ڕاست بگرێت ئەوە بۆ نەفسی خۆیەتیو خۆی سودی لێ وەردەگرێت، وەهەر کەسێك ڕێگەی چەوتو سەرلێشێواویو گومڕایی بگرێت ئـەوە هەمیسـان خـۆی زیان دەکاتو دەبێ باجەکـەی بدات. وەرگێڕ.

٦ـ هەروەها بۆ سەر لێشێواوی‌و بۆ ون بون‌و نادیاری بەکار دەهێنرێت وەك: ون بون یابزر بونی وشتر([١٨٠]).

٤ـ پاشگەز بونەوە ـ بەشەکانی‌و حوکمەکانی:

پاشگەز بونەوە لەزماندا: گەڕانەوە یاهەڵگەڕانەوە(الرجــــوع)، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلاَ تَرْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ﴾ سورة المائدة: (٢١).(واتە: بەرەو دواوە هەڵ مەگەڕێنەوەو پشت لەفرمانی خوا مەکەن دەنا توشی زیان دەکەن‌و ڕەنجەڕۆ دەبن. وەرگێڕ).

وەپاشگەز بونەوە لەزاراوەی شەرعدا بریتیە لە: کوفر واتە گەڕانەوە بۆکافری دوای موسڵمان بون‌و هاتنە ناو بازنەی ئیسلامەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾([١٨١]).

بەشەکانی لەئایین هەڵگەڕانەوە: پاشگەز بونەوە بەئەنجامدانی دژێك لەدژەکانی یاهەڵوەشێنەرەوەیەك لەهەڵوەشێنەرەوەکانی کانی ئیسلام دێتە دی، هەڵوەشێنەرو دژەکانی ئیسلامیش زۆرن ئێمە لەم چوار خاڵانەی خوارەوەدا دەیان گوشین:

١ـ پاشگەز بونەوە بەقسە(القــــول):وەك جنێودان بەخوای بەرزو بێ هاوتا، یابەپێغەمبەرەکەی ﷺ، یا بەفریشتەکان، یابەیەکی لەپێغەمبەران، یابەپڕو پاگەندەی پێغەمبەرایەتی، یابەڕاست دانان‌و لایەنگیری‌و شوێنکەوتنی ئەو کەسانە کەپڕو پاگەندەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، یادوعاو پاڕانەوەو داوا کردن لەغەیری خوا، یاهانا بردن‌و داوا کردن لەشتانێکدا کەجگە لەخوای گەورە کەسی تر توانای جێ بەجێ کردنی ئەو شتانەی نیەو تەنیا لەدەسەڵاتی خوا دان، وەپەنا گرتن بەغەیری خوا لەو شتانەدا.

٢ـ پاشگەز بونەوە بەکردەوە(بالفعل):

---

([١٨٠])لە(المفردات) ی راغب وەرگیراوە.

([١٨١]) أ ــ سورة البقرة: (٢١٧).

ب ـ واتە: هەر کەسێك لەئێوە لەئایینەکەی خۆی کەئایینی ئیسلامە پاشگەز ببێتەوەو بەکافری بمرێت ئائەوانە کردەوەکانیان لەدنیاو لەقیامەتدا ڕەش دەبنەوەو بەفیڕۆ دەڕۆن‌و دەبنە هاودەم‌و هاوەڵ‌و دۆستی ئاگری دۆزەخ‌و بەهەمیشەیی‌و نەمری تیایدا دەمێننەوە. وەرگێڕ.

٣ـ پاشگەز بونەوە لەبیروباوەڕدا، وەك باوەڕ بون بەبونی هاوبەش بۆ خوای گەورە، یا باوەڕ وا بێت کەزیناو خواردنەوەی مەیو خواردنی سو(الربا) حەلاڵن، یا نان حەرامە، یا نوێژ کردن واجب نیە، (واتە حەلاڵ کردنی حەرامو حەرام کردنی حەلاڵ کەخوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی حەلاڵو حەرام کردون. وەرگێڕ) وگەلێکی تری لەم جۆرانە کەکۆڕای زانایان لەسەر حەلاڵ بونی یاحەرام بونیو واجب بونیەتی، بەکۆڕایەکی بڕاوەیی(إجماعـاً قطعیـاً) وەوێنەی ئەم کارانەش هەرگیز نابی پیشت گوێ بخرێتو لایان لێ نەکرێتەوەو بەهەند وەرنەگیرێن چونکە چارەنوسی ژیانی نەبڕاوەی ڕۆژی قیامەتیان پێوە بەندو توند گرێدراوە.

٤ـ پاشگەز بونەوە بەگومان کردن لەشتێکدا کەجوکمەی ڕابردوەو ئیدی بڕاوەتەوەو تێ پەڕیوە(لما سبق)، وەك گومان بون لەحەرام بونی هاوبەش دانان، یالەحەرام بونی زینا یامەی خواردنەوە، یاگومان بون لەحەلاڵیەتی نان، یاگومان بون لەپەیامی پێغەمبەرﷺیا پەیامی پێغەمبەرانی تری غەیری محمدﷺ، یاگومان بون لەبەڕاست زانینو بڕوا کردن بەپێغەمبەرﷺ، یاگومانی لەئایینی ئیسلامدا هەبێت، یاگومانی هەبێت کەئایینی ئیسلام بۆ ئەم سەردەمو زەمانە نەشێت.

٥ـ پاشگەز بونەوە بەواز هێنان(بالترك)، وەك ئەو کەسەی کەبەقەستی نوێژ واز لێ دەهێنێتو نایان کات، بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: {بین العبد وبین الکفر والشرك ترك الصلاة} ([182]). ئەمەو گەلێ بەڵگەی تر لەسەر کافر بونی واز هێنان لەکردنی نوێژەکان.

## ئەو حوکمانەی کەدوای چەسپانی پاشگەز بونەوە بەسەر ئەو کەسەدا ڕیز بەند دەبن ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ تۆبە کردنی پاشگەز بوەوە(إستتابة المرتد): ئەگەر تۆبەی کردو گەڕایەوە بۆ ئایینی خوا لەماوەی سێ ڕۆژدا، ئەوە لێ ی وەردەگیرێتو وازی لێ دەهێنرێت.

٢ـ ئەگەر قەدەغە بو کەتۆبە بکات، پێویستە(وجب) بکوژرێت، بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: {من بدّل دینه فاقتلوه}([183]).

---

([182]) أ ـــ رواه مسلم.
ب ـ واتە: جیاوازی نێوان بەندەو لەنێوان کوفرو هاوبەش دانان واز هێنانە لەکردنی نوێژەکان. وەرگێڕ.
([183]) رواه البخاري وأبوداود.
ب ـ واتە: هەر کەسێك ئایینەکەی خۆی بگۆڕێت ئەوە بیکوژن. وەرگێڕ.

٣ـ هەڵس و کەوتی ماڵەکەی خۆی لێ قەدەغە دەکرێت لەماوەی تۆبە کردنەکەی واتە دەستی بەسەردا دەگیرێت تاتۆبە دەکات، ئەگەر تۆبەی کرد ئەوە ماڵ ماڵی خۆیەتی دەیدرێتەوە، خۆ ئەگەر تۆبەی نەکردو پەشیمان نەبوەوە ئەوە ماڵەکەی دەبێتە ماڵی بودجەی موسڵمانان(بيت المال) لە کاتی کوشتنیەوە یاخود لەکاتی مردنیەوە بەهەڵگەڕاوەیی، وەگوتراوە: هەر لەکاتی پاشگەز بونەوەی لەئیسلام ماڵەکەی لەبەرژەوەندیەکانی موسڵماناندا خەرج دەکرێت.

٤ـ پچڕانی میرات لەنێوان ئەوو لەنێوان خزمەکانی دا، نەئەو میرات لەخزمانی دەگرێت و نەخزمانیشی میرات لەو دەگرن.

٥ـ ئەگەر مرد یان کوژرا لەکاتی هەڵگەڕاوەیی دا ناشۆرێت ونوێژیشی لەسەر ناکرێت و وەنەلەگۆڕستانی موسڵمانانیش دا دەنێژرێت، بەڵکو دەبێ لەگۆڕستانی کافراندا بنێژرێت، یاخود دەخرێتە ژێر گڵەوە جالەهەر شوێنێك بێت جگە لەگۆڕستانی موسڵمانان.

****** ******** *******



## دەرگـــای چوارەم

### گۆتەو کردەوەکان کە پێچەوانەو دژی تەنها خوا پەرستین یاخود لێ ی کەم دەکەنەوە.

ئەم بەشەش ئەم لقانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: دەم وەردان لەزانستی غەیب واتە غەیبزانی لەخوێندنەوەی لەپی دەستو فنجانو ئەستێرەگەری... تد.

بەشی دوەم: جادوگەریو شوێن هەلگریو غەیب زانی(الكهانة)..

بەشی سێ یەم: پێشکەش کردنی قوربانیونەزرو دیاری بۆ مەزارو نەزرگەو گۆڕی پیرو پیاو چاکانو بەگەورە زانینیان.

بەشی چوارەم: بەگەورە دانانو بەپیرۆز زانینی پەیکەرو بتە بیرەوەریەکان.

بەشی پێنجەم: گاڵتە کردن بەئاینو سوکایەتی کردن بەحورمەتەکانی.

بەشی شەشەم: حوکم کردن بەغەیری بەرنامەی خوا.

بەشی حەوتەم: پرو پاگەندە کردنی مافی یاسا دانانو حەلاڵ کردنو حەرام کردن بۆ مرۆڤ.

بەشی هەشتەم: خۆ خستنە پاڵ ڕێبازی گومڕایی، و گروپە نەفامەکان.

بەشی نۆیەم: دیدو بۆچونی ماددی بۆ ژیان(النظرة المادية للحياة).

بەشی دەیەم: نوشتەو گشتەك کردنو جادوگەری(الرقى والتمائم).

بەشە یازدەهەم: سوێند خواردن بەغەیری خوا، پاڕانەوەو هاناو پەنا بردنە بەر دروستکراوەکان بەغەیری خوای گەورە.

## بەشی یەکەم:

### دەم وەردان لەزانستی غەیب واتە غەیبزانی لەخوێندنەوەی لەپی دەستو فنجانو ئەستێرەگەری... تد.

مەبەست بەغەیب: ئەوەی لەخەڵکەوە دیار نیە لەکارو بارەکانی داهاتوو ڕابردوو وەئەو شتانەی کەنایان بینن، خوای گەورە ئەوانەی تایبەت کردون بەزانستو زانیاریەکانی خۆیەوە، هەروەکو لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت:﴿ قُل لاَ يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ ﴾([184]).

کەس غەیب نازانێت تەنیا خوای پاکو بێگەرد نەبێت بەتاکو تەنیا، وەلەوانەیە ئەوەی کەویستی لەسەر بوبێت لەغەیب نیشانی ڕەوانە کراوەکانی خۆی دابێت ئەویش لەبەر هەندێ حیکمەتو بەرژەوەندی ئایینی خوا، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ:﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا۞ إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ ﴾ سورة الجن: (٢٦ ـ ٢٧). واتە: هیچ کەسێك هیچ شتێك لەغەیبیەکانی خوا نازانێت تەنیا ئەوانە نەبێت کەبۆ پێغەمبەرایەتیو پەیامبەری خۆی هەڵی بژاردون، کەهەندێ لەزانستە غەیبیەکانی خۆی نیشانیان دەدا ئەگەر خۆی ویستو ئارەزوی لەسەر بێتو بەگوێرەی پێویستو بەرژەوەندیەکان، چونکە ئەوە موعجیزەو بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتیەکەی ئەوان، کەتیایدا هەواڵەکانی غەیب هەیە، کەخوای گەورە نیشانیان دەدات، جائەوە نێردراوی فریشتەو مرۆیش دەگرێتەوە، وەبێجگە لەوان کەسی تر نایزانن چونکە تەنیا پەیوەندە بەوانەوە ئەویش لەبەر بەرژەوەندی پەیامەکەیان(دلیل الحصر). جاهەر کەسێك پڕو پاگەندەی غەیبزانی بکات بەهەر هۆکارێك لەهۆکارەکان جگە لەپێغەمبەرانو پەیامبەران کەخوای گەورە هەڵی هاواردون، ئەوە ئەو کەسە درۆزنی کافرە، جاچ پڕوپاگەندەی ئەو غەیبزانیە بکات بەهۆی خوێندنەوەی لەپی دەست یاخود فنجان، چ بەهۆی غەیبزانیو جادوگەری بێت یان بەهۆی ئەستێرەگەری بێت، یان بەهۆی هەر شتێکی ترەوە بێت،

---

([184]) أـ سورة النمل: (٦٥).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺبەو بێباوەڕانە بڵێ: ئەوانەی وا لەئاسمانەکانو لەزەویشدان زانستی غەیب نازانن تەنیا خوای گەورە نەبێت. وەرگێڕ.

وەك ئەوەی کەقۆڵ برەکانو دەجاڵەکان ئەنجامی دەدەن، کەگوایە هەواڵی شوێنی شتە ون بوەکەیان یان شتە دزراوەکەیان پێ دەدات، یان هۆو نیشانەکانی هەندێ لە نەخۆشیەکانیان پی دەڵێت، دەڵێن: فلاڵ ئیشو فلاّن کارەت کردوەو بەهۆی ئەکارەوە نەخۆش بویت، بەلاّم ئەوان لەو کارەیاندا جنۆکەو شەیاتینیەکان بەکار دەهێننو ئەوان یارمەتیان دەدەن، بەلاّم ئەو قۆڵ برانە وا نیشان دەدە کەگوایە خۆیان ئەو کارانە دەکەنو بۆیان دێت، لەڕێگای کار کردنی ئەو شتانەوەو لەدەرگای فێلو تەڵەکەبازیو پەردە پۆشیەوە، شێخی ئیسلام إبن تيمية ([185]) گوتویەتی:(هەر فالچی یەکدۆستێکی شەیاتینی هەیەو لێ یەوە نزیکە، زۆرێك لەشتە پەنهانەکانی بۆ دێنیو هەواڵی پێ دەدات کەبەهۆی گوی لێ بونەوە لەهەواڵەکانی ئاسمان دەیان دزێتو بۆ دۆستە قۆڵ برەکەی دێنێت، وەئەو شەیاتینیانە هەمیشە هەواڵە ڕاستو درۆیەکان تێکەڵ بەیەکتری دەکات) تا ئەو شوێنەی کەگوتویەتی:(لەو قۆل برو دەجالانەی کەشەیتانەکان هاریکاریان دەکەنو خواردنو میوەو حەلواو گەلێ شتی لەم جۆرانەیان بۆ دێنن کە لەو شوێنەدا نیە([186])، وەهەندێ لەوانە جنۆکەکان دەیان فرێننو دەیان بەن بۆ مەککە یان بۆ (بيت المقدس) و غەیری ئەو شوێنانەشو بۆ هەر شوێنێکی بیانەوێت.) ... تەواو.

وەزۆر جاریش ئەو هەوالاّنە لەئەستێرە گریەوە وەردەگرن، ئەمەش ڕێنومایی وەرگرتنە لەبارو دۆخە گەردونیەکان(أحوال الفلكية) لەسەر ڕوداوە زەمینیەکان(الحوادث الأرضية) وەك کاتەکانی هەڵ کردنی باکانو هاتنو بارینی باران، گۆڕانی نرخەکان، وگەلێکی تر لەم کاروبارو دۆخانە کەپڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کەدەزاننو هەستی پێ دەکەن بەهۆی هاتو چۆیو جولاّنو کۆبونەوەو لێك جیا بونەوەی ئەستێرەو هەسارەکان لەسەر ڕێڕەوو خولگەکانی خۆیانو دەڵێن: سودو چێژ لەو ئەستێرەو لەفلاّن ئەستێرە وەربگرێت، ئەوە

---

([185])بڕوانة: مجموعة التوحيد(٨٠١،٧٩٧).

([186]) دەبینیت زۆر جار لەپێش چاوی خەڵکەکە تەسبیحێك یاهەر شتێکی تر ڕادەگوشێت و هاوار دەکاتە پیرەکەی خۆیو عەتر خوڕ خوڕ دێنێتە خوار یا ڕەحەتە لقوم یا هەرشتێکی تری ئەو قۆڵ برە بیلێت ئەوە دێتە خوار، ئەوە لەکوێوە دێت ئەگەر جنۆکەو شەیاتینیەکان بۆیان نەهێنن بەلاّم لەپێش چاوی خەڵکەکە ئەو دەیهێنێت. ئاخر زۆرێك لەوانە مەی خۆرەوەش بونو نوێژەکانیشیان بەتەواوی ناکەن نەك هەر بەکۆمەڵ بەڵکو هەر بەتەنیاش نایکەنو ئەسڵەن هەر پابەندیش نین بەدینەکەوە نەك هەر بەقورئانو سوننەت ئەدی چۆن ئەو موعجیزە گەورەیەی هێنا؟!! . وەرگێڕ

ئەمەو ئەوەی دەست دەکەوێت، وەهەر کەسێك سەفەر لەکەلوی فلان ئەستێرەدا بکات ئەوە فلان شتەی دەست دەکەوێت، وەهەر کەسێك لەکەلوی فلان ئەستێرە یاهەسارەدا لەدایك ببێت، ئەوە فلان شتەی دەست دەکەوێت، هەروەها لەو هەمو بەختەوەریو نابەختەوەریە، یا بێ شانسو بەشانسانەی کەهەندێ لەو گۆڤارە دۆڕاوە پڕو پوچو بێ تامانە کەدەربارەی کەلوی ئەستێرەکانو ئەوەی دێتو دەچێت لەم بەختو بەختکاریانە دەیدەنە بەردیدو زیهنی ئەو خەڵکەو بیرو هۆشی ئەو خەڵکەی پێ بۆگەنیو سەرقاڵ دەکەنو لەڕاستەقینەی ئایینی ئیسلامو لەڕێڕەوی ڕاستەقینەی قورئانو سوننە لایان دەدەنو چەواشەیان دەکەنو بەکارو بەگفتارو شتە خورافیاتەکان سەر سڕو بیر سڕیان دەکەن.

هەندێ لەنەفامەکانو بڕوا بێ هێزەکان دەچنە لای ئەو ئەستێرە گرەوەو جادوگەرانەو دەربارەی داهاتوی ژیانی خۆیان، ئەوەی کەلەسەری دەڕۆن، دەربارەی ژن هێنانو گەلێ شتی تری لەم جۆرانەپرسیاریان لێ دەکەن.

وەهەر کەسێك پڕوپاگەندەی زاستی پەنهان واتە غەیبزانی بکات یاخود بڕوا بەوانە بکات کەپڕوپاگەندەی غەیبزانی دەکەن. ئەوە هاوبەش دانەرێکی کافرە، بەهیچ شێوەیەك پڕوپاگەندەی هاوبەشیەتی لەگەڵ خوادا نابێتو دروست نیە لەو بوارانەی کەلە تایبەتمەندیو جیاکاریەکانی خوای گەورەن، هەروەها ئەستێرەکانیش دروستکراوێکی ملکەچن وەك ئێمە بۆ خوای گەورە، هیچ کاروبارو هیچ شتێکیان بەدەست نیە، نەئامارەو نەڕێنومایی بەدبەختیو بەختەوەری، ونەمردنو نەژیان دەدەنە دەست، بەڵام ئەمانە هەمویان لەکردەوەکانی شەیاتینیەکانن کەبەگوێ گرتن لەفریشتەکانی خوا لەئاسمانو زانیاریەکان دەدزنو بەدەگمەن زانیاریەکی ڕاستیان گەر دەست کەوت لەگەڵ سەدانو بگرە هەزاران درۆو دەلەسەی خۆیان تێکەڵی دەکەنو بۆ ئەو چەواشەکارانەیانە دەهێننو ئادەمیزادە ساویلکەو باوەڕو ئیمان بی هێزەکانی پێ دەخڵەتێنن ئەوانە بەر نەفرینی خوا کەوتونو جێگەیان ئاگری دۆزەخە بەهەمیشەیی.

******** ******** *******

## بەشــی دووەم

## جادو گەریو نهێن زانیو شوێن هەڵگری

هــەمو ئــەو کارانــە لــەکردەوە حەرامــەکانی شــەیتانن بیروبــاوەڕی مرۆڤــ لادەبــاتو دەیسڕێتەوە یا پێچەوانەو دژی بیرو باوەڕو هەڵی دەوەشێنێتەوە، چونکە بیرو باوەڕ هەڵ ناوەشێتەوە تەنیا بەئەنجامدانی چەند کارێكو کردەوەیەکی هاوبەشی پەیدا کردن نەبێت بۆ خوای گەورە نەبێت، کەلەم خاڵانەی خوارەوەدا خرپیان دەکەینەوە:

**١ـ جادوگەری(السحر والكهانة):** بریتیە لەوەی کەپــەنهانونادیارەو هۆکارەکــەی ســوكو نزیــك دەکات.(واتەبریتیە لــەکارێکی نادیــار گوایە ئــەنجامی کێشــەو تەنگژەو ئاستــەنگەکان بــەجادو کردنو فێڵبازی بۆ خەڵکی ئاسانو نزیك دەکاتەوە ـ وەرگێڕ ـ) .

بۆیەش ناو نراوە جادو(سحر)، چونکە بەچــەند کاروبــارێکی پــەنهانی بەدەست دێن، و بەچــاو نــابینرێن، کــەبریتین لــە: نیــازو نیازگــەری(نوشــتەو نوشــتە گــەریو گشــتەك کردنوچەواشە کردنی خەڵك وەرگێڕ)، قســەو ئاخــاوتن کەجادوگــەر قســەی پــێ دەکــات، دەرمانو دوکەڵو تەماوی جادوگەری، ئەم جادوگەریە بونی هەیەو کاریگەری خۆی هەیــە بەسەر ئادەمیزادەکانەوە. زۆر جاری وا هەیــە کــار لەدڵو دەرونو جەستــەکان دەکــاتو نەخۆشــیان دەکــاتو دەکــوژێو نێــوانی خــەڵکی تێــك دەدات، ژنو مێــرد لێــك دەکــات، وەئەوەی کەکاریگــەریی کــەونی قــەدەری هەیــە ئــەوە بەمۆڵــەتی خــوای گــەورەیــەو، ئــەوە لەکاری شەیتانە، وەزۆرێك لەجادوگەری نایەتەدیو پێ ی ناگــەنو ئــەنجامی نیــەو نابێــت تەنیا بەهاوبەش دانانو خۆنزیــك کردنــەوە لەگیانــە پیســەکان(الأرواح الخبيســة) نــەبێت. وەکەیشتنو پەنا بردن بۆ بەکار هێنانی جادو بەهاوبــەش پــەیدا کــردن بــۆ خــوای گــەورە لەگەڵی دا دەبێت، لەبەر ئەوەیە شەرع دانەر (الشارع)بەهاوبەش دانانی (الشــرك)دانــاوە یابەهاوبەش دانانی چواندوە هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرمویــەتی:{اجتبوا السبع الموبقات} قالوا: وماهي؟قال:{الإشراك بالله و السحر ... }(١٨٧).جادوگەری لەدو لاوە لەگەڵ هاوبــەش داناندا تێکەڵاوە:

(١٨٧) أـ رواه البخاري ومسلم.

لایەنی یەکەم: لەوەی کەشەیاتینیەکانی تێدا بەکار دەهێنرێن یاپەنا دەبەنە بەر شەیاتینیەکان بۆ ئەنجامدانی کاری جادوگەری، و پەیوەست دەبن پێیانەوەو خۆیانی لێ نزیك دەکەنەوە بەوەی کەحەزیان لێ یە یاخۆشیان دەوێت(واتە: ئەو شەیاتینیانە چ داوا لەو جادوگەرانە بکەن دەبێ بۆیان ئەنجام بدەن لەجۆرەها کاری تاوانو تاوانکاریو جینایەتی گەورەو شەریك دانان بۆ خوای گەورەو جۆرەها کاری پیسو پۆخڵی کەمرۆڤ تەنەفور دەکات باسیان بکاتو ناویان بەرێت هەروەك خۆیان ددان بەو ڕاستیانەدا دەهێنن. وەرگێڕ)، بۆ ئەوەی بەخزمەتی جادوگەری هەڵ بستنو کاری جادوگەریەکەیان بەهاریکاریو پشتیوانیو شەیتانو شەیاتینیەکان واتە سەربازانی شەیتان لەجنۆکەو مرۆڤەکاندا، کەواتە جادوگەری لەفێرکاری شەیاتینیەکانەوە سەری هەڵداوەو مرۆڤیان فێر کردوە، ئەوەتە خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ ﴾ سورة البقرة: (١٠٢).

لایەنی دوەم: لەوەی کەتیایەتی لەبانگەشەو پروپاگەندەو دەم وەردان زانستی پەنهانزانی(علم الغيب)، وەپروپاگەندەی بەشداری کردنی خوا لەم بوارەدا، دیارە گومانی تێدا نیە کەئەمەش کوفرو گومڕاییە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ ﴾ سورة البقرة: (١٠٢). واتە: ئەوەی کەئەم جادوە دەکاتو ئەوەشی کەبۆی دەکرێت هیچ بەشو پشێکێکیان لەبەهەشتدا نیە.

وەئەگەر کارەکە ئاوا بێت گومانی تێدا نیە کەئەوە کوفرو هاوبەش دانانە، هەڵوەشێنەرەوەو دژی بیروباوەڕی ئیسلامیە، بۆیە پێویستە(يجب) جادوگەر بکوژرێت، هەروەکو چۆن کۆمەڵێك لەگەورە هاوەڵانﷺ کوشتیانن، بەڵام بەداخەوە خەڵکی بەتایبەتی خەڵکی سەردەمی ئەمڕۆمان ئاسانکاریەکی زۆر دەکەن لەگەڵ جادوگەرانو جادوگەری دا، لەوانەیە بەهونەرێك لەو هونەرانەشی دابنێن، کەهەمیشە شانازی پیوە دەکەن، وبەخششو دیاری بەخاوەنەکانیان دەدەنو دەست خۆشیان لێ دەکەنو هانیان دەدەن لەسەر ئەو کارە شەیتانیەو بەکاری جادوگەریەکە دەڵێن هونەرو

ب ـ واتە: خۆتان لەحەوت گوناحە لەناوبەرەکان بپارێزن، گوتیان ئەو حەوت گوناحە لەناوبەرە چین ئەی پەسولی خوا؟ فەرموی: {هاوبەش دانان بۆ خواو جادوگەری واتە جادو کردن} وەرگێڕ.

بەئەنجامدەرانیشی دەڵێن هونەرمەندان، ویانەو ئاهەنگو پێشبڕکێ ی جادوگەریان بۆ ساز دەکەن، پارەو پولو سامانێکی زۆری گشتیشیان لەخەزێنەی دەوڵەتو لەسەرو سامانی گشتی خەڵکی واتە هاوڵاتیان بۆ خەرج دەکەن، بەهەزاران سەیرکەرو هاندەریان لی کۆ دەبنەوەو ئامادە دەبن، و بەسەیرەك ناوی دەبەن، بێگومان ئەمە لەنەفامیو حاڵی نەبونە لەئایین، سستی کردنە لەبارەی بیروباوەڕەوە(العقيـــدة)، پایەدار کردنو دەست لەپشتی دانو ئافەرینو دەست خۆشی کردنە لەکارە خورافیو بێ بنەماو نەبوەکانو چەسپاندنی کاری خراپەو خراپەکایو خراپەکارانو سوکەڵەکانە.

**٢ـ نهێنزانی (الكهانة)و شوێن هەڵگری(العرافة):**

ئەمەش هەردوکیان پڕوپاگەندەی پەنهانزانی یە(علم الغيب). وەشارەزا بونو زانینی کاروبارە نهێنیەکانە، وەك هەواڵو زانیاری دان بەوەی کەچ لەسەر زەوی ڕودەدات، وەچ دێتە پێشو چ دەست دەکەوێت، وەزانینی شوێنی شتە ون بوو بزر بوەکان یان دزراوەکان، ئەویش بەهۆی بەکار هێنانی شەیاتینیەکان کەزانیاریەکان بەگوێ لی بونو گوێ گرتن لەفریشتەکانی ئاسمان لەهەواڵەکانی ئاسمان دەزن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ۝تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ۝يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾ (١٨٨).

ئەوەش بەوە کەشەیتان وشە یازانیاریەك لەقسەکانو زانیاریەکانی فریشتەکان دەدزێت، لەگوێ ی کاهینەکانی واتە ئەوانەی پڕوپاگەندەی پەنهانزانی دەکەن دەچرپێنیو ئەو کاهینەش ئەو وشەیە لەگەڵ سەدان وشەی درۆین تێکەڵ دەکات، خەڵکیش بەهۆی ئەو وشە یائەو زانیاریە ڕاستە بڕوای پێ دەکەن، کەلەئاسمان شەیتان گوێ ی لێ بوەو بۆی هێناون، خوای گەورە خۆی تاکوتەنیایە بەزانستی پەنهانو هەر

---

(١٨٨) أ ــ سورة الشعراء (٢٢١ ــ٢٢٣).

ب ـ واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم کەشەیاتینەکان دادەبەزنە سەر کێو درۆو بوختان بەکێ دەکاتو کێ وەسوەسە دەکات؟، دادەبەزێتەسەر هەمو بوختانچیو درۆزنو خراپەکارو فیتنە گێڕێك، ئەوانەی کەپڕوپاگەندەی پەنهازانیو هەواڵە غەیبیەکان دەکەن،ئەوانەی گوی لەقسەو وەسوەسەکانی شەیتان دەگرن، چونکە شەیتانو سەربازەکانی گوێ دەگرن و هەواڵەکان لەفریشتەکان دەدزن، ئەگەر جارێك لەجاران ڕاستیەکان بۆ بدزێتو لەگەڵ هەزاران هەواڵی درۆ تێکەڵیان دەکەن بۆ ئەو نهێن زان وکاهینانەیان دێننو پێ یان ڕدەگەیەنن کەزۆربەیان درۆزنن. وەرگێڕ.

ئەو زانستی غەیب دەزانێت، هەر کەسێکی تر پڕوپاگەندەی بەشداریو هاوبەشی شتێك بکات لەو زانستی غەیبە، بەپەنهانزانی بێت یا بەهەر شتێکی تر بێت، یابڕوا بکات بەو کەسانەی کەئەم پروپاگەندەیە دەکەن، ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوە لەشتانێك کەلەتایبەتمەندیو جیاکاریەکانی خوایە بەتەنیا. وەکەهانەیی واتە ئیدیعا کردنی غەیب زانی بێ بەش نیە لەهاوبەشی دانان، چونکە ئەوانە خۆیان لەشەیاتینیەکان نزیك دەکەنەوە بەو کارو کردەوانەی کەحەزیان لێ یەتیو داوایان لێ دەکەن، هاوبەشی دانان لەبەتەنها خوا پەرستی پەروەردگارێتی دا لەڕوی لاف لێدانی هاوبەشیو بەشداری کردنی خوایە لەزانستو زانیاری دا، وەهاوبەش دانان لەبەتەنها خوا پەرستی خوایەتی دا لەڕوی نزیك بونەوەیە لەخوا بە غەیری خوا بەبەشێك یابەشتێك لەبەندایەتی کردندا.

وەلەأبی هریرەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {من أتــى كاهنــاً فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد ﷺ}(١٨٩).

وەئەوەی کەپێویستە ئاگاداری لەسەر بکرێتو وریایی لەسە بدرێت ئەوەیە کە: جادوگەرانو پەنهانزان(الكهان)و شوێن هەڵگران، بیروباوەڕی خەڵکی تێك دەدەنو تێکەڵو پێکەڵی دەکەن لەگەڵ شتی تردا بەشێوەیەك خۆ بەڕواڵەتی نوژداری بۆ خەڵکی وەدەر دەخەن، فرمان بەخەڵکی دەکەن بەتایبەتی نەخۆشەکان کەسەربڕین بۆ غەیری خوا بکەن، پێ یان دەڵێن بەرخێك لەو سیفەتە، یامریشکێك سەر ببڕن، یاخود تەلسمی هاوبەش دانانیان بۆ دەنوسن، یاجادونوشتەی شەیتانیان لەسەر شێوەی مورو حەماڵو قایشو قوروش(١٩٠)بۆ دروست دەکەن بەگەردنو ملیانەوە یا بەمای حەیوانەکانیانەوە هەڵی دەهاوەسن.

---

(١٨٩) أـ رواه أبو داود.

ب ـ واتە: هەر کەسێك بچێتە لای جادوگەرێكو بڕواش بکات بەوەی کەپێ ی دەڵێت، ئەوە بڕوای بەو بەرنامەوپەیامە نەماوە کەمحمد ﷺ هێناویەتی کەئایینی ئیسلامە. وەرگێڕ.

(١٩٠) حەمایل: ئەوە بو کەئەو جادو گەرو قوڵ بڕانە کۆمەڵێك بەناو نوشتەو گشتەکو شاڵی سەوزودارو هێسكو موروی جۆراو جۆرو گڵو خۆڵو دارو چیلکەی سەر گۆڕستان یان هی سەر مەرقەدو مەزارو ئەزرگەکانیان بەمل بەندێکی چەرمیەوە بۆ دروست دەکردن کەهەمو سیحرو جادوگەری بونو لەکۆمەڵێك شت پێك هات بو، وەك نوشتەوسیحرەکە جالەبەرد یالەخۆڵو گڵی سەرقەبرانو دارو چیلکە وکۆمەڵێك پەڕو پاڵی ئالاکانی سەر گۆڕەکانو هێسكو ئازانم چیو چی

وەهەندێکی تریان لەسەرشێوەو بەڕواڵەتی هەواڵدەری پەنهانی یەکان(المخبر المغيبات)و شوێنی شتە ون بوو دزراوەکان خۆ بەدەر دەخەن، کەهەندی لەنەفامو نەزانەکان دێنە لایان پرسیاری لەسەرو سۆرخی شتە ون بوو شتە دزراوەکانیان لیٚ دەپرسن ـ ئەوانیش گوایە هەواڵی شوێنی شتەکانیان پی دەڵێت یاخود بۆیان دەدۆزێتەوەو ئامادەی دەکات، ئەوانیش بەهۆی کلکو وابەستەو بەکریٚ گیراوەکانیان لەجنۆکەو شەیاتینیەکان.

وەهەندێکی تریان خۆ بەڕواڵەتی دۆستو خۆشەویستانی خوا بەدەر دەخەن کەگوایە کاری لەڕادە بەدەرو کەراماتیان هەیە یاخۆ سەر شێوەی هونەرمەند بەدەر دەخەنو خەڵکی هەڵ دەفریوێنن، وەك ئەوەی کەدەچێتە ناو ئاگر یائاگر دەخواتو هیچ ناشی سوتێنێتو کاریشی تیٚ ناکاتو هەستیش بەخۆی ناکات، یابەچەكو بەشیرو تیرو زەرگ لەخۆ دەدەن، یاخود خۆی دەخاتە ژێر تایەی ئوتومبیلەوەو هیچ کاریشی تیٚ ناکاتو بەخەیاڵیشی دانایەت، ئەمەو گەلێکی تر لەم جادوو جادوگەریو تەڵەکەبازیە کەلەڕاستی دا ئەم کارە شەیتانیە دیوە ڕاستەکەی جادوگەریە(السحر)و لەکارو کردەوەکانی شەیانن، و لەسەر دەستی ئەم ئاشوب گێڕو فیتنە بازانە ئەنجام دەدرێن، یاخود بیریتین لەچەند کارو کردەوەیەکی خەیاڵیانەو هیچ ڕاستیو بنچو بناوانو بنەمایەکیان نیە، بەڵکو چەند فێڵێکی پەنهانو نادیارو شاراوەن لەبەرچاوی ئەو خەڵکە ئەنجامی دەدەن بەڵام لەڕاستی دا وا نیە، وەك کاری جادوگەرەکانی فرعەون کەبەپەتو دار دەستانیان ئەنجامیان دەدا.

شێخی ئیسلام جارێکیان لەڕو بەڕو بونەوەیەك لەگەڵ جادوگەرانی ئەحمەدی ڕوفاعی(البطحائية الأحمدية الرفاعية)گوتویەتی:(شێخی بەتحائی بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئێمە حاڵو ئەحواڵی ئەماو ئەوا دەگرین، و پڕو پاگەندەی حاڵەتی لەڕادە بەدەر(الخارقة)وەکو ئاگر خواردنو چونە ناو ئاگرو ئەو جۆرە شتانە، وەئەوە تەنیا لە

---

بەو مل بەندەیان گیر دەکردو هەندیٚ جار ژمارەی ئەو نوشتوانەی کەبەو گەریەندەوە دەکران پتر لەپێنج دانە دەبون. من بەبیرم دی کاتیٚ کەمنداڵ بوم دایکی من هەیبو خوا لەگوناحی ئەویش لەهەمو مردوی موسڵمانانو لەئێمەش بەگشتی خۆش ببێت ئافرەتان دەهاتن دەبیا برد ئەوماڵەو ماڵی دەکرد بەتایبەتیش بۆ ئەو ژنانەی کەمنداڵیان دەبوو زەیستاندار بون. کۆمەڵێك لەو نوشتەوو هەیتو هوتانەی پێوە بون. سوپاس بۆ خوا ئێستا تاڕادەیەکی باش ئەم دیاردە دزێوو قێزەونە سیحریو جادوگەریان کەم بونەتەوەو بەویستی خوا لەسەر زەوی تۆیان نامێنێتو کەس هەرناشیان ناسێت.. وەرگێڕ.

تایبەتمەندیو جیاکاریەکانی ئەوانە، وەهەر ئەوان شایستەو مافی وەرگرتنی حاڵو ئەحواڵن لەم پێناوەدا). شێخی ئیسلام گوتی:(منیش تورە بومو بەدەنگی بەرز گوتم: من ئێستا لەگەڵ هەمو ئەحمەدیەکمە لەرۆژهەڵاتی ئەم زەوی یەوە تا رۆژئاوای: چ شتێکیان لەناو ئاگردا ئەنجامداوە؟! منیش دەتوانم وەکو ئەوان بکەم جاهەر کامێکمان سوتا ئەوە ئەو کەسە سەرکەوتوە، وەلەوانەشە گوت بێتم: نەفرەتی خوای لێ بێت، بەلام دوای ئەوەی کەلەشمان بەسرکەو بەئاوی گەرم دەشۆین، ئەمیرەکانو خەڵکی لەم بارەوە لێ یان پرسیم، گوتم: چونکە ئەوانە لەکاتی پەیوەندیان بەئاگر فرو فێڵی تێدا دەکەن، لەشتانێکو لەرۆنو چەوری بۆقو توێکڵی نارنجو بەرد دروستی دەکەن، ژاوە ژاوی لەناو هەڵکەکەدا دروست کردو وای خۆ دەردەخست کەتوانای ئەو کارەی هەیە، گوتی: منو تۆ خۆمان لەباریەکەوە دەهاڵێنین دوای ئەوەی گۆگرد لەلەشی خۆمان هەڵ دەسوین. گوتم: هەستە، چەند جارێك لێم دوبارە کردەوە کەهەستیّو ئەو کارە بکەین، دەستی برد کراسەکەی لەخۆی دابکەنێت، گوتم: نەخێر، ئەوا نا هەتاکو خۆت بەئاوی گەرمو سرکە نەشۆیتەوە، بەمە فرو فێڵەکانی ئاشکرا بو وعادەتە هەمیشەییەکەیان پەردەی لەرو هەڵماڵراو گوتی: هەر کەسێك ئەمیری خۆش دەوێت بادارو سوتەمەنی بێنێت ـ یاگوتی: دەستە چیلەیەك بێنێت ـ گوتم: ئەم هەمو درێژدادریو بلاو کردنەوەو خڕ کردنەوەی خەڵکەی ناوێتو هیچ پێویست بەهێنانی دارو چیلکەو چاڵ ناکاتو یستو مەبەستەکانت ناهێنێتە دی، بەڵکو ئەوە چرایە(قـــنديل)و لەبەر دەممانـدا دەسوتێت پەنجەی خۆمو پەنجەی تۆشی تێ دەخەم دوای شوشتنەوە بەسرکەو ئاوی گەرم، جاهەرکەسێك پەنجەی سوتا نەفرەتی خوای لێ بێت، یاگوتم: ئەوەی پەنجەی سوتا ئەوە دۆڕاوە، هەر ئەگەر ئەوەم گوت تێك چوو رەنگی گۆڕاو داماوو ریسوا بوو تەڵەکەی تەقی)(١٩١)،.... تەواو.

مەبەست لەهێنانەوەی ئەم نمونەیە بۆ رونکردنەوەی ئەوە بو کەئەو دەجالو قوڵ بروفێڵ بازانە درۆزنو درۆ لەگەڵ خەڵکی دا دەکەن بەوێنەی ئەو نمونە شاراوەو نادیارە، وەك راکێشانی ئوتومبیل بەتاڵە مویەکی باریكو خۆ خستنە ژێر تایەی ئوتومبیلو وردە ئاسنو پیسو پۆخڵی ئاسن کردنە ناو چاوی خۆی، ئەمە گەلێ فرۆ فێڵو جادوگەریودرۆو دەلەسەی شەیتانی(١٩٢).

(١٩١)مجموع الفتاوى:(١١/٤٤٥ـــ ٤٤٦).

(١٩٢) بەلێ گەلێ شتی تری وەك شیرو زەرگ بازیو ئاگر خواردنو رەقسو سەما کردنو راگوشینی هەر شتێكو هێنانی عەترو لوقمو شیرو هەر شتێکی کەبیانەویّ لەبەر دەمی ئەو خەڵکەو چەواشە کردنی موسڵمانان بەو جۆرە جادو

## بەشی سێ یەم

## پێشکەش کردنی قوربانی‌ونەزرو دیاری بۆ مەزارو نەزرگەو گۆڕی پیرو پیاو چاکان‌و بەگەورە زانینیان.

پێغەمبەرﷺهەمو ئەو ڕێگایانەی داخست کەسەر دەکێشن بۆ هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، وزۆر بەتوندی موسڵمانانی لێ ئاگادارو وریا کردنەوە، لەوانەش: کێشەی گۆڕەکان، چەندان کاری بەهێزو ڕێکخەری خۆپارێزی لەبەندایەتی بۆ کردنی دا لەبەر دەمدا دانا، هەروەها زێدەڕەوی لەلایەن هاوەنەکانیانەوە، لەو ڕێگەو زەوابتانەش ئەم چەند خاڵانەی خوارەوەن:

١ـ پێغەمبەرﷺوریایی تەواوی دا لەزێدەڕەوی کردن سەبارەت بەدۆستانی خواو پیاو چاکان، چونکە ئەمە دەبێتە ئەگەری بەندایەتی کردن بۆیان هەروەکو فەرمویەتی: {إياكم والغُلُوَّ، فإنما أهلك من كان قبلكم الغُلُوُّ}(١٩٣). هەروەها فەرمویەتی: {لاتطروني كما أطـرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبدٌ فقولوا عبدالله ورسوله}(١٩٤).

٢ـ هەروەهاﷺوریاو ئاگاداری داوە لەدروست کردنی خانو لەسە گۆڕەکان، هەروەکو أبوالهياج الأسدي دەگێڕێتەوەو گوتویەتی: علي کوڕی أبي طالبه پێ ی گوتم:(ألا أبعثك على مـابعثني عليه رسول اللهﷺ؟أن لاتدع تمثالاً إلا طمسته، ولاقبراً مشرفاً إلا سويته)(١٩٥).

---

جادوگەریانە، ئایا ئەوە لەکوێ لەئایینی ئیسلام‌و قورئان‌و سوننەتدا شتی وا هەیە، کوا بەڵگەیان لەقورئان لەسوننەتدا، یاشایەتێك، یافەرمودەیەك بێننەوە کەبەندایەتی کردن‌و خوا پەرستی بریتیە لەشیر لەخۆدان‌و شوشە خواردن‌و ئاگر خواردن لەکوێ خوا فرمانی بەوە پێ کردوین‌و پێغەمبەرﷺفەرمانی پێ کردوین ئەو جۆرە کارو بەندایەتی‌و خوا پەرستیانە بکەین ئەوە قورئان‌و ئەوە سوننەت لەبەر دەستدایە تادنیا دنیایە سەیری بکەن بزانن شتی وای تێدایە، بێگومان نەخێر. وەرگێڕ.

(١٩٣)أ ــ رواه الإمام أحمد والترمذي وابن ماجة.

ب ـ واتە: زۆر لەزێدە ڕەوی وریا بن‌و لێ ی دور بکەونەوە، چونکە ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی بەهیلاك برد زێدە ڕەوەی بو.وەرگێڕ.

(١٩٤) أ ــ رواه البخاري.

ب ـ واتە: ئەوەندەم بەرز مەکەنەوەلەپلەی خۆم تێ بپەڕێنن هەروەکو گاورەکان کوڕی مەریمیان بەرز کردەوەو تێ ی دا بەهیلاك چون، بەڵکو من بەندەیەکی خوام‌و پێم بڵێن بەندەو پێغەمبەری خوا. وەرگێڕ.

(١٩٥) أــ رواه مسلم.

٣ـ هەروەها قەدەغەی کردوە کەگۆڕەکان چیمەنتۆو گەچ بکرێت‌و خانوو مەزاری لەسەر دروست بکرێت، لەجابرەوە ﷺ گوتویەتی: کە(ڕەوسولی خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کەگۆڕ بەگەچ هەڵ ببەسترێت، هەروەها لەسەر گۆڕ دامەنیشن، وەخانوو مەزاری لەسەر دروست مەکەن)([١٩٦]).

٤ـ هەروەها ﷺ نوێژ کردن لەلای گۆڕ حەرامەوقەدەغەی کردوە، لەعائشەوە - رضي الله عنها — گوتویەتی:(لەکاتێکدا کەپێغەمبەر ﷺ حاڵەتێك دابەزیە سەری‌و جلەکانی خۆی بەسەر چاوی خۆی دادا، کەدڵی غەمگین‌و سەغڵەت بو(اغتم) لەسەر خۆی لادا، وفەرموی کەهەر لەو حاڵەتەدا بو: {لعنة الله على اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبياءهم مساجد}. بۆیە وریایی‌و ئاگاداریەکی زۆری بەموسڵمانان دا لەو کارەی کەجولەکەو گاورەکان کردویانە کەمزگەوت‌و خانویان لەسەر گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دروست دەکرد، ئەگەر لەبەر ئەو هۆکارە نەبایە گۆڕەکەی بەرز دەکرایەوە، بەڵام ئەو لەوە ترسا کەدوای مردنی‌و لەدوای خۆی گۆڕەکەی بکەن بەمزگەوت) ([١٩٧]).

وە ﷺ فەرمویەتی: {ألا من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم مساجد، ألا تتخـذوا القبور مساجد، فإني أنهاكم عن ذلك}([١٩٨]). کردنی گۆڕەکان بەمزگەوت واتا: نوێژ کردن لەلای گۆڕەکان جابا مزگەوتیشیان لەسەر دروست نەکرا بێت، هەر شوێنێك بۆ نوێژ لێ کردن تەرخان کرا یانوێژی لێ کرا ئەوا کراوە بەمزگەوت واتە کڕنوشگە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { جُعلت لي الأرض مسجداً وطهوراً}([١٩٩]). دەی ئەگەر مزگەوتی لەسەر دروست بکرێت ئەوە گەلێك بەهێز ترو خراپتر دەبێت.

---

ب ـ واتە: ئایا ڕەوانەت بکەم بۆ شتێك کەپێغەمبەری ﷺ خوا بۆی ڕەوانە کردم؟ کەهەرچی پەیکەو وێنا هەیە بنبڕی بدەیت‌و وردو خاشی بکەی‌و هەر گۆڕێکی بەرزو هەڵبەستراوو خانوو مەزار لەسەر کراو هەبێت لەگەڵ زەوی دا تەختی بکەیت. وەرگێڕ.

([١٩٦]) رواه مسلم.

([١٩٧])أـ متفق عليه.

ب ـ واتاکەیمان لەڕاپەڕودا نوسیوە. وەرگێڕ.

([١٩٨])رواه مسلم في صحيحه.

([١٩٩]) رواه البخاري.

زۆرینەی خەڵكی بەپێچەوانەی ئەو قەدەغە كراوانە دەجوڵێنەوە، بەپێچەوانەی ئاگاداری و وریاداریەكانی پێغەمبەرﷺ جولاْنەوەو دەجوڵێنەوەوتاوانیان كردو بەهۆی ئەوەوە توشی جۆرەها هاوبەش دانانی گەورە بون، و لەسەر گۆڕەكان مزگەوت وگڵكۆو مەزارو چەندان جێگەی حەوانەوەیان دروست كردن، چەندان مەزاریان پێك هێناو لەو مەزارانەدا هەمو جۆرەكانی هاوبەش دانانی گەورەیان ئەنجام دەدا([200])، لەسەر بڕین بۆیان، وەداوا كردن‌و پاڕانەوە لەبەر خاوەنی مردوی ئەو گۆڕە، وهانا بردن‌و پەنا پێ بردنیان، وەكردنی نەزرەكان بۆیان، ئەمانەو گەلێكی تر لەمانە.

زاناو ناودار إبن القیم ـ رحمه الله ـ گوتویەتی:(وەهەر كەسێك سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە بواری گۆڕەكان، ئەوەی كەفرمانی پێ كردەوەو ئەوەشی كەقەدەغەی لێ كردوە، وە ئەوەی كەهاوەڵەكانی دەیان كرد، لەگەڵ ئەوەی كەئێستا([201])زۆرینەی خەڵكی لەسەری دەڕۆن كۆ بكەیتەوەو تێكەڵیان بكەیت‌و بەراوردیان بكەیت، دەبینی دژو هەڵوەشێنەرەوەی یەكترین، بەشێوەیەك هەرگیزاو هەرگیز لەگەڵ یەكتری دا كۆ نابنەوەو هەمیشە بەیەكەوە نەكوڵەكن‌و دانویان بەیەكەوەناكوڵێت، بۆیە پێغەمبەرﷺقەدەغەی كرد كەنوێژ لای گۆڕو لەنزیك گۆڕەوە بكرێت، وەئەوانە بەپێچەوانەوە نوێژیان لای گۆڕەكان كردو بەقسەی پێغەمبەریانﷺنەكرد، هەروەها لێ ی قەدەغە كردن كەمزگەوت‌و خانو لەسەر گۆڕەكان دروست بكەن، بەڵام ئەوانە هەستان مزگەوتیان لەسەر گۆڕەكان دروست كردو

---

([200]) بەڵێ وێنەی ئەمانە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گەلێك زۆرن بەزەقی‌و زۆر بەدڵخۆشیشەوە بەبەندایەتی كردنی كاكڵەی دەزانن بۆ خوای گەورە، وەلێ ئەوان ئاگایان لەوە نیە كەلەسەری قەرز دار دەبنەوەو هاوبەش دانانی گەورەیان بۆ خوا داناوەو پێ ی كافر بون‌و هیچ ئاگاشیان لەخۆ نیە، لەكوردستاندا زۆرێك لەمزگەوتەكان بونەتە مەزرگەو گۆڕستانی پیاو چاكان‌و نوێژیان لەدواوەو لەتەنیشتەوەولەپێشەوە دەكرێت‌و لەمەش خراپتر دوای نوێژەكە لەبەر خاوەنی گۆڕەكان دەپاڕێنەوەو داوای شیفاو لادانی تەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشی‌و بەڵاو موسیبەتەكانیان لێ دەكەن‌و مەدەدیان بۆ دەبەن‌و هاواریان دەكەنێ، ئەمە لەمزگەوتەكاندا جوێ لەو هەمو مەرقەدو مەزارو نەزرگانەی كەبۆ گۆڕی شێخان‌و پیاو چاكانیان دروست كردوەو هەمیشە جمەیان دێت، ئەگەر سەنجیان بدەیتێ هەرگیزاو هەرگیز موگەوتەكانی ماڵی خوا كەتەنیا بۆ بەندایەتی كردن‌و پەرستشی خوا دەشێن نەك بۆ تێدا ناشتنی گۆڕو كردنیان بەگۆڕستان بەچارەگی ئەو مەزارو مەرقەدانەو ئەو مزگەوتانەی كەگۆڕیان تێدان‌و مردویان تێدا نێژراوە قەڵەباڵغ نین‌و خەڵكیان ناچێتێ‌و زۆربەی كاتەكان چۆڵن‌و كەس سەریان پێدا ناكات، نمونە زۆرن هەموان لەئێمە باشتر دەزانن پێویست ناكات ناویان بهێنین. وەرگێڕ.

([201]) واتا لەكاتی ئەودا ـ رحمه الله ـ ئێستاو لەڕۆژگاری ئێمەدا گەلێكی تری چوەتە سەر.

ناویان لێ نان مەزراو نەزرگە (مشاهد)، لەسەر وێنەو شێوەی ماڵەکانی خوا(لەسەر شکڵو شێوەی مزگەوتەکان کردیان جێگەی نوێژ تێدا کردن بەجۆرێك ئەو شوێنانەیان لاپیرۆز تر بو لەمزگەوتەکان، وەقەدەغەکەی کرد کەچراو ئاگردانیان لەسەر دروست بکەنو دایان بگیرسێنن، بەڵام ئەوانە بەپێچەوانەوە چەندان کەسیان تەرخان دەکردن بۆ داگیرساندنی چراکان لەسەر ئەو گۆڕانەو وەقفیان بۆ دەکردن، هەروەها قەدەغەی کردن کەبکرێت بەجەژن بەلام ئەوان دەیان کردە جەژنو بەندایەتی کردن(أعياداً ومناسك)، وە بۆی کۆ دەبونەوە پتر لەوەی کەبۆ جەژنەکان کۆ دەبونەوە.

هەروەها فرمانی کردوە بەتەخت کردنی گۆڕەکان ئەگەر هەڵ بەسترابنو خانویان لەسەر کرا بێت، هەروەکو مسلم لە(صحيح)ەکەی خۆی دا لەأبي الهياج الأسدي دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: علي کوڕی أبي طالب‌ﷺ پیّ ی گوتم:(ألا أبعثك على مابعثني عليه رسول اللهﷺ؟أن لاتدع تمثالاً إلا طمسته، ولاقبراً مشرفاً إلا سويته)([202]). هەروەها لە(صـــحيح)ەکەی خۆی داو لەثمامة کوڕی شُفي گوتویەتی:(لەگەڵ فضـــالة کوڕی عبيـــد بـوین لەخاکی ڕۆم بـرودس یەکێکمان لێ مرد، فضالة فەرمانی کرد لەگۆڕ نراو دوایی گۆڕەکەی لەگەڵ زەوی دا تەخت کرد، ودوایی گوتی: گوێم لەرەسولی خواﷺ بو کەفرمانی پی دەکردین کەگۆڕەکان تەخت بکەین.)([203]). بەلام ئەو گۆرپەرستانە لەم دو فەرمودەیەدا زێدەرەوی لەسەرپێچی کردنیاندا دەکەن، لەڕوی زەوی گۆرشەکان بەرز دەکەنەوە تاو وەك خانوی لێ دێتو دوایش گومبەتی(القباب) لەسەر دروست دەکەن.)

تائەو شوێنەی کەگوتی:(سەیری ئەو جیاوازیە گەورەیەی نێوان ئەوەی کەپێغەمبەرﷺ بۆی داڕشتوینو هەروەها ئەو مەبەستەی لەقەدەغە کردنەکانی کەلەڕابردودا دەربارەی گۆڕەکان ئاماژەمان بۆ کردن، وەلەنێوان ئەوەی کەئەوانە دایان ڕشتوەو مەبەستیانە؟! دیارە گومانی

([202]) أـ رواه مسلم.

ب ـ واتە: ئایا رەوانەت بکەم بۆ شتێك کەپێغەمبەریﷺخوا بۆی رەوانە کردم؟ کەهەرچی پەیکەرو وێنا هەیە بن پێ بدەیتو وردو خاشی بکەیو هەر گۆڕێکی بەرزو هەڵبەستراوو خانوو مەزار لەسەر کراو هەبێت لەگەڵ زەوی دا تەختی بکەیت. وەرگێڕ.

([203]) واتە بەرزیان نەکەینەوە.

تێدا نیە کەئە کارەیان بریتەیە لەخراپەو خراپەکاریەك کەمرۆڤ لەتوانای دانیەوبەسەری دا زاڵ بێتو توانای بەسەردا بشکێتو ئابلۆقەیان بدات.

شێخی ئیسلام لەسەر باس کردنی ئەم خراپەکاریە بەردەوامە، تائەو شوێنە کە گوتویەتی: ( وەلەوانە: ئەوەی کەپێغەمبەرﷺرێگەی پێداوە لەسەردانی گۆڕستانو چونە سەر قەبران تەنیا بۆ مەبەستی بیر هاتنەوەی ڕۆژی قیامەتەو بەس، وەبۆ ئەوەی ئەو کەسەی کەدەچێتە سەر قەبران دوعای لێ خۆش بون بۆ مردوەکان بکاتو سەلامیان لێ بکات، و بەزەیی پێدا بێنەوەو داوای ساخلەمیو لێ خۆش بونیان بۆ لەخوای گەورە بکات، ئالەو کاتەدا ئەو کەسە چاکە لەگەڵ خۆشیو لەگەڵ مردوەکانیش دا دەکات، بەڵام ئەو هاوبەش پەیداکارانە کارەکانیان سەرەو بن کردوە، و ئایینەکەیان پێچەوانە کردۆتەوە، ومەبەستیان لەو سەردانەی گۆڕستان یان گۆڕی پیاو چاکان: بەهاوبەش دانانی مردوەکە بۆ خواو، داوای لێ دەکاتو لەبەری دەپاڕێتەوە، وەداوای جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانی خۆیانی لێ دەکەن، وەداوای داباڕینی بەرەکەتو ڕەحمەتی خۆی لێ دەکەن، داوای یارمەتیو سەرخستنی لێ دەکەن بەسەر ناحەزو دوژمنەکانیاندا، ئەمانەو گەلێ شتی تر، ئابەم کارە خراپانەیان ئەوانە خراپە لەگەڵ نەفسی خۆیاندا دەکەن، هەروەها لەگەڵ مردوەکەشدا، وەئەگەر ئەوە نەبوایە لەبەرەکەتی ئەوە بێ بەش نەدەبون کەخوای گەورە بۆی دانا بون لەدوعا بۆ کردنو بەزەیی پێدا هاتنەوەو داوای لێ خۆش بونو عەفوی خوای گەورەی بۆ بکەن) ...تەواو([204]).

لەمە بۆمان دەردەکەوێت کەپێشکەش کردنی نەزرەکانو قوربانیەکان بۆ مەزارەکانو گڵکۆی پیاو چاکان هاوبەش دانانی گەورەیە، هۆکارەکەشی سەرپێچی کردنو بە پێچەوانەوە جوڵانەوەی ڕێنوماییو سوننەتی پێغەمبەرەﷺ لەو شێوەی کەشەریعەتی

---

([204])إغاثة اللغفان(١/٢١٤، ٢١٥، ٢١٧).

ب ـ بەڵێ بەهۆی ئەو تاوانە گەورەی تاوانکارانو هاوەڵ دانەرانەوە ئەو مردوانە لەدوعا شەرعیەکانی زیندوان بێ بەش بون، چونکە سوننەت وایە هەر کەسێك نەك هەر چوە سەر گۆڕو گۆڕستانەکان بەڵکو هەرکەبەلاشیاندا تێ پەڕی سەلامیان لێ بکەیتو دوعاو داوای لێ خۆش بونیان بۆ بکەیت، بەڵام ئەوانە بەپێچەوانەوە ئەو مردوانە دەکەن بەهاوەڵی خواو خۆیان گومڕا دەکەنو ئەو مردوانەش لەدوعاو داوای لێ خۆ ش بون بێ بەش دەکەنو لەدو لاوە ستەم دەکەن، یەکەم ستەم لەخۆیان دەکەن کەئەو مردوانە دەکەنە شەریکی خواو لەبەریان دەپاڕێنەوەو داوایان لێ دەکەنو خۆیانی پێ کافر دەکەن، دوەمیش ستەم لەو مردوە دەکەن کەبەو دەردەیان دەبەنو لەخێرو بەرەکەتی دوعا بۆ کردنیان بێ بەشیان دەکەن. وەرگێڕ

خوا بۆی دیاری کردون کەدەبێ گۆڕەکانی لەسەر بێت. ئەویش ئەوەیە کەنابی خانوو جێگەی حەوانەوەو مزگەوتیان لەسەر دروست بکرێن، لەبەر ئەوەی کەئەگەر خانووگومبەتیان لەسەر دروست کراو، مزگەوتو مەزارو گڵکۆیان لەسەرو لەدەوره دروست کرا، نەفامو نەزانەکان وا گومان دەکەنو وا دەزانن کەئەو مردوانەی وا لەو گۆڕانەدا نێژراون سودو زیان بەخەڵکی دەگەیەنن و، پیرۆزنو بەهانای ئەو کەسەوە دێن ئەگەر هانایان بۆ بەرن، هەرگەسێك ڕویان تێ بکاتو داوایان لێ بکات هەرچی پێداویستیان هەیە بۆیان جێ بەجێ دەکەن ، بۆیە ئەوانیش گوایە لەپاداشتی ئەو چاکەیاندا نەزرو قوربانیان پێشکەش دەکەن، هەتا وای لێ هات بونە بتو خورافیاتو جگە لەخوای گەورە پەرستران ، ئەوەتە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {اللهم لاتجعل قبري وثناً يُعبد}(٢٠٥). ئەو دوعایەی بۆیە کرد کەشتێکی وا لەدوا ڕۆژدا دێتەی دی، ئەمەش هاتە دی لەزۆرێك لەگۆڕەکاندا لەولاتی شام، بەڵام گۆڕەکەی خۆی خوای گەورە بەبەرەکەتی دوعاکەی ﷺ خۆی پاراستی، هەر چەندە لەگۆڕەکەی ئەویشدا هەندێ سەرپێچی ڕوی داوە، لەلایەن هەندێ لەنەفامو نەزانە سەر بۆگەنەکانو خوراف بازەکانەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا ناتوانن بگەنە گۆڕەکەی چونکە گۆڕەکەی لەناو ماڵەکەی خۆی دایە نەك لەناو مزگەوتدا، و بەچەندان دیوار دەورە دراوە، هەروەکو زاناو ناوداری ئیسلام إبن القيم ـ رحمه الله ـ لەنونیەکەی خۆی دا گوتویەتی:

فأجاب ربُّ العالمين دوعاءه

وأحاط بثلاثة الجدران(٢٠٦)

******* ******* *******

---

(٢٠٥)رواه مالك وأحمد.

ب ـ واتە: خوایە گیان وانەکەی گۆڕەکەم وەك بتێك بپەرسترێت. وەرگێر

(٢٠٦) واتەك خوای گەورە دوعاکەی پێغەمبەریﷺ قبوڵ کردو بەسێ دیوار دەوری گۆڕەکەی دراوە.

## بەشی چوارەم

### ڕونکردنەوەی بەگەورە دانان و بە پیرۆز زانینی پەیکەرو بتە بیرەوەریەکان.

(التماثیل ـ پەیکەرەکان)کۆی(تمثال ـ پەیکەر)ە، کەبریتیە لەوێنەی بەرجەستە لەسەر شێوەو وێنەی مرۆڤ یاخود گیاندار، وهەر شتێکی تری گیان لەبەر وە(النصب ـ بت یاپەیکەر یاکۆتەڵ) لەبنەڕەتدا: بریتیە لەپەیکەرە بەردینەکان،وچەندان نیشانەوشوێنەوار (العَلَمُ)و پەیکەر کەهاوبەش دانەران حەیوان و قوربانیان لا سەر دەبڕین وقوربانیان بۆ دەکردن، هەروەها پەیکەرە بیرەوەریەکان: کۆمەڵە پەیکەرێك بون لەگۆڕەپانەکان و ئەو جۆرە شوێنانە دەیان چەقاندن و دایان دەمەزراندن، بۆ بیرەوەری و یادەوری گەورەکان و زەعیم و سەرکردەکان و پیاوە ناو دارەکانیان[٢٠٧].

پێغەمبەرﷺلەکێشان و گرتنی وێنە گیاندارەکان ئاگادارو وریای کردوینەوە، بەتایبەتیش گرتن و کێشانی وێنە کەسایەتیە گەورەکان و ناودارەکان وەك زانایان و پاشاو سەرکردەو پیێشەواو(ألعُبَّاد ـ ) ، جا ئەو وێنەیە چ لەڕێگەی کێشان و دروست کردن بێت لەسەر لەوحە یالەسەر کاغەز بێت، یاخود لەسەر دیوار یالەسە کراس و پۆشاك بێت، یاخود بەهۆی ئامێری تیشکی وێنە گرتنەوە بێت( واتە کامێرا۔ وەرگێڕ۔) کەلەڕۆژگاری ئەمڕۆدا باوە، یالەڕێگەی هەڵکۆڵینەوە( النحت) بێت، وەدروست کردنی وێنە لەسەر شێوەی پەیکەرو بت بێت. پێغەمبەرﷺ هەڵواسینی وێنە بەدیوارو هەر شوێنێکی تر قەدەغەو حەرام کردوە، هەروەها چەسپ کردن و دانان و دروست کردنی پەیکەری

---

([٢٠٧]) ئێستاش ئەو خو ونەریتە هەر باوەو دەبینین لەشارەکانداو لەسەر گۆڕەپانەکاندا کۆتەڵی سەرکردەوو زاناو هونەران و کەسایەتیە کۆمەلایەتیەکان دروست دەکەن گوایە بۆ ڕێز لێنانی ئەو کەسایەتیەیە کەئێستا لەژیاندا نەماوە ئەمە لەکلتوری ولاتانی ناموسڵمانەکانە، بەڵام بەداخەوە ئێستا لەولاتانی موسڵمانانیشدا کەهەمویان بونەتە دەوڵەتی عەلمانی و فریان بەسەر ئیسلامەوە نەماوەو هەرچی خوو نەریت و ئاکاری ولاتانی ناموسڵمان هەیە دەچیننەوەو یەکێ لەو خوو نەریتانە دروست کردنی ئەو پەیکەرو کۆتەڵە یادەوەریانەیە لەناو شاروو لادێ و ئاوەدانیەکاندا دروستیان کردوەو دروستی دەکەن گوایە بۆ ڕێز گرتنە لەو کەسایەتیە. منیش دەڵێم ئەگەر ڕاست دەکەن ڕێز لەو کەسایەتیە دەگرن داوای لێ خۆش بون بۆ خۆتان و بۆ ئەو کەسایەتیە لەبارەگای خوای گەورە بکەن و ئەوەی لەدروست کردنی ئەو کۆتەڵ و پەیکەرو بتە خەرجی دەکەن بیدەن بەماڵ و منداڵ و کەس و کارەکەی و جێگەیەك بۆ ئەوانیش دەگرێتەوەو دڵیشیان پێ خۆش دەبێت و ئەگەر نیەتیشتان خوا بێت لای خواش بەخێر(صدقە) بۆتان دەژمێردرێت و بۆ قیامەتی خۆشتان سودی لێ دەبینن بەپێچەوانەی ڕێگەی یەکەم دەچێتە ڕیزی بت پەرستی و خوای گەورەش لەخۆتان تورە دەکەن. وەرگێڕ.

قەدەغەو حەرام کردوە لەوانەش: دروست کردنو دانانو چەسپ کردنی پەیکەرو کۆتەڵە یادەوەریەکان، چونکە ئەمە شێوەو هۆکارێکە بۆ هاوبەش دانان ، یەکەمینو سەرەتای هاوبەش دانان لەناو گەلی نوحەوە لەسەر زەوی بەهۆی وێنە گریو دروست کردنی پەیکەرو کۆتەڵەوە سەری هەڵدا، کەلەناو گەلی نوحدا پێنج پیاو چاك هەبون کەبریتی بون لەوەد، نەسر، سواع، یەغوسو یەعوق، کاتێ مردن خزمو کەسو کارەکانیانو گەلەکەیان زۆریان پەرۆش بونو زۆر بۆیان دڵ تەنگ بون، شەیتان هەڵی خڵەتاندنو پێ ی گوتن: کەلەسەر شێوەی ئەو پیاو چاکانەیان پەیکەرو کۆتەڵ دروست بکەنو لەدیوەخانو مەجلیسەکانیاندا کەبەزۆری لێ ی دادەنیشنو تێ ی دا کۆ دەبنەوە دابنێنو هەمیشە با لەبەر چاوتاندا بنو بەناوی ئەو پیاو چاکانەوەش ناویان بنێن، ئەوانیش هەستان وایان کرد بەڵام یەکەمجار نەیان دەپەرستن، هەتا ئەو بەرەیە نەمانو بەرەکانی دوا ئەوان هاتن وئەوانی پێش خۆیان بیر چوەوە شەیتان وای لێ کردن کەبیان پەرستنو ئەنجام ئەو پەیکەرانە پەرستران([208]). کاتێ خوای گەورە پێغەمبەر نوحی ـ علیه السلام ـ بۆ ناردن لەو هاوبەش دانانەی کەبەهۆی ئەو وێنەو پەیکەرانەوە کەدایان نابون ئاگادارو قەدەغەی کردن، بەڵام گەلەکەی ئەو بانگەشەی ئەویان وەر نەگرتو قبوڵیان نەکرد، ولەپەرستنی ئەو وێنە دانراو و چەسپاوانە کەبو بونە بتو شتانێکی خورافی و دەیان پەرستن بەردەوام بون:﴿ وَقَالُوا لاَ تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلاَ تَذَرُنَّ وَدًّا وَلاَ سُوَاعًا ولاَ يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ سورة نوح: (٢٣).

ناوی ئەو پیاو چاکانەی کەلەسەر شێوەی ئەوان وێنەو پەیکەریان دروست کردن بۆ زیندو کردنەوەی بیرەوەریەکانیانو بەپیرۆزو بەگەورە دانانیان بو.

دەی سەیر بکەن کار بەچی گەیشت بەهۆی ئەم پەیکەرو کۆتەڵە یادەوەریانە لە هاوبەشی دانان بۆ خوای گەورەو پەرستنی غەیری خوا لەگەل خوادا، و لەسەرپێچیو دژایەتی کردنی ڕەوانە کراوانی خوا؟! کەئەنجام بو بەهۆی لەناو چونیان بەهۆی لافاوە گەورە بەناو بانگەکەی نوحەوە، هەروەها تورە بونی خوای گەورەو قێزەون بونو ناشیرینی ئەو گەلانە لای خوای گەورەو لەلای دروست کراوەکانی خوا بەگشتی([209])، ئەمە ئەوەت بۆ دەردەخات کەمەترسی

---

([208]) رواه البخاري.

([209]) هەروەها هاوبەش دانانی گەلی ئیبراهیم هەر بەهۆی پەرستنی پەیکەرو بت پەرستنو چەمینەوە بو بۆیان، هەروەها هاوبەشی پەیدا کردنی بەنو ئیسرائیلیەکانیش هەر بەهۆی پەرستنیو بەندایەتی کردن بو بۆ وێنەو پەیکەری گوێرەکەکە

وێنەو وێنە گرتن و پەیکەرو کۆتەڵ دروست کردن چەندە مەترسی داروگەورەیە، بۆیە پێغەمبەرﷺ نەفرەتی لەوێنە گران کردوە، وەهەواڵی پێداوین کەوێنە گران و وێنە کێشان و پەیکە تاشان بەهێز ترین و بەسفت و سوێ ترین ئازار کێشانێ ناو خەڵکن لەڕۆژی قیامەتدا، وەفرمانی بەسڕینەوەو لابردن و کوژانەوەی هەمو وێنەو ورد کردنی پەیکەرو کۆتەڵەکان کردوە، وە هەواڵی پێداوین کەفریشتە ناچنە ناو ماڵ و شوێنێك کەوێنەی لێ بێت، هەمو ئەوانە لەبەر خراپی و بەهێزی مەترسیەکانیەتی لەسەر ئوممەتی ئیسلامی لەبیرو باوەڕەکەیاندا(عقیـدتها)، چونکە یەکەمین و سەرەتای هاوبەش دانان لەسەر زەوی لەوێنەوە سەری هەڵ دا هەروەکو لەپێشتر ئاماژەمان پێ کرد، جاچ دانانی وێنەو پەیکەرو کۆتەڵ بێت لەشوێنی تێدا کۆبونەوەو مەجلیسەکاندا بێت، یان لەگۆڕەپان و فولکەو ناو باخچەکاندا بێت، ئەوە لەشەریعەتی خوا حەرامەو دروست نیە، چونکە هۆکارێکە بۆ هاوبەش دانان، و بۆگەن کردن و تێك دانی بیروباوەڕی موسڵمانان. ئەگەر کافران و بێباوەڕانی ئەمڕۆ ئەوکارە دەکەن، ئەوان هیچ بیروباوەڕکیان نیە تاپارێزگاری لێ بکەن، ئەو کارەو لاسایی کردنەوەی ئەوان بۆ موسڵمانان دروست نیە خۆ بەئەوان بچوێنن و لەو کارەدا بەشداریان بکەن و هاریکاریان بکەن، بۆ پاراستنی بیروباوەڕەکەیان کەچاوگ و سەرچاوەی هێزو توانا و بەختەوەری و سەرکەوتن و سەرفرازی موسڵمانانە، هەروەها نابێ بگوترێت: ئاخر ئێمە ئەو قۆناغەمان تی پەڕاندوەو بەتەنها خوا پەرستی و هاوبەش دانانمان ناسیوەو هەر ئەوەش دەکەین، نەخێر، چونکە شەیتان هەمیشە چاوەڕوان و سەیری بەرەی داهاتوو دوا ڕۆژ دەکات و هەمیشە لەبۆسە دایە بۆ موسڵمانان و بڕواداران هەر کاتێك نەزانی و نەفامی و ناحاڵی بونیان لەئاییەنەکەیان تێدا بەدی بکات یەکسەر ئەم هەلە دەقۆزێتەوەو لەخشتەیان دەبات، هەروەکو چۆن لەگەڵ گەلی نوحدا کردی، کاتێ زاناکانیان مردن و نەزانی و نەفامیان لەناودا بڵاو بوەوە، چونکە بابای زیندوهەرگیز لە فیتنەو ئاشوبی شەیتان ئەمین نیەو ئەمین نابێ، هەروەکو ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ گوتی:﴿ وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ﴾([210]).

---

کەسامری زێڕنگەر لەزێڕ بۆی دروست کرد بون، هەروەها هاوبەش دانانی گاورەکان بەهۆی پەرستنی خاچ بو کەدەیان گوت لەسەر شێوەی مەسیح ــ علیه السلام ـ دروستیان کردوە.

([210]) أ ــ سورة إبراهيم: (٣٥).

ب ـ واتە: خوایە گیان خۆم و منداڵ و وەچەکانم بپارێزی لەپەرستنی بت و بت پەرستی. وەرگێڕ.

## بەشی پێنجەم

### گاڵتە کردن بەئایین و سوکایەتی کردن بەحورمەتەکانی.

گاڵتە کردن بەئایین هەڵگەڕانەوەیە لەئیسلام، و بەتەواوی دەرچونە لەئایین، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ۞لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ ([211]).

ئەم ئایەتە: ئەوە دەگەیەنێت کەگاڵتە کردن بە خوای گەورە کوفرە، وگاڵتە کردن بەپێغەمبەری خوا کوفرە، وەگاڵتە کردن بەئایەتەکانی خوا کوفرە، جاهەر کەسێك گاڵتە بەهەر یەکێك لەم کاروبارانە بکات ئەوە گاڵتەی کردوە بەهەمویان. ئەوەی لەدوروەکاندا ڕوی دا: ئەوە بو گاڵتەیان بەخواو بەپێغەمبەرو هاوەڵەکانی دەکرد، و ئەم ئایەتە لەڕوی ئەواندا دابەزی.

گاڵتە کردن بەو کاروبارانە بەندن بەیەکتریەوە، ئەوانەی کەسوکایەتی بەبەتەنها خوا پەرستی پەرستنی خوای بەرزو بێ هاوتا دەکەن، وەداوا کردن و پاڕانەوە لەغەیری خوا لەمردوان بەگەورەو بەپیرۆزو بەڕاستی دەزانن، وەئەگەر فرمانی بەتەنها خوا پەرستی یان پێ بکرێت و لەهاوبەش دانان قەدەغە بکرێن و ئامۆژگاری بکرێن ئەوانەحددەت دەیان گرێت و لوت بەرەز دەبن و بەشۆخی وگاڵتە پێ کردنەوە سوکایەتی بەمە دەکەن و پێ یان پێ دەکەنن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُوًا أَهَذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولاً۞إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلاَ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾([212]).

گاڵتەیان بەڕەوانە کراوی خوا ﷺ کرد کاتێ پێ ی دەگوتن لەخوای گەورە بەولاوە هیچ کەس و هیچ شتێکی دیکە مەپەرستن و شەریك بۆ خوای گەورە دامەنێن ولەهاوبەش پەیدا کردن قەدەغەی دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن ئەوان شۆخی و گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵێ بەردەوام هاوبەش دانەران عەیب و خەوش و نەنگیان لەپێغەمبەران دەگرن و

---

([211]) أ ـــ سورة التوبة: (٦٥ـــ٦٦)..

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا لێك داوەتەوە. وەرگێر.

([212])أ ـــ سورة الفرقان (٤١ـــ ٤٢).

ب ـ واتە: کەتۆیان دەبینی ئەی محمد ﷺ بەگاڵتەو تیزێکەوە دەیان گوت: ئیهی.. ئەوەیە کەخوا بەپێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خۆی ناردویەتی؟!، خۆ خەریك بو لەخواکانی خۆمان لامان بداتو سەرمان لی تێك بدات ئەگەر ئارامو خۆڕاگر نەبوینایە! وەرگێر.

بەسوکایەتیو گومڕاییو شێت باسیان دەکەن، هەر کاتێك داوای بەتەنها خوا پەرستی(التوحيد)، واز هێنان لەو هاوبەش دانانو ئەو هاوبەشیە گەوەیەی وا لەدڵو دەرونیاندا هەیە لەبەگەورە دانانو بەڕاست زانینی هاوبەش دانان. هەر بەم شێوەیە دەبینی هەر کەسێك ئەم سیفاتانەی تێدا بێت بەهەمان شێوە ئەگەر کەسێك داوای واز هێنانو کشانەوەی لەو سیفەتی هاوبەش دانانەی وا تیایەتیو داوای بەتەنهاخوا پەرستی خوای گەورەی لێ بکات ئەوا گاڵتەو شۆخیو سوکایەتی پێ دەکاتو هەزاران ناوو ناتۆرەی بۆ دروست دەکات، خوای باڵا دەستو کار بەجێ دەفەرموێت:﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ﴾ سورة البقرة: (١٦٥).

هەر کەسێك دروست کراوێکی بەقەد خوا خۆش بوێت ئەوە هاوبەش دانەرە، وەپێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان خۆشەویستی بۆ خواو خۆشەویستی لەگەڵ خوادا، ئەوانەی کەگۆڕی پیاو چاکانیان وەك بتێك گرتوەو دەی پەرستنو بەندایەتی بۆ دەکەن، دەیان بینی کەگاڵتەو سوکایەتی ببوە دەکەن کەبەتەنها خوا پەرستیو بەندایەتی کردنە بەتەنها بۆ خوای گەورە، وەئەوەش بەڕاستو بەگەورەو بەپیرۆز دەزانن کەبەغەیری خوا بەندایەتی دەکەنو وەك تکا کارانێك وەریان گرتون، ئامادەنو زۆریان لا ئاساییە کەسوێند بەدرۆ بەخوا بخۆن(اليمين الغموس). بەڵام هیچ کامێکیان زاتی ئەوە ناکەنو ئامادە نین سوێند بەدرۆ بەشێخەکەیان بخۆن، وەزۆرێك لەو گروپە جۆر بەجۆرانە دەبینی یەکێك لەوانبیروباوەڕی وایە کەهانا بردنی بۆ شێخەکەی - جا چ بەگۆڕەکەی بێت یابەگۆڕی غەیری ئەو بێت - سود بەخش ترو باشترە لەوەی کەهانا بۆ خوار پەروەردگار بەرێت و داوا لەخوا بکات لەمزگەوت لەکاتی سپێدەدا! وەگاڵتەش بەو کەسە دەکات کەلەڕێگەکەی ئەو لایداوەو بەرەو ڕێگەی بەتەنها خوا پەرستی چوە، وەزۆرێك لەوانە مزگەوتەکان تێك دەدەن، و مەزارەکان دروست دەکەن، ئایا ئەمە لەگاڵتە کردنو بەسوك زانینی یان نیە بەخواو بەئایەتەکانی خواو بەپێغەمبەرەکەی، و بەگەورە زانینو پیرۆز دانانی هاوبەش دانیان نیە؟([٢١٣]).

---

([٢١٣]) مجموع الفتاوى:(١٥/ ٤٨، ٤٩).

ئەم سیفاتو ئەم خوو ئاكارو نەریتانە ئەمڕۆ گەلێك زۆرن لەو كەسانەی كەكەوتونەتە داوی گۆڕ پەرستیەوەو لەگۆڕ پەرستانی ئەمڕۆدا گەلێك زۆرە.

**وەئەم گاڵتە پێ كردنو سوكایەتیەش دو جۆری هەیە:**

جۆری یەكەم: گاڵتە پێ كردنی ڕاشكاوانە(**الإستهزاء الصریح**): وەك ئەوەی كەئایەتی لەڕودا هاتە خوار، و ئەوەی كەدو ڕوەكان بەگاڵتە پێ كردنو بەتوانجەوە بەهاوەڵانیان گوت: ئەو قورئان خوێنانەی ئێمە كەمەبەستیان لەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بو، (سك زلنو هەرگیز تێر ناخۆنو هەر خەریكی ورگیانن(دەی جا ئەوە چی یان پێ دەكرێ لەبەر ورگیان - وەرگێڕ -)، وەلەوانە درۆزنترنین لەدنیادا، ، وەترسنۆك ترین كەسانێكیشن لەكاتی ڕو بەڕو بونەوە لەگەڵ دوژمناندا[٢١٤])، ئەمانەو قسەگەلێكی تری گاڵتە جاڕیانە، هەروەها وەك قسەی هەندێكیان كەبەموسڵمانانیان گوت: ئەم ئایینەی ئێوە پێنجەمین ئایینە، هەروەها قسەیەكی تریان كەدەیان گوت: ئایینەكەتان نادانوكەودەنو نەزانە، وەقسەیەكی تریان ئەگەر فرمانكاران بەچاكەو قەدەغەكارانی خراپەیان دەبینی دەیان گوت: بەتێزو بەگاڵتەجاڕیەوە دەیان گوت: ئەوە ئەهلی ئایینتان بۆ هاتن، ئەمانەو وێنەی قسەی ناشیرینو قێزەونی تر كەناژمێردرێنو نایەنە ئامار زۆر بەناخۆشی نەبێت كەگەلێكیان لەو قسانە ناخۆش تر بون كەئایەتیان لەڕودا هاتە خوار.

جۆری دوەم: گاڵتە پێ ناڕاشكاو یان ناڕاستەوخۆ(غیر صریح): ئەوەش بریتیە لەو دەریایە كەهیچ كەنارێكی نین، وەك: هێما یا ئاماژ كردن بەچاو واتە چاو قوچاندن(الرمز بالعین)، وزمان لێ دەرهێنان، و لیچ لێ بادان، تەشەر لێدان بەدەست لەكاتی خوێندنەوەی

[٢١٤]) درێژەی ئەم باسە ئەوە بو كەكۆمەڵێك لەدو ڕوەكانی سەردەمی پێغەمبەرﷺدەهاتن بۆ لای پێغەمبەرو هاوەڵانی لەڕێگادا ئاوا لەبەر خۆیانەوە شۆخیو گاڵتەیان بەهاوەڵانی پێغەمبەر دەكردو دەیان: تۆ سەیری ئەو قورئان خوێنانا ناكەن كەمەبەستیا لەهاوەڵانی پێغەبمەو پێغەمبەرﷺ بون ورگ زلانی ئێمەنو زمام درۆ ترین كەسانێكن ، خۆ لەكاتی ڕو بەڕو بونەوەیاندا لەگەڵ دوژمنانیاندا ترسنۆك ترین كەسێكنو هەرگیز خۆ ڕاناگرن، ئیهی .. ئەو محمدە دەیەوێ بەو جۆرە كەسانە كۆشكو تەلارو وڵاتو دەسەڵاتەكانی ڕۆمو قەیسەرو كیسرا داگیر بكات؟!!! بەڵام پێش ئەوەی ئەو بێباوەڕە دوڕوانە بگەنە لای پێغەمبەرﷺ خوای گەورە سروشی بۆ ناردو هەواڵی گاڵتە پێ كردنی ئەو دوڕوانەی پێ ڕاگەیاندو هەر لەدنیادا سوكو ڕیسوای كردنو دەمیان بو بەتەڵەی تەقیو پەردەی ڕەشی لەڕو هەڵ ماڵین، هەروەكو دەفەرموێت: [وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ] سورة التوبة: (٦٥).

کتێبەکەی خوا واتە قورئانی پیرۆز، یاخود سوننەتی پێغەمبەرﷺ، یاخود لەکاتی فرمان کردن بەچاکە،و قەدەغە کردن لەخراپە ([215]).

هەروەها وێنەی ئەمە کەهەندێکیان دەڵێن: ئیسلام واتە بەرنامەی ئیسلام بۆ سەدەی بیستەم(و سەردەمی ئێستا - وەرگێڕ) نابێتو دەست نادات، بەڵکو بەکەڵکی چەرخەکانی ناوەڕاست دەگرێت( یابەرنامەی چەرخە سواوەکانە وەك هەندێ سوکەڵەو عەقڵ ترش‌و تفتو فام کاڵەکانی ئەم سەردەمو ئەم چەرخە دەیڵێن - وەرگێڕ -))، و بەرنامەیەکی دوا کەوتوییو کۆنە پەرستیە، وتوندو تیژیو وحشیگەری تێدایە، لەبواری سزاکانی سنور لێدانەکان(الحدود)و سەرزەنشتیەکاندا توندو تیژو بی بەزەییە، وەستەمی لەئافرەت کردوەو مافەکانی نەداوە، تەلاق دانی ڕێگە پێداوەو نەرمی‌وشلی نواندوە، فرە ژنی ڕێگە پێداوە. هەروەها دەڵێن: حوکم کردن بەیاسا دەست کردەکان لەدەستورو یاساورێسای وڵاتدا لەحوکمی ئیسلام باشترە، وەلەڕوی ئەو کەسەی کەبانگەشەی بەتەنها خوا پەرستی دەکاتو بەندایەتی کردن بۆ گڵکۆی پیاو چاکان‌و گۆڕ پەرستی ڕەت دەکاتەوە دەڵێن: ئەوە زێدەڕەوە قاچی لەبەرەی خۆی پتر ڕاکێشاوە(متطـــرف))، دەیەوێت کۆمەڵی موسڵمان پەرتەوازە بکات، یاخود پـێ ی دەڵێن: ئەوە وەهابیە، یاخود ڕێبازگە یامەزهەبی پێنجەمە، ئەمەو گەلێکی تری لەم جۆرە قسە هەڵیتو پەڵیتانە هەر هەموویان جنێودان‌و سوکایەتی کردنە بەئاین و بەموسڵمانان، هەروەها گاڵتە کردنە بەبیرو باوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام، ولا حول وةلا قوة إلاّ بالله . هەروەها لەوانە: گاڵتە کردنیان بەو کەسانەی کەدەستیان گرتوە بەسوننەتێك لەسوننەتەکانی پێغەمبەرﷺو دەڵێن: ئاین‌و ئایینداری بەمو نیە، وەك گاڵتەو سوکایەتی کردنێك بەڕیش بەردانەوەو ڕیش نەتاشین، وگەلێ وشەو قسەی پیس‌و بۆگەنی تری لەم جۆرانە.

---

([215]) مجموعة التوحيد النجدية:صفحة٤٠٩.

## بەشـی شەشەم

## حوکم کردن بەغەیری بەرنامەی خوا.

لەداخوازیو داواکاریەکانی بڕوا بون بەخوای بالاّ دەستو کـار بـەجێ وبەندایـەتی بۆ کردنی: ملکەچ بونـە بـۆ حـوکمی خـواو ڕازی بـون بەشـەریعەتەکەی ئـەو، وگەڕانـەوە بـۆ کتێبەکەی واتـە بـۆ قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی لـەکاتی جیـاوازیو بـون جیاڕاییو قسەو گفتارو ئاخاوتنەکاندا، ولـەبیرو بـاوەڕو لەمشـتو مڕەکانـدا، ولـەخوێنو لەتۆڵەکانو لەماڵو سامانەکان، وباقی مافەکانو لەهەموبوارەکانی تری ژیاندا هەر کاتێـك کێشەو تەنگژەو کەوتنە بەریەکیەك دروست بو، خوای گەورە حاکمەو حوکمو بڕیار دانو یاسا دانان واتە تەشریع تەنیا بۆ خوای گەورەیە، پێویستە لەسەر بەرپرسانو سەرکردەو حاکمەکان لەسەر ڕوی زەوی کەبەو بەرنامەو بەو یاسـاو ڕێسـاو شـەریعەتەی خـوا حـوکم بکەن، هەروەها پێویستە لەسەر خەڵکیش بەگشتی(الرعية) حوکم بەو بەرنانەو شـەریعەتە بکەن کەخوای گـەورە بـۆی ناردونـە خـوار کەکەتـەلۆکی ژیـانی مرۆڤەکانـە لەسـەر زەوی کەبریتیە لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، خوای بەرزو بـی هاوتـا لـەڕوی بەرپرسانو سەرکردەکانو والیەکانـدا دەفـەرموێت:﴿ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ ﴾[٢١٦]، هـەروەها خـوای گـەورە لـەڕوی بەردەستەکانیش(الرعية)دا دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ سورة النساء: (٥٩). (واتاکەیمان لەڕابردودا لێك داوەتـەوە - وەرگێڕ -).

---

([٢١٦]) أ ــ سورة النساء: (٥٨).

ب ـ واتە: خوای گەورە فرمانتان پی دەکات ئەسپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان بگێڕنـەوە جـا سپاردەکان زاراوەیـەکی فراوانەو هەمو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە کەسەرتۆپی هەمویان ئەم بەرنامەو شـەریعەتو ئـایینی ئیسـلامەیە، وەئەگـەر بەسەر خەڵکی و لەنێوان خەڵکی دا حوکمێکتان کردو کران بە سەرکردەو برا گەورە ئەوا بـەداد پەروەرانـە حـوکمو بڕیـار بدەن،مافی کەس نەدەن بەکەسو ستەمو لەکەس مەکەنو دادپەروەر بنو هەمو کەسێك بەیەك چاو سەیر بکەن. وەرگێڕ.

هەروەها ڕونی کردۆتەوە کەبڕواو باوەڕ(الإيمان) لەگەڵ حوکم کردن بەغەیری بەرنامەی خوا دا کۆ نابنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ سورة النساء: (٦٠). هەتا فەرمودەی خوای گەورە :﴿ فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ سورة النساء: (٦٥). (هەروەها واتای ئەم دو ئایەتەشمان لەڕابردودا نوسیوە ـ وەرگێڕ).

خوای پاکو بێگەرد قەدەغەی کردوە ـ بۆ دڵنیا تر کردنو جەخت لەسەر کردنەوە سوێندی خواردوە بەپەروەردگاری محمدﷺ کەخوای گەورە خۆیەتی ـ بڕوای نیە ئەوە کەسەی کەحوکمو حەل کردنو کردنەوەی گرێ کوێرەکانی کێشەو تەنگژەکانی نێوان خۆیان هەموی نەهێننە لای تۆو بەتۆ چارەسەری کێشەکانیان نەکەن واتە بەبەرنامەو شەریعەتی خوا کێشەکانیان حەل نەکەنو حوکم بەو قورئانە نەکەن کەخوا بۆی ناردونە خوار، هەروەها دوای ئەوەی کەچارەسەریەکەت بۆ دانانو کێشەکەت بۆ حەل کردن بەحوکمی تۆ دەبێ ڕازی بنو خۆش تەسلیم بکەن، هەروەکو حوکمی بەکافر بونی والیو سەرکردەو بەرپرسان داوە ئەوانەی کەحوکم بەو بەرنامەو دەستورو یاساو ڕێساو شەریعەتە ناکەن کەخوای گەورە بۆی ناردونە خوار، وەبەستەمو بەدەرچون لەئایینی داناوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ سورة المائدة: (٤٤).، :﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ سورة المائدة: (٤٥).،:﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ سورة المائدة: (٤٧). (هەروەها واتای ئەم ئایەتانەشمان لەبەشەکانی ڕابردودا شی کردۆتەوە ـ وەرگێڕ).

گومانی تێدا نیە کەدەبێ حوکم تەنیا بەو بەرنامەو دەستورە بکرێت کەخوای گەورە ناردویەتیە خوار وەك کەتەلۆکێك بۆ هەڵسوڕاندنی ژیانی مرۆڤەکان لەسەر ڕوی زەوی، وەحوکم کردن بەو بەرنامەو دەستورە دەبێ لەهەمو بەندو بوارەکانی کێشەو تەنگژەکاندا بێت لەقسەو گفتارو مشتو مڕە تێکۆشانیەکانی(الإجتهادية) نێوان زاناکاندا، هیچ بەڵگەو بڕو بیانویەك وەرناگیرێت یا هیچ حوکمێك وەرناگیرێتو قبول نیە مەگەر

ئەوەی کەلەگەڵ قورئـانو سـوننەتدا بێتـەوەو دەلالـەتی لەسـەر بکـات، بـەبێ هـیچ دەمارگیریەکی مەزهەبیو، لایەنگیری پیشەواکان(الإمام)، لەهـەمو سـکالاّ بـەرزکراوەکانو بەرگری کردنەکانو گشت مشتو مڕو کێشەو تەنگژەکانو لەگشت مافەکاندا، نـەك تـەنیا لـەکاروباره کەسـایەتیەکاندا ، هـەروەکو لەهەنـدێ لەدەوڵەتـە ئیسـلامیەکاندا ئـەنجام دەدرێت، چونکە ئیسلام کۆمەلێك یاساو رێساو دەستورنو دەبـێ هـەمویان کاریان پـێ بکرێتو لەیەك جیا نابنەوە، خوای بەرزو بالا دەست دەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً ﴾ ([217]). هەروەها خـوای دەوره دەفـەرموێت:﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ﴾([218]).

هەروەها پێویستە شوێن مەزهەبەکانو مەنهەجو پرۆگرامـە هاوچـەرخەکانیش بکـەویتو قسەو گفتاری پێشەواکان بگێڕیتەوە بۆ قورئانو سوننەت، هەر شـتێکی واتـە هـەر فتواو هەر قسـەو گفتارێکیـان لەگـەڵ قورئانوسـوننەت هاتـەوە ئـەوە وەری بگـرنو کـاری پـێ بکەن، وەهەر شتێکیش پێچەوانەی قورئانو سوننەت بو کاری پێ نەکەنو فڕێ ی بدەنو ڕەتـی بکەنـەوە بـەبێ دەمـارگیریو لایـەنگیری هـیچ مەزهـەبو لایـەنێك، بەتایبـەتیش لەبوارەکانی بیروباوەڕدا(العقيدة)، چونکە پێشەواکان ـ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ـ خۆیان بەم شێوەیە ئامۆژگاریان کردوین، ئەم شێوەیە ڕێبازو مەزهـەبی گشـتیانە، هـەر کەسـێك سەرپێچی ئەم ئامۆژگاریەیان بکات ئەوە حاشا شوێن کەوتـەی ئـەوان نیـە، هـەر چـەندە سەر بـەوانیش بێـت، ئـەوە لـەو کەسـانەیە کـەخوای گـەورە دەربارەیـان دەفـەرموێت:﴿ اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ ﴾ سورة التوبة: (٣١).

ئەم ئایەتە بەتەنیا لەگەڵ گاورەکانی نیە بەڵکو هەمو ئـەو کەسـانە دەگرێتـەوە کـەهاو وێنەی کاری ئەوان ئەنجام دەدات، هەر کارێكو هـەر شـتێك پێچـەوانەو سەرپێچی ئـەوە بێت کەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی فرمانی پێ کردوین بەوەی کەحوکم کردن لـەنێوان

---

([217]) أ ــ سورة البقرة: (٢٠٨).

ب ـ واتکەیمان لەرابردوا لێك داوەتەوە ـ وەرگێڕ).

([218]) أ ــ سورة البقرة: (٨٥).

ب ـ واتە: ئایا بڕوا بەهەندێکی قورئان دەهێننو بەهەندێکی تری نا دیارە خوای گەورە ئەمەی قبوڵ نیە دەبێ بڕوات بەهەموی هەبێتو حوکم بەهەموی بکەیت. وەرگێڕ.

خەڵکی دا بەغەیری بەرنامەو دەستورو یاسای خوا بکرێت، یان شوێن کەوتنی ئەوەی هەواو ئارەزوەکانی خۆی داوای دەکاتو جڵەو شۆڕ کردن بۆ نەفسو ئارەزوەکانی خۆی، ئەوە پەتی ئیسلامو باوەڕ(الإیمان)ی لەگەردنی خۆی داماڵیوە، هەر چەندە بشڵێت من بڕوا دارم، خوای گەورە ئەو کەسانەی ناوێت کەبەدوای ئەم ڕێبازە دەکەون واتە جڵەوی خۆی دەداتە دەست نەفسو شەیتانو هەواو ئارەزوەکانی و دوای بەرنامەی خوا ناکەون.، زۆر بەتوندی بەدرۆیان دەخاتەوە کەدەڵێن بڕواداریںو پڕوپاگەندەی بڕواداری خۆیان دەکەن، ئەوتە دەفەرموێت:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ سورة النساء: (٦٠). (واتەکەیمان لەڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ). ئەوەی لەواتای وشەی(یزعمون) دا هاتوە کەنەفی کردنو بەدرۆ خستنەوەی باوەڕەکەیانە(إیمانهم)، چونکە زاراوەی(یزعمون) بەزۆری بۆ ئەو کەسە بەکار دێت کەدەعوایەك واتە سکاڵایەك بەرز دەکاتەوە کەدرۆی تێدایە، لەبەر سەرپێچی یا پێچەوانەی کردەوە چاکەکەی یاخراپەکەی، و ئەنجام دانی کردەوەیەك کەددانی پێدا نانێتو دەیەوێت پەردە پۆشی بکاتو بیشارێتەوە، ئەمە ڕێك وەك ئەوەیە کەخوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت:﴿ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ ﴾ سورة النساء: (٦٠).(واتە: فرمانیان پێ کرا بو کەبڕواتان بەتاغوت نەبێت، هەر شتێك بەغەیری خوا بپەرسترێت ئەوە تاغوتە ـ وەرگێڕ). چونکە بڕوا نەبون بەتاغوت پایەیەکە لەبیروباوەڕی بەتەنها خوا پەرستی، هەروەکو لەئایەتی(البقرة)دا[٢١٩] هاتوە، ئەگەر ئەم پایە نەهاتە دی، ئەوە ئەو کەسە بەتەنها خوا پەرست نیە، وەبەتەنها خوا پەرستی بنچینەو بنەمای باوەڕە(الإیمان) کەهەمو کاروکردەوەکانی پی چاك دەبنو دەیان هێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست، وە بەبێ بەتەنها خوا پەرستیش هەمو کردەوەکان هەڵ دەوەشێنەوەو فاسد دەبن، هەروەکو ئەمە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە بەڕونی دەردەکەوێت:﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ ﴾ (واتە هەر کەسێك بێ باوەڕ بێت واتە بڕوای بەتاغوت نەبێتو بڕوای

---

([٢١٩]) واتە فەرمایشتی خوای بەرزو بی هاوتا کەدەفەرموێ:[ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ ] سورة البقرة: (٢٥٦).

تەواوی بەخواو بەپێغەمبەری خواو بەرنامەکەی خوا هەبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە دەستی بەپەتی خوا واتە بەبەرنامەو دەستورو یاساو ڕێسایەکی زۆر پتەو توندو تۆڵەوە گرتوە کەبەنامەو دەستوری خوایە ـ وەرگێڕ).

هەروەها نەفی باوەڕ(الإيمان)ی لەو کەسانە دەکات کەحوکم بەو بەرنامەو دەستورو یاسایە ناکات کەخوای گەورە ناردویەتیە خوار واتە ئەو کەسە باوەڕی نیەو بێ باوەڕە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەحوکم کردن بەشەریعەتو بەرنامەو دەستوری خوا باوەڕداریو بەتەنها خوا پەرستیە، وەبەندایەتی کردنێکە لەبەندایەتی کردنی خواو پێویستە لەسەر هەمو موسڵمانێك کەدەستی پێوە بگرێتو بڕوای تەواوی پێ هەبێتو حوکمی پێ بکات، نابێ شەرعی خوا تەنیا بۆ کارسازیو چاکگوزاری لەنێوان خەڵکیو بۆ دەستەبەر کردنی ئاسایشو هێمنایەتی بێتو بەس، هەروەکو هەندێ کەس تەنیا تیشك دەخەنە سەر ئەم بوارە واتە شەریعەت تەنیا بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنن، ولایەنەکەی تری پشت گوێ دەخات، خوای پاكو بێگەرد سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە شەریعەتی ئیسلام تەنیا بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەکار دەهێنن، و بێ ئەوەی بۆ پەرستشو بەندایەتی بەکاری بهێنێت، خوای پاكو بێگەرد دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ۞وَإِن يَكُن لَّهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ﴾([220])

([220])أ ـ سورة النـــور (٤٨ـ٤٩).

ب ـ واتە: ئەگەر ئەو دو ڕوو بڕوا بێ هێزانە داوایان لێ بکرێت کەحوکمی خواو پێغەمبەر بەکار بهێنن لەنێوان خۆیاندا لەبری هەواو ئارەزوەکانی خۆیان ئەوانە هەندێکیان پێ ی ڕازی نابنو پشتی تێ دەکەن، بەڵام ئەگەر بزانن حوکم کردن بەحوکمی خوا لەبەرژەوەندی خۆیاندایەو قازانجیانە ئەوە زۆر زوو بەئاسانی دێن بەپیری حوکمی ئیسلامو حوکمی پێ دەکەن. بەداخەوە ئێستا لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆربەی زۆری موسڵمانان ئەگە حوکمی شەریعەتی خوا لەبەر ژەوەندی خۆیاندا بێت ئەوا نەك هەر پێ ی ڕازین بەڵکو پێشی لەسەر دادەگرنو پەلەشی بۆ دەکەن، بەتایبەتی سەرکردەو بەرپرسانی وڵاتانی ئیسلامی. ئەگەر حوکمی ئیسلام لەگەڵ هەواو ئارەزوەکانی ئەوەاندا بێتەوە ئەو حوکمی ئیسلامیان قبوڵە دەنا بەپێچەوانەوە هەرگیز قبوڵیان نیە و ڕو دەکەنە غەیری حوکمی ئیسلامو ڕازی نابن حوکم بەبەرنامەو شەریعەتی ئیسلام بکەنو قورئانو سوننەت دەستورو یاسای وڵاتەکەیان بێت، بەڵکو حوکمو دەستورو یاسای دەستکردی مرۆڤی کورت عەقڵی دروستکراوی دەستی خوای پەروەردگاری جیهانیان دەکەنە دەستورو یاسای وڵاتی خۆیانوسەرمەشقی حوکمڕانی خۆیانو ڕازی نابن ناسنامەی وڵاتو نەتەوەکەیان بەناسنامەی ئیسلام بناسرێتەوە. بەڵکو

ئەوانە تەنیا گرنگی دەدەن بەوەی کەهەواو ئارەزوەکانی خۆیان دەیخوازێت‌و داوای دەکات، وئەوەی پێچەوانەی ئارەزوەکانی خۆیان بێت وەلای دەنێن‌و ڕەتی دەکەنەوە، چونکە بەندایەتی‌و پەرستشی بۆ خوا ناکەن بەحوکم کردن‌و گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

## حوکم کردن کردن بەحوکمێك غەیری بەرنامەو شەریعەتی خوای گەورە :

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ سورة المائدة: (٤٤). لەم ئایەتە پیرۆزەدا: هاتوە کەحوکم کردن بەغەیری ئەوشەریعەت‌و یاساو ڕێسایەی کەخوای گەورە ناردویەتیە خوار کوفرە، ئەم کوفرە هەندێ جار کوفری گەورەیەو پێ ی لەئایین دەردەچیت، هەندێ جاریش کوفری بچوکەو پێ ی لەئایین دەرناچیت، ئەمەش بەپی حاڵی ئەو حاکم‌و ئەو سەرکردەو بەرپرسە، ئەگەر پێ ی وابێت کەحوکم کردن بەو دەستورو یاساو ڕێساو شەریعەتەی کەخوای گەورە ناردویەتیە خوار واجب نیە، و سەرپشکە تێ ی دا، یاخود سوکایەتی بەحکم‌و بەرنامەی خوا بکات، وەباوەڕی وابێت کەغەیری یاساو ڕێساو دەستورو سیستمە دەستکردەکان لەحوکم‌و بەرنامەو دەستورو یاساو ڕێساو سیستمی خوای گەورە باشترو چاکترە یان یەکسانن، یاخود بەکەڵکی حوکمی ڕۆژگاری ئەمڕۆ نایەت، یاخود پشت کردنی لەشەریعەت‌و بەرنامەو دەستوری خوای گەورەو حوکم کردن بەبەرنامەی دەستکردو بێباوەڕان بۆ ڕازی کردن‌و سەرنج ڕاکێشانی کافران‌و بێباوەڕان‌و دوژمنانی خواو ئیسلام‌و موسڵمانان‌و دوڕوەکان بێت، ئەمە کوفری هەرە گەورەیەو پێ ی لەئیسلام دەردەچێت، وەئەگەر باوەڕی وابێت حوکم کردن بەبەرنامەو شەریعەتی خوا واجبە، وەزانستی بەو ڕاستیە هەبێت‌و بەلام لێ ی لاداوە، لەگەڵ ددان نانی بەوەی کەلەسەر ئەو کارەی شایستەی سزا دانە، ئەوە ئەو کەسە یاخی بوەو سەرپێچی خوای کردەوە، پێ ی دەگوترێت کافر بەکوفرێکی بچوك، بەڵام ئەگەر نەزان‌و نەفام بو بەحوکمی خوا لەگەڵ هەوڵ دان‌و خستنە کاری توانای خۆی بۆ شارەزا بون‌و فێر بونی حوکمی خوای گەورە، بەڵام هەڵەی کردو

---

پێ یان وایە مارکسیەت‌و دیموکراتیەت بوەتە بەشێك لەکلتوری وڵات‌و نەتەوەکانیان‌و هەمو چەمکەکان لەژێر بەیداخی دیموکراتیەتدا بەئیسلامیشەوە دەحەوێنەوە. وەرگێڕ، لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٩٠٧-٩٠٨.

بەهەڵەدا چو، ئەوە هەڵەیەو نەی پێکاوەو پاداشتێکی هەیە لەسەر ئەو تێکۆشانەی، وئەو هەڵەیەی لێبوردراوە([221]).

وەئەمە لەحوکمێکی تایبەتو کێشەو تەنگژەیەکی تایبەتی دا دەبێت.

بەڵام حوکم لەکێشەو تەنگژە گشتی یەکاندا جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەمەی رابردودا، شێخی ئیسلام إبن تیمیة([222])گوتویەتی:(ئەگەر دادوەر دیندار بو، بەڵام ئەگەر بەنەزانی حوکمی کرد، ئەوە لەئەهلی ئاگرە، بەڵام ئەگەر زانا بو بەڵام بەپێچەوانەی ئەو هەقەی کە دیزانێت حوکم بکات، ئەوە لەئەهلی ئاگرە، بەڵام ئەگەر حوکمی بەنادادپەروەرانە کردو نەشی زانی ئەوە چاکتر وایە لەئەهلی ئاگر بێت، ئەمە ئەگەر حوکمێك بو لە کێشەی کەسیکدا.

بەڵام ئەگەر حوکمی دەکرد بەجوکمێکی گشتی لەئایینی ئیسلامدا، و راستی کردە ناڕاست، ناڕاستیشی کردە ڕاست، سوننەتی کردە داهێنان(بدعة)، داهێنانیش بەسوننەت دانا، و چاکە بکاتە خراپە،و خراپەش بکاتەچاکە، وەقەدەغەی ئەوە بکات کە خواو پێغەمبەرەکەی فرمانی پی دەکەن قبولّی نەبێتو فرمان بەوە بکات کەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردوە، ئەمەشیان ڕەنگو جۆرێکی ترە کەخوای پەروەردگاری جیهانیان حوکمی تایبەتی لەگەڵ دا دەکات، کەخاوەنی ڕۆژی قیامەتە، کەسوپاسو سوپاسگوزاری لەسەرەتاوە تاکۆتایی هەر بۆ ئەوە:﴿ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ سورة القصص: (٨٨). ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ سورة الفتح: (٢٨).(واتەکەیمان لەڕابردودا نوسیوە ـ وەرگێڕ).

هەروەها گوتویەتی:(گومانی تێدا نیە کەبڕوای وانەبێت کەحوکم کردن بەوەی کەخوای گەورە بۆپێغەمبەرەکەی ناردۆتە خوار ئەوە کافرە، وەهەر کەسێك ئەوە بەحەڵاڵ بزانێت کەبەوە حوکم بکات کەبۆ خۆی دەیبینێتو بەڕاستی دەزانێت ئەوە ڕاستو دادپەروەریە بی ئەوەی شوێن ئەو بەرنامەیە بکەوێت کەخوا ناردویەتیە خوار، ئەوە کافرە، هیچ ئوممەتێك نیە کەفرمان نەکات بەحوکمی دادپەروەرانە، وئەوەی کەگەورەکانیان دەیبینن لەوانەیە ئەو دادپەروەرانەیە لەدینەکەی دا هەبێت، بەڵکو زۆرێك لەوانەی کەخۆیان بە موسڵمان دەزانن و خۆ دەدەنە پاڵ ئیسلام حوکم بەعاداتو خوو ڕەوشتەکانی خۆیان دەکەن کەخوای گەورە هیچی دەربارە

---

([221])شرح الطحاوية صفحة٣٦٣ـ٣٦٤.

([222]) مجموع الفتاوى(٣٥/٣٨٨).

نەناردۆتە خوارو پێ ی ڕازی نیە وەکو قسە وقسەڵۆکەکانی ناو بیابان(واتە عادەتو نەریتەکانی باوو باپیرانیان)، ئەمیرو حوکم دارەکانیان گوێ لەمستن(مطاعين) بۆ ئەم عادەتو نەریتانە، و وادەبینن ئەوەی کە پێویستە حوکمی پێ بکرێت جگە لەقورئانو سوننەت ئەو عاداتو خوو نەریتانەیە، وە ئەمەش خۆی لەخۆی دا کوفرە، زۆرێك لەخەڵکی موسڵمان بون، بەلام حوکم بەهیچ ناکەن تەنیا بەعادەتو نەریتەکان نەبێتن کە گوێ لەمستەکان(المطــاعون) فرمانیان پـی دەکەن ئەمانە ئەگەر زانیان کەهیچ حوکمێکیان بۆ دروست نیە تەنیا ئەوە نەبێت کەخوای گەورە بۆی ناردونە خوار، کەچی پابەند بەو حوکمە نابن، بەڵکو حوکم کردن بەپێچەوانەی ئەوشەریعەتو بەرنامەی کەخوا بۆی ناردونە خوار بەڕاستو بەحەڵاڵو ڕاست تر دەزانن ئەمانە کافرن)...تەواو([223]).

شێخ محمد کوڕی إبراهيم گوتویەتی:(بەڵام ئەو کەسەی کەدەربارەی گوتراوە کوفری خوار کوفرە، ئەوەیە کەئەگەر حوکمی بەغەیری بەرنامەی خوا کرد وێرای بڕوا بونی بەوەی کەیاخی بوە، ئەوە بۆ ئەو کەسەی کەئەمەی جارێك یان پتر ئەنجام دابێت، بەڵام ئەوەی کەیاساکان دەستکاری دەکاتو ڕێکیان دەخاتودەیان هێنێتە ژێر دەستو پاکتاویان دەکات ئەوەش کوفرە، وەئەگەر بڵێن: ئێمە هەڵەمان کردوەو حوکمی شەریعەتی خوا ڕاست ترو دادپەروەر ترە، ئەمەش کوفرەو ڕەخنەی لەئاین گرتوە)([224]).

جەنابی شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت جیاوازی کردوە لەنێوان حوکمی کەمی پابەشی(الجزئي) کەدوبارە نابێتەوە،و لەنێوان حوکمی گشتی دا کەژێدەروسەرچاوەیە بۆ هەمو حوکمێك، یاخود زۆربەیەتی(غالبها)، وەبڕیاری لەسەر داوە کەئەوە کوفرەو بەڕەهایی ڕەخنەیە لەئایین، ئەوەش لەبەر ئەوەی کەهەر کەسێك دەستی بەبەرنامەوشەریعەتی ئیسلامەوە ناو دوری خستەوەو، ودەستورو یاسای دەستکردی هێناو لەجێگەی شەریعەتی خوای داناو حوکمی بەو کرد لەبری دەستورو یاساو ڕێسای خوای گەورە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەو کەسە وا دەبینێ کەیاساو دەستوری دەستکردی مرۆڤی ئەقڵ کورت لەشەریعەتو بەرنامەکەی خوا باشترو گونجاو ترە، ئەمەش هیچ گومانی تێدا نیە کەکوفری گەورەیەو لەئایینی ئیسلام دەچێتە دەرو بەتەنها خوا پەرستی هەڵ دەوەشێنێتەوەو دژی بەرنامەو شەریعەتی خوایە.

---

([223])منهاج السنة النبوية.

([224]) لەڕاپۆرتی شێخ محمد کوڕی إبراهیم ئال شێخ. سەیری(مجموع فتاواه(١٢/٢٨٠) بکە.

## بەشـی حەوتەم

### پڕو پاگەندە کردنی مافی یاسا دانان و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن بۆ مرۆڤ.

داڕشتنی حوکمەکان کەبەندەکان لەسەری دەڕۆن لەبەندایەتی کردن و هەڵس و کەوت و مەعامەلات و باقی کاروبارەکانی تریاندا، هەروەها لەوەی کەکێشەو مشت و مڕو جیاوازیەکانیان لەنێوان خۆیاندا پی لێك جیادەکەنەوە. مافی خوای گەورە پەروەردگاری جیهانیان، وبەدیهێنەرو دروستکاری دروستکراوەکان:﴿ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(٢٢٥).

ئەو خوایەیە کەهەر خۆی دەزانێت چی بۆ بەندەکانی خۆی دەبێت و چیان لەباردایە، و چ شتێك لەگەڵ بەندەو دروستکراوەکانی خۆی دا دێتەو شەریعەت و یاساو ڕێساو بەرنامەیەکیان بەقەد بالآی خۆیان بۆ دادەڕێژێت بەحوکمی ئەوەی پەروەردگاریانە دەستورو یاساو شەریعەتیان بۆ دادەڕێژێت، وەبەندەکانیشی بەحوکمی بەندایەتی و بەندایەتی بۆکردن بۆ خوای گەورەو دروستکراوانە دەستی ئەو ئەحکامەکانی لێ وەردەگرن و گوێ ڕایەڵ و گوێ لەمست دەبن بۆ ئەو خوایە بەرزو بی هاوتایە، بەرژەوەندیش لەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان و هەر خۆیان سود لەم گوێ لەمستی و بەندایەتی کردنەدا وەردەگرن، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ سورة النساء: (٥٩). هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ سورة الشورى :(١٠)

خوای پاك و بێگەرد قبوڵی ئەوەی نیە کەیاسادانەرێکی تر جگە لەخۆی لەگەڵ ئەودا دابنێن و شوێن ئەو بکەون و شوێن خواو شەریعەتی خوا نەکەون، دەفەرموێت:﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ﴾ سورة الشورى: (٢١).

---

(٢٢٥)أـ سورة الأعراف: (٥٤).

ب ـ واتە: بەدیهێنان و دروستکردن و هەڵسوڕاندنی بونەوەرو حوکمەکان هەمویان هی خوان، بەرزی و پیرۆزی بۆ خوا پەروەردگاری جیهانیان. وەرگێڕ.

جاهەر کەسێك یاسادانانێك غەیری یاسا دانانی خوا قبول بکات، ئەوە شەریکی بۆ خوای بەرزو بێ هاوتا داناوە، وەهەر شتێك کەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لە بەندایەتیەکان دایان نەڕشتبێت‌و فرمانی خوای لەسەر نەبێت‌و بکرێت ئەوە تازەگەری‌و داهێنانە(بدعة) ، وەهەمو داهێنان‌و تازەگەریەکیش گومرایی‌و سەر لێشێواویە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {من أحدث في أمرنا هذا ماليس منه فهو رد}([226]). وە لە ریوایەتێکی تردا: {من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهو رد}([227]). وەهەر دەستورو یاساو ڕێسایەك لەبواری ڕامیاری‌و حوکم‌و فەرمانڕەوایی دا لەنێوان خەڵکی دا خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دایان نەڕشتبێت، ئەوە بریتیە لەحوکمی تاغوت‌و حوکمی سەردەمی نەفامیەت‌و نەزانی:﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ سورة المائدة: (٥٠).

هەروەها حەڵاڵ کردن‌و حەرام کردن لەمافەکانی خوای گەورەن، کەس بۆی نیە هاوبەشیان تێدا بکات، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ سورة الأنعام: (١٢١).

خوای پاك‌و بێگەرد گوێ ڕایەڵی شەیتان‌و دۆستانیانی لەحەڵاڵ کردنی هەرچی خوای گەورە حەرامی کردون یاحەرام کردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردون کردۆتە بەندایەتی بۆ کردن‌و گوێ ڕاڵی کردن بەهاوبەش واتە شەریکی بۆ خوا داناوە. وەهەروەها هەر کەسێك گوێ لەمستی زانایان‌و پێشەواوو ئەمیرو سەرکردەکانیان بێت لەحەرام کردنی ئەوەی کەخوای گەورە حەڵاڵی کردون‌و بەقسەیان بکات، ئەوە ئەوانەیان کردونە پەردوەردگار جگە لەخوای گەورە، بەگوێرەی فەرمایشتی خوا:﴿ اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ} سورة التوبة: (٣١)

([226])رواه البخاري ومسلم.

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا نوسیوە. وەرگێر.

([227]) رواه مسلم.

وەلەفەرمودەدا هاتوە کەپێغەمبەرﷺئەم ئایەتەی بەسەر عديٍّ کوڕی حاتم الطائي دا ﷛خوێندەوە و حاتم گوتی: ئەی ڕەسولی خوا خۆ ئێمە ئەمان دەپەرستن، ﷺ فەرموی: {أليس يحلون لكم ماحرم الله فتحلونه، ويحرمون ماأحـــل الله فتحرمونـــه؟!} حاتم گوتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: {فتلك عبادتهم}([٢٢٨]).

گوێ ڕایەڵیان بۆ قەشەو مالومەکانیان لەحەڵاڵ کردنو حەرام کردندا جگە لەخوای گەورە بو بەندایەتی کردن بۆیانو هەروەها بو بەهاوبەشی پەیدا کردن بۆ خوای گەورە، وەهاوبەش دانانی گەورەیەو دژو هەڵوەشێنەرەوەی بەتەنها خوا پەرستیە کەبریتیە لەناوەرۆکی(مدلول) شایەتمانی(لا إلـــه إلاّ الله) بەشێك لەناوەرۆکەکەی: حەڵاڵ کردنو حەرام کردنە کەتەنیا مافی خوای گەورەن، ئەگەر ئەمە لەگوێ ڕایەڵی زانایانو بەندە چاکەکاندا(العُبَّاد)دا ئەوا بێت لەحەڵاڵ کردنو حەرام کردندا کەپێچەوانەی شەریعەتی خوا بێتو دەش زانێت کەپێچەوانەو هەڵەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەوان نزیکترن لە زانستو لەئاین، وەهەڵەکەشیان لەڕوی تێکۆشانەوە(إجتهاد)بو وتیایدا ڕاستو هەقیان نەپێکا، ئەوانە لەسەر ئەم تێکۆشانو هەوڵ دانەیاندا پاداشت وەردەگرنەوە، ئەدی دەبی ئەوەی کەگوی ڕایەڵی ئەو یاسا دەستکردانە دەکەن کەلەدانانو داڕشتنی دەستی کافرانو لەئاین دەرچوان(الملحدين)و دەیان هێننە وڵاتانی موسڵمانانو لەبری یاساودەستوری خوا حوکمیان پی دەکەن لەنێوان خەڵکی دا چۆن بێت؟ (فلا حول ولا قوة إلا بالله).

گومانی تێدا نیە کە ئەم کارە کردنی کافرەکانە بەپەروەردگاری خۆیان جگە لەخوای گەورە، و حوکمو یاساو دەستوریان بۆ دادەڕێژن، حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکەن، و حوکمی پێ دەکەن لەنێوان مردوم دا (الأنام) دەکەن.

******* ******* *******

---

([٢٢٨]) أ ـــ رواه الترمذي وإبن جرير وغيرهما.

ب ـ واتە: ئەدی ئەوان ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردوە بۆتان حەڵاڵ ناکەنو ئێوەش بەحەڵاڵی دەزانن، ئەوەش تان بۆ حەرام ناکەن کەخوای گەورە لێ ی حەڵاڵ کردون، حاتەم گوتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺفەرموی: دەی ئەوە بەندایەتی کردنو پەرستنە. وەرگێڕ.

## بەشـــی هەشتەم

### خۆ خستنە پاڵ ڕێبازە گومڕایی یەکان، و گروپە نەفامەکان(الجاهلية).

١ ـ خـۆ خسـتنە پـاڵ ڕێبـازە گـومڕاییـەکانی وەك کۆمۆنیسـت، جیهانگەراییـەکان (العلمانية)، سەرمایەدارەکان(الرأسماليـــة)، وغـەیری ئەوانـەش لـەڕێبازە کوفریـەکانی تـر، پاشگەز بونەوەو هەڵگەڕانەوەیە لەئایینی ئیسـلام، هەرچـەندە ئـەو کەسـانەی سـەر بـەو ڕێبازانەن پڕوپاگەندەی موسڵمانیەتی خۆشیان بکەن یاخۆشیان بەموسڵمان بزانن، ئەوانە لەژێرەوە(الباطن) کافرن، هەروەکو خوای گەورە لەبارەی ئەوانە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا لَقُــواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُواْ إِنَّا مَعَكْمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ﴾[٢٢٩].

هەروەها خوای بەرزو باڵا دەست دەفەرموێ:﴿ الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللّهِ قَالُواْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُواْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾[٢٣٠].

ئەو دوڕوە فێڵبازانە هەر یەکێکیان دو ڕویان هەیە: لەگەڵ بڕواداران بەڕویـەك،و لەگـەڵ براکانیان لەئایین دەرچوان(الملحدين) بەڕویەکی تر وەردەچـەرخان، هـەروەها دو زمانیـان هەیە لەگەڵ موسڵماناندا بەزمانێك دەدوێن، وبـەزمانێکی تـری پـەنهان و نهێنـی لـەژێرەوە

---

([٢٢٩])أـ سورة البقرة: (١٤).

ب ـ واتە: ئەگەر ئەو دو ڕوانە بەبڕواداران دەگەیشتن دەیان گوت: ئێمە بڕوادارین و لەگەڵ ئێوە داین، بەڵام ئەگەر دەگەیشتنە شەیتانەکانی خۆیان و لەگەڵیاندا کۆدەبونەوە، یاخود لەگەڵ جولەکەکاندا دەگەیشتن بەیەکتری دەیان گوت: ئێمە لەگەڵ ئێوەداین و لەگەڵ موسڵماناندا نین ئێمە تەنیا قەشمەری و گاڵتەیان پی دەکەین. وەرگێڕ.

([٢٣٠])أـ سورة النساء: (١٤١).

ب ـ واتە: دو ڕوەکان و ئەوانەی هەستتان لێ ڕادەگرن و سەیرتان دەکەن تابزانن کێ سەردەکەوێت موسڵمانان یان کافران و بێباوەڕان، ئەگەر خوای گەورە ئێوەی سەر خست واتە موسڵمانان، ئەوانە پێتان دەڵێن ئەدی ئێمە بەدڵ لەگەڵ ئێوەدا نەبوین و لایەنگیری ئێوەمان نەدەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا لەماڵ و سامان لەگەڵیاندا بن، خۆ ئەگەر کافران و بێباوەڕان تۆزە سەرکەوتنێکیان بەدەست کەوتبایە ئەوا ئەو دو ڕوانە پێ یان دەگوتن: ئەدی ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبوین و ئەو سەرکەوتنەتان بەهۆی ئێمەوە نەبو کەئێمە لەناو موسڵمانەکاندا هەمیشە یارمەتی ئێوەمان دەداو هەواڵی ئەوانمان پی دەگەیاندن و وورەی موسڵمانانمان دەشکاندو ئێوەمان بەهێز دەکردو دەستی موسڵمانانمان لەئێوە قەدەغەو دور دەخستەوە؟! وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ل٢٥٥.

لەگەڵ شەیتانەکانو کافرانو بێباوەڕانو لەئایین دەرچوان دەئاخاوێن:﴿ وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُواْ إِنَّا مَعَكْمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ﴾.

ئەو بێباوەڕو دوڕوانە پشتیان لەقورئانو سوننەت کردوە، وەك گاڵتە پێ کردنو سوکایەتی کردن بەئەهلی قورئانو سوننەت، وەئامادە نەبون ملکەچ بن بۆ حوکمی خوای پەروەردگار، شادمان بەو زانستەی هەیانە کەهیچیان بۆ پتر ناکاتو هیچیان دەست ناکەوێت جگە لەخراپەو خراپەکاریو خۆ بەزل زانی (إستکبار) بەولاوە، دەیان بینی کەهەمیشە گاڵتەو سوکایەتی بەسروشی ڕاستەقینەی خواوە دەکەن:﴿ اللّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾([231]).

خوای گەورە فرمانی کردوە کەبچینە ڕیزی بڕواداراناوە:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ ([232]).

وەئەم ڕێبازەی لەئایین دەرچوانە(الإلحادية) ڕێباز گەلێکن دژن، چونکە لەسەر پوچەڵیو باتڵ دامەزراون، کۆمۆنیستەکان ئینکاری بونی بەدیهێنەر ـ سبحانه وتعالى ـ دەکەن، بەگژ ئایینە ئاسمانیەکاندا دەچن، کێ هەیە عەقڵی ڕازی بێت کەبەبێ بیروباوەڕ(بلا عقيدة) بژیات، وەئینکاری بەڵگەنەویستیو سەرەتا عەقڵیە یەقینیەکان دەکەن، ئەوە ئەو کەسە هەڵوەشێنەرەوەی عەقڵی خۆیەتی؟ هەروەها جیهانگەرایی(العلمانية) ئینکاری ئایینەکان دەکاتو بڕوایان بەئایینی خوا نیە، پشت بەماددیەت دەبەستێت کەهیچ ئاڕاستەکارو هەڵسوڕێنەرێکی نیە، هیچ سنورو مەبەستێك لەو ژیانە ئاژەڵیەدا نیە؟ وەسەرمایەدار هەمو هیواو ئاواتی کۆکردنەوەیماڵو سامانە لەهەر ڕویەکەوەو بەهەر شێوەیەك دەستی

---

([231])أـ سورة البقرة: (١٥).

ب ـ واتە: ئەوانە نازانن کەخوای گەورە گاڵتەو سوکایەتی بەوان دەکاتو بواریان پێ دەداتو ڕەشمەیان بۆ شۆڕ دەکات لەو زەلکاوی تاوانو گومڕاییەدا مەلە بکەنو وەهەر لەدنیادا ڕیسوایان دەکاتو چارەنوسێكو ڕۆژێکی ڕەشیش لەڕۆژی دوایی دا چاوەڕوانیان دەکات. وەرگێڕ.

ج ـــ صفات المنافقين(رسالة) ص١٩ لإبن القيم.

([232])أـ سورة التوبة: (١١٩).

ب ـ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە خۆتان لەخوای خۆتان بپارێزنو لەخوا بترسنو لەگەڵ ڕاستگۆیان واتە لەگەڵ بڕواداراندا بنو بچنە ڕیزی ئەوانەوە نەك خۆ بدەنە پاڵ کافرانو بێباوەڕانو لەدین دەچوان ودوڕوو دەغەڵەکانو خۆفرۆشو گوێ لەمستی دوژمنانی خوا مەبن. وەرگێڕ

بکەوێت لای گرنگ نیە، بێ پایەند بونو بی گوێ دانە بەحەڵاڵو بەحەرامەوە، وبێ ئەوەی هیچ سۆزو بەزەیی یان بەهەژارانو دەست کورتاندا بێتەوە، ڕاگرو کۆڵەکەی ئابوریان لەسەر بناغەی سو خواردن(الربا) دامەزراوە کەبریتیە لەدژایەتی کردنو ملّ ملانێ کردنی توندو تیژ خواو پێغەمبەری خوا ، کەئەکەش بریتیە لەداتەپاندنو هەرە پی هێنانی دەوڵەتانو تاکەکانی کۆمەڵ، وەهەڵمژینی خوێنی گەلانو نەتەوە هەژارەکان، وەهەروەها ئەوە چ عەقڵێکە ـ سەرباری کەهەر کەسێك گەردیلەیەکی باوەڕ(إيمان)ی هەبێت ـ کەبەوە ڕازی دەبن کەلەسەر ئەو ڕێبازگە بژیەن ـ بی عەقڵو بی ئایین، وبی هیچ مەبەستو هیواو ئاواتێکی ڕاستەقینە لەژیانی دا ئامانجی بێت، وەلەپێناویشی دا تێ دەکۆشێت بەڵکو ئەو ڕێبازگانە وڵاتی موسڵمانانیان داگیر کردوە، کاتێ خۆری ئایینی ڕاستەقینە لەسەر زۆربەیاندا کز بوە یان ئاوا بوەو لەسەر خۆ لێ ون بونو خۆ لەدەست دا پەروەردە کراونو لەسەر کلكو وابەستەییو دو ڕویی ژیانودەژیەن.

٢ـ خۆ خستنە پاڵ حیزبو گروپە نەفامەکان،و نەتەوە ڕەگەز پەرستەکان، بنەماو کۆڵکەیەکی ترن لەکوفرو پاشگەز بونەوەو هەڵگەڕانەوە لەئایینی ئیسلام، چونکە ئیسلام ڕەگەز پەرستی ، نەزانیو نەفامیگەرێتی وەلا دەنێتو ڕایان دەماڵێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾([٢٣٣]).

وەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {ليس منا من دعا إلى عصبية، وليس منا من قاتل على عصبية، وليس منا من غضب لعصبية}([٢٣٤]). هەروەها دەفەرموێت: {إن الله قد أذهب عنكم عُبِّيَّةَ

---

([٢٣٣])أ ـ سورة الحجرات: (١٣).

ب ـ واتە: ئەی خەڵکینەو ئەی مەردوم ئێمە ئێوەمان لەنێرومێ یەك دروست کردونو کردومانن بەچەندان گەلو هۆزو تیرەو دەستەو گروپ بۆ ئەوەی یەکتری بناسنو ئایین و حوکمو شەریعەتی خواوزانستو زانیاریو شارستانەیەتو ئاکارو دەستورە شەرعیەکان لەیەکتری وەر بگرنو هاریکاری یەکتریو دەستبار گرتن لەگەڵ یەکتری دا بگرنو هەموتان بەیەکەوە ژیانو شارستانیەتیتان لەسەر حوکمو بەرنامەی خوا بەرەو پێش بەرنو بەبرایەتیو یەکسانی بەیەکەوە بژیەنو ..تد. بەدڵنیایی یەوە ئەوەش بزانن کەبەڕێزترینو خۆشەویست ترین کەسیشتان لای خوا ئەو کەسەیە کەخۆی لەخوای خۆی دەپارێزێتوگوێ ڕایەڵی خوایەو حوکم بەبەرنامەو شەریعەتی خوا دەکاتو هەمیشە کاری چاکەو چاکەکاری دەکەنو خۆی لەهەمو خراپەیەکو قسەو گفتاری ناشیرینو قێزەون بپارێزێت. وەرگێڕ.

([٢٣٤]) أ ـ رواه الترمذي وغيره،

الجاهلية، وفخرها بالآباء إنما هو مؤمن تقي أو فاجر شقي، الناس بنو آدم، وآدم خلق من تراب، ولا فضل لعربي على عجمي إلاَّ بالتقوى}([٢٣٥]).

ئائەم حزبایەتیانە موسڵمانانی پەرتەوازەو دابڕ دابڕ کردوە، خوای گەورە فرمانی بەکۆ بونەوەو گرد بونەوەو یەك ڕیزیو یەکگرتنو هاریکاریو یارمەتی دانی یەکتری کردوە لە سەر چاکەو چاکەکاریو دەستگیرۆیی یەکتریو خۆ لەخوا پارێزیو خوا پەرستیو حوکم کردن بەبەرنامەو شەریعەتی خوا کردوە، و قەدەغەی پەرتەوازەییو پشت لەیەکتری کردنو دڵ لەیەکتری دوریو جیاوازیو جیاپایی کردوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا ﴾ ([٢٣٦]).

خوای پەروەردگار لەئێمەی دەوێ کەئێمە واتە موسڵمانان لەیەك تاکە حیزب دا بینو لەدەوری یەك گروپدا گرد ببینەوە، کە ئەو حیزبەش حیزبی سەرکەوتوی خوان (حزب الله المفلحون)، بەڵام بەداخەوە جیهانی ئیسلامی دوای ئەوەی کەسیاسەتو ڕۆشنبیری

ب ـ واتە: لەئێمە نیە هەر کەسێك بانگەشەی دەمارگیری بکات، لەئێمە نیە ئەو کەسەی کەکوشتارو جەنگ لەسەر دەمارگیریەت دەکات، هەروەها لەئێمە نیە کەهەر کەسێك لەسەر دەمارگیریەت توڕە دەبێتو ڕقی لێ دەبێتەوە، واتە موسڵمان نیەو باوەڕی نیە. وەرگێڕ.

([٢٣٥]) أ ـــ رواه مسلم.

ب ـ واتە: خوای گەورە نەفامگەرێتی لەناو ئێوەدا هەلگرتوەو لێ ی قەدەغە کردون، هەروەها شانازی کردنو خۆ هەڵدانەوەی بەباوو باپیرانی لێ قەدەغە کردون، مرۆڤ موسڵمانێکی خۆ لەخوا پارێزە یان کەسێکی تاوانبارو بەد بەختە، خەڵکی سەر ڕوی زەوی هەمویان وەچەو نەوەکانی ئادەمن، ئادەمیش لەگڵ دروست کراوە، هیچ جیاوازیەك لەنێوان عەرەبێكو ناعەرەبێکدا نیە تەنیا بەخۆ لەخۆ پارێزی و خوا پەرستی نەبێت. وەرگێڕ.

([٢٣٦])أ ـــ سورة آل عمران: (١٠٣)

ب ـ واتە: ئەی بڕوادارینە ئێوە هەموتان دەست بەپەت واتە بەئایینی خوا کەبریتیە لەقورئانو سوننەتو و هێزو توانای خواوە بگرنو هەرگیز دەستی لێ بەر مەدەنو هەرگیز پەرتەوازەو لەیەك جیا مەبنو هەمیشە برای یەکتری بنو دوژمنایەتیو ناحەزی یەکتری مەبنو بادەمارگیری عەشیرەتیو هۆزگەرایی لەیەکتان دور نەخاتەوەو هەمیشە بیر لەنازو نیعمەکانی خوا بکەنەوە کاتێ کەئێوە لەیەك جیا بونو دوژمنو ناحەزی یەکتری بون بەڵام بەهاتنی ئایینی ئیسلامو بەنیعمەتی ئیسلام ئێوەی کردن بەبرای یەکتریو یەکتریتان خۆش ویستو هەموتانی کرد بەیەك ڕیزو یەك تاکە گروپ کەگروپی موسڵمانانە لەکاتێکدا ئێوە پەرتەوازە بون ولەسەر لێواری چاڵی ئاگر بونو بەم نیعمەتی ئیسلامە ڕزگاری کردن. وەرگێڕ.

ئەوروپا داگیری کردن‌و باڵی ڕەشی بەسەردا کێشان، دوچاروملکەچی ئەو دەمارگیریە خوێناوی،و سێکسی‌و نیشتمان پەرستی یە بون، باوەڕیان پی یەتی وەك کێشەیەکی زانستی‌و ڕاستیەکی بڕیار لەسەر دراو(مقررة)، و واقعێکی سەپێنراو کەناتوانرێت لەدەستی ڕابکرێت، گەلەکانیان بەشێوەیەکی زۆر نامۆیانە بەرەو زیندو کردنەوەی ئەو دەمارگیریە نەفامیانە کەئایینی ئیسلام لەناوی برد بون، و خۆ دەوڵەمەند کردن پی یان‌و زیندو کردنەوەی دروشمەکانی، وشانازی کردن‌و خۆ هەڵ دانەوە بەو پەیمانەی کەلەپێش ئیسلامدا ڕۆیشتوەو کاتی بەسەر چوەو ڕابردوە، ئەو کات‌و پەیمان‌و سەردەمەی کەئیسلام سورە لەسەری کەبەنەفامیەت ناوی دەبات، وەخوای گەورە منەت لەسەر موسڵمانان دەکات کەلەو چەرخ‌و سەردەمە نەفامی‌و نەزانیە ڕزگاری کردون‌و لێ ی دەرچون، وەمەسڵمانانی هانداوە کەسوپاسگوزاری خوا بکەن لەسەر ئەو نازو نیعمەتە.

شتێکی سروشتی چاوەڕوان کراوە لەبڕوادار کەبیر لەنەفامیەت ناکاتەوە کەسەردەم‌و چەرخەکەی تێ پەڕیوەو یا لێ یەوە نزیکە مەگەر بەڕق‌و قێز لێ بونەوەو بێزاری‌و موچڕك پێدا هاتنەوەو بێت، ئایا هەرگیز کەبەندی یەکی ئازاردراوونەشکەنجە خواردو هەیە کەئازاد دەکرێت‌و بەر دەبێت‌و لەبەندیخانە ڕزگاری دەبێت، بیر لەڕۆژەکانی ناو بەندیخانەو گرتنی‌و ئازارو ئەشکەنجە دانی و سوکایەتی پێ کردنی بکاتەوەو موچڕك بەلەشی دا نەیەت‌و ڕانەچڵەکێت؟ وەئایا ئەو نەخۆشەی کەلەنەخۆشیەکی دورو درێژ کەچاوەڕوانی مردنی دەکرد لەکاتی نەخۆشی‌و بێ هێزیەکەی دا چاك دەبێتەوە هەر کاتێك بیر لەو نەخۆشیە دەکاتەوە بیرو هۆشی دەهەژێنی‌و ڕەنگی دەبزرکێ؟([237])، ئەوەی پێویستە کەبزانرێت کەئەو حزبانە ئازارو سزایەکە، کەخوای گەورە بۆ ئەو کەسانەی ناردوە کەپشت لەشەریعەتی خوا دەکەن، ئینکاری ئایینەکەی دەکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴾([238])، وەپێغەمبەرﷺ

---

([237]) أ ـ لەنامیلکەی(ردة ولا أبابكر لها )لەنوسینی أبی الحسن الندوی.

([238])أ ـــ سورة الأنعام: (٦٥).

ب ـ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبەو بێباوەڕانە بڵێ: خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی هەیە و دەتوانێت کەلەسەروتانەوەو لە ژێرتانەوە سزاو ئازارو ئەشکەنجەتان بۆ بنێرێت، وەکو هەورە تریشقە لەئاسمانەوە لەسەروتانەوە وەکو بومە لەرزەو زەمین لەرزە و زەوی ڕۆچون، هەروەها خوای گەورە بتان کات بەچەند گروپ‌و دەستەو کۆمەڵێك ناحەز بەیەکتری‌و دوژمن بەیەکتری کەئازارو ئەشکەنجەو بەدەستی یەکتری بچێژن. وەرگێڕ. تەفسیری گوڵشەن ب١ل٢٣٥.

فەرمویەتی: {ومالم تحكم أئمتهم بكتاب الله إلاجعل الله بأسهم بينهم}([239]).

بەدڵنیاییەوە دەمارگیری حزبایەتی، دەبێتە ئەگەری نەسەلماندنو ڕەت کردنەوەی ئەو هەقو ڕاستیەی کەلای کەسانی بەرامبەر هەیە، وەك حاڵی ئەو جولەکانەی کەخوای گەورە دەربارەیان دەفەرمویّت:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرونَ بِمَا وَرَاءهُ وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَهُمْ ﴾([240]).

هەروەها وەکو حاڵی ئەهلی نەفامیەت، ئەوانەی کەهەقو ڕاستیان ڕەت دەکردەوە کە پێغەمبەرﷺبەدەمارگیریو دەست گرتن بەوەی کەباوو باپیرانی خۆیان لەسەری دەڕۆیشتن ناویان دەبات:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ ﴾([241]).

خاوەنو ئەندامانو لایەنگرانی ئەو حزبیانە دەیانەوێ حزبایەتیەکەیان لەبری ئیسلام دابنێنو خەڵکی بەناوی ئیسلامەوە پێ چەواشە بکەن، ئەو ئیسلامەی کەخوای گەورە بەو نازو نیعمەتو پڕ پیتو بەرەکەتەی کەتیایەتی منەت بەسەر مەردومدا دەکات کەپێ بەخشیون.

---

([239]) أـــ من حديث رواه إبن ماجة.

ب ـ واتە: ئەگەر هەر گەلێك هەر وڵاتێكو هەر قەومێك بەرپرسو سەرکردەو دەسەڵاتدارانو پێشەوایانیان بەکتێبەکەی خوا(قورئانی پیرۆز) حوکم نەکەن ئەوە خوای گەورە لەنێوان خۆیاندا بەیەکتریەوە خەرکیان دەکات و دەم لەجەستەی یەکتر دەنێنو تێك بەردەبنو بەگژ یەکتری دا دەچن، دیارە ئەمەشمان بەچاوی خۆمانو بەحاڵی خۆمان لەناو هەمو گەلانی ئەمڕۆی موسڵمانانداندا دیتو بەتایبەتی ئێمەی گەلی کورد. وەرگێڕ.

([240])أـــ سورة البقرة: (٩١).

ب ـ واتە: ئەگەر بەو بێباوەڕو ملهوڕانە بگوترایە باوەڕ بەقورئان بێنن، دەیان گوت: نەخێر ئێمە بڕوامان بەوە هێناوەو هەیە کەبۆ بابو باپیرانمان هاتۆتە خوار کەمەبەستیان لەتەورات بو ، وەبڕوایان بەغەیری تەورات نەبو، کەمەبەست لەقورئانی پیرۆزە، کەبەڕاستی هەر ئەویش هەقەو ئەوەی ئەوان بڕوایان پێ ی هەبو حوکمی هەڵوەشاوەتەوەو کاتو زەمینەی ڕۆیشتوەو بەسەرچوە. وەرگێڕ.

([241])سورة البقرة: (١٧٠).

ب ـ واتە: ئەوانەی کەشوێن کەوتەی شەیتانن لەبت پەرستانو جولەکەو گاورەکانو بێباوەڕانو دووڕوەکانو ئەو بەناو موسڵمانانەی کەبیروباوەڕەکەیان هەڵ تەکاوەو شلۆق بوە بگوترایە یان بگوترێت: دەی وەرن باتەنیا باوەڕ بەو قورئانە بەو بەرنامەو شەریعەتەی کەخوای گەورە ناردویەتیە خوارەوە بهێنن، دەیانگوت: نەخێر ئێمە تەنیا شوێنی ئەو بەرنامەو ئەو ڕێبازە دەکەوین کەباوكو باپیرانمان شوێنی دەکەوتنو گرتبویانە بەرو لێ ی لانادەین، ئەدی ئەوانە بیر ناکەنەوەو تێرا نامێنن کەباوكو باپیرانیان نەفامو نەزانو گێژو کەودەن بونو سەریان لێ شێوا بوو ڕێگەی ڕاستیان نەدۆزی بوەوەو گومڕا بونو ڕێگەیان لێ تێك چو بو. بۆ ئەوانیش هەر لەسەر ئەو نەزانیو نەفامیە دەڕۆن؟. وەرگێڕ.

## بەشــی نۆیەم

### دیدو بۆچونی(بیردۆزە) ماددی بۆ ژیان‌و خراپەکاریەکانی ئەو دیدو بۆچونە

دو دیدو بۆچون‌و دو تێڕوانین بۆ ژیان هەن، دیدو بۆچونی ماددی بۆ ژیان، دیدو بۆچونی ڕاستەقینەی خوایی، وەهەر یەکێ لەو دو دیدو تێڕوانینانە کاریگەرو شوێنەواری خۆیان بەسەر مرۆڤو کۆمەڵانی خەڵکی سەر ڕوی زەویەوە هەیە:

أ. دیدو بۆچونی ماددی بۆ ژیان‌و واتاکەی:

ئەو بۆچونەیە کەتیایدا هەمو هۆش‌و گۆش‌و بیرو زادەی مرۆڤ بەندە بە وەدەست هێنان‌و هەڵپە کردن بۆ خۆشی‌و خۆشگوزەرانیەکانی دنیاو باوەش کردن بەدنیادا، وکارو هەوڵ‌و تێکۆشانەکانیان هەر لەو سنورەدا کورت هەڵاتوەو لەژیانی باق‌و بریقی دنیا تێناپەڕێت‌و تەنیا باوەش کردنە بەدنیای سەوزو شیرینی کاتی‌و براوە ، و گرنگی‌و بایەخ بۆهیچ شتێکی ترو بۆ هیچ دەرئەنجامێکی تر ناڕوات‌و هەمو هیواو ئاواتەکانیان لەناو ئەو بازنەیەدا تل دەخوات. وکار بۆ هیچ شتێکی تر ناکەن‌و ئاگایان لەوە نیەو هیچ شتێك لەوە نازانن کەخوای گەورە ئەم دنیایەی کردۆتە کێڵگەی ڕۆژی دوایی‌و هەرچی لەم دنیایە بڕواوەیەدا بەدەستی نەهێنن لەو دنیای تردا مایە پوچن، خوای گەورە ئەم دنیایەی کردۆتە خانەی کار کردن‌و دنیای تریشی کردۆتە خانەی پاداشت وەرگرتنەوە، جاهەر کەسێك ئەم دنیای بڕواوە بەهەل بقۆزێتەوەو بەهەلی بزانێت بۆ کۆکردنەوەی زەخیرەی تەواوی بەتەنیا خوا پەرستی‌و کاری چاکە کردن‌و چاکگوزاری تیایدا ئەوە هەردو دنیاکان دەباتەوە، وەهەر کەسێکیش ئەم دنیایەی لەکیس خۆی داو ڕێچکەی بەتەنها خوا پەرستی نەگرتە بەرو کاری چاکەی تێدا ئەنجام نەدا ئەوە خۆشی‌و خۆش گوزەرانی‌و نازو نیعمەتی دنیای تریشی گوم کردو لەکیس خۆی دا:﴿ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ سورة الحج: (١١). (واتە: دنیاو قیامەتی دۆڕاند بەڕاستی ئەمە دۆڕاندنێکی زۆر دیارو ئاشکراو بەڵگەنەویستە. وەرگێڕ)

خوای گەورە ئەم دنیایەی هەروا بەخۆڕایی‌و بێ بایەخ دروست نەکردوە بەڵکو بۆ حیکمەت‌و کارێکی زۆر گەورەی دروست کردوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ سورة الملك: (٢).(واتە: خوای گەورە مردن‌و

ژیانی بۆیە داناوە تاکو بەتاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەی باشتر دەکاتو کامتان پێشبڕکێ ی خوا پەرستی و چاکەو چاکاری دەکاتو کامتان خراپەکارو دژی خوا پەرستین. وەرگێڕ).

هەروەها دەفەرموێت:﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾([242]).

خوای پاکو بێ گەرد لەم ژیانی دنیایەدا خۆشیو خۆشگوزەرانیو ژیانی سفتو لوسی داناوە، زینەتیو جوانیو خۆشی ڕواڵەتی ماڵو سامانی دنیاو منداڵو زاوو زێ کردن، وپلەو پایەو دەسەڵاتو شکۆمەندی، وگشت خۆشیو خۆشگوزەرانی ڕابواردنەکانی دنیایی، کەکەس نایزانێتو پەی پی نابات تەنیا خوای گەورە نەبێت.

خەڵکانێك هەن کەزۆرینەیانن دیدو چاویانو هۆشو گۆشیان تەنیا لەسەر ڕواڵەتەکانی ژیانی دنیاو جوانییو خۆخو شەنگیەکەی دا کورت هەڵاتوەو تەنیا بۆ ڕواڵەتی ئەم ژیانە دەڕوانێتو تێدەکۆشێت، وخۆی لەچێژو خۆشیەکانی وەرداوەو تیایدا تل دەخوات، بەهیچ شێوەیەك ناڕوانێتە نهێنیەکانی ئەم ژیانەو تیلە نیگایەکیشی ناداتیو بیری هەرلێ ناکاتەوە، خۆی سەرگێژو سەرسڕو سەرقاڵ کردوە بەخڕ کردنەوەو چنینەوەوکۆکردنەوەو چێژ وەر گرتن لەم ژیانی دنیایەو هەمو هیواو ئاواتێکی ورگ پڕ کردنو ڕابواردنە لەم دنیایەداو هیچ کارێك هەوڵێك بۆ دنیای تری ڕاستەقینەو هەتا هەتایی خۆی ناداتو تەنیا چرکە ساتێکیش بەخەیاڵی دانایەت، بەڵکو لەوانەشە هەر بڕواشی پێ نەبێتو باوەڕی وابێت دنیای ترو زیندو بونەوە هەر هەبێت. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقَالُواْ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾([243]).

---

([242]) أ ــ سورة الكهف: (٧).

ب ـ واتە: ئێمە سەر ڕوی زەویو ژیانی دنیامان بۆڕازاندونەوە بۆ ئەوەی بەتاقیتان بکەینەوە کێ لەخۆ بوردوەو پشت دەکاتە ئەو باقو بریقو زینەتەی دنیاو ژیانی دنیاو بەتەنها خوا پەرستی دەکاتو کارو کردەوەی چاکو چاکگوزار دەبێتو کێش مرۆڤی خراپو سەرکەشو کەللە ڕەقە. وەرگێڕ.

([243])أ ــ سورة الأنعام: (٢٩).

ب ـ واتە: ئەو بێباوەڕو کافرانە دەڵێن: جاکوا دنیای تر هەیە، ژیان هەر ئەو ژیانەیەو هیچی ترو زیندو بونەوە هەر نیەو زیندو ناکرێینەوە. وەرگێڕ.

خوای بەرزو بێ هاوتا هەڕەشەی توندی لەو تێڕوانینەو بیردۆزەیە بۆ ژیان کردوە، و دەفەرموێت:﴿ إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا وَرَضُواْ بِالْحَياةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّواْ بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ ۞أُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمُ النُّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾([244]). هەروەها دەفەرموێت:﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ ۞أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾([245]).

ئەم هەڕەشەیە خاوەنانی ئەم تێڕوانینە دەگرێتەوە، جاچ لەوانە بێت کەکار بۆ ڕۆژی قیامەت دەکەن، بەڵام بۆ مەبەستی وەدەست هێنانی تەماح و ژیانی دنیایانە، وەك دوڕوەکان و ڕوپامایی خوازان(المرائين) بەو کارانەی کەئەنجامی دەدەن، یاخود لەو کافرانە بێ کەبڕوایان نەبەزیندو بونەوەو نەبەلێپێچانەوەو حساب لەگەڵ کردن هەیە، وەك حاڵی ئەهلی نەفامی و ڕێبازە تێکدەرو داتەپێنەرو داڕوخێنەرەکانی سەرمایەداری(الرأسمالية) و

([244]) أ ــ سورة يونس: (٧ــ٨).

ب ـ واتە: ئەو کەسانەی کەهەمو هیواو ئاواتەکانیان ژیانی دنیاو ڕابواردن و خۆشی دنیایە و بڕوایان وانیە کەلەدنیای تردا زیندو بکرێنەوەو بەتەمای ئەوە نین بگەڕێنەوە لای خواو بەردەستی خوا و بۆ بارەگای خوا، ئەوانە بەخۆشی و جوانیەکانی دنیا ڕازین و چۆنیان بۆ بگونجێ ئاوا بەدەستی دێنن و تیایدا ڕادەبوێرن و دڵیان پێ خۆشە و لەبەڵگەو نیشانەکانی دەسەڵاتی ئێمە بی ئاگان لەدروست کردنی ئەو بونەوەرە چڕو پڕو سەرسوڕهێنەرو جەنجاڵە تابەو هۆیەوە تواناو دەسەڵاتی بێ سنوری خوایان بۆ دەربکەوێت، ئەوان بێگومان و بەدڵنیاییەوە جێگەی حەوانەوەو نیشتەجێ یان ئاو ئاگری دۆزەخە بەهۆی ئەنجامدانی ئەو کردەوە خراپانەی کەلەدنیادا کردویانەو بەهۆی ئەو ڕێبازو بەرنامەوحوکمە چەوتەی کەلەدنیادا لەسەری دەڕۆیشتن و پشتیان لەبەرنامەو شەریعەتی خوا کردبو. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل٥١٣.

([245]) أ ــ سورة هود: (١٥ــ١٦)

ب ـ واتە: هەر کەسێك جوانی و ڕازاوەی و خۆشی وخۆش گوزارەکانی ژیانی دنیایان دەوێت و بیر لەژیان و زیندو بونەوەی دنیای دوایی ناکەنەوەو هەر سەرقاڵی وەدەست هێنانی ئەم دنیایەن، ئەوانە بەری ئەم ڕەنجەیان وەردەگرنەوەو بەفیڕۆ ناچێت دەیان دەینێ وبێ ئەوەی هیچێکی لێ کەم بکەینەوە ئەوەش لەبەر بێ ئیمانیەکەی، بەڵام ئەوانەی کەهەر ژیانی دنیای دەوێت و هەر ژیانی دنیایان لا مەبەستە و هەر بۆ ئەم دنیای بڕاوە هەوڵ دەدەن و ڕۆژی قیامەت فەرامۆش دەکات، ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا تەنیا ئاگری دۆزەخ جێگەو مەنزڵیانە، ئازارێکی بەسەخت و سوێ یان هەیەو لەوە زیاتر چیدیان دەست ناکەوێت، چونکە لەدنیا هیچ لایان لەدنیای نەبڕاوەی قیامەت نەکردۆتەوەو یان هەر بڕواشی پێ نەبوە، خۆ ئەوانە ئەگەر چاکەیەکیش بکەن ئەوە هیچ سودێکی لێ نابینن، چونکە هیچ هەوڵیان بۆ ئەم ڕۆژە سەختە نەداوە، هەرچی چاکەو خێرو خێراتێك بکات هیچ سودی لێ ناکات مادامەکی بڕوای بەخوای گەورە نیەو بەبەرنامەی خوا ناڕوات بەڕێوەو بەشەریعەتی خوا کار ناکات. وەرگێڕ، تەفسیری گوڵشەن ب٢. سورەتی هود.

کۆمۆنیستیەت(الشوعية)، وجیهانگەرایی‌و بیّ ئایینەکان(علمانيــة واللادينيــة)و لەئایین دەرچوەکان(إلحادية)، ئەوانە هەرگیز ڕێزو قەدری ژیان نازانن، تێڕوانین‌و بۆ ژیان تەنیا وەك تێڕوانین‌و سەیر کردنی ئاژەڵەکانە واتە تەنیا هەمو ئاوات‌و ئامانجێکیان ورگ‌و گیرفان‌و داوێن پڕ کردنە، بەڵکو لەخراپتریش لەبیر کردنەوەی ئاژەڵەکان‌وو گومڕا ترو سەر لێشێواو ترن، چونکە ئەوان ژیری‌و عەقڵی خۆیان لەدەست داوەو عەڵی خۆیان تێك داوە، هێزو توانا‌و قوەتی خۆیان بەفیڕۆ داوو دۆڕاندویانەو بەری ڕەنجی ئەوانە وەك کەفی سەر ڕوی ئاوی ناو دەریا وایە، هەروەها کاتە زێڕینەکانی خۆیان فەوتاندوەو بەفیڕۆ داوەو لەشتێکدا خەرجیان کردوە کەهیچ سودێکیان بۆ نەماوەتەوە، و هیچیکیان بۆ نەماوەتەوە، و هیچ کارێکیان نەکردوە بۆ چارەنوسی خۆیان کەڕۆژی قیامەت‌و ناو بەهەشتی بەرینی خوایەو ڕزگار بونە لەئاگری دۆزەخ کەهەمیشە چاوەڕوانیانەو هیچ گومانێکی تیدا نیە هەر دێت‌و هەر دەیگەنیّ.

ئاژەڵ هیچ چارەنوسێکیان نیەچاوەڕوانی بکەن، چونکە ئەوان عەقڵیان نیە تا بیری پیّ بکاتەوەو بیر لەدوا ڕۆژی خۆی بکاتەوە، بۆیە ئەوان موکەللەف نین بەپێچەوانەی مرۆڤ کەخوای گەورە عەقڵی پێداوەو بەهۆی بونی ئەم عەقڵ‌و ژیریە موکەللەفە، بەتایبەت ئەو کەسانەی کەئامآژەمان پیّ کردن، بۆیە خوای بەرزو بالا دەست دەربارەی ئەوانە دەفەرموێت:﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾([246]).

---

([246])أ ــ سورة الفرقان: (٤٤).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺتۆ وا دەزانیت ئەوانە واتە بێباوەڕان‌و ملهوڕان‌و بت پەرستان‌و دنیا پەرستان‌و لەئایین دەرچوان‌و کەللەڕوتان‌ودوڕوەکان بەگویّ ی دڵ گویّ یان لەتۆیەو لێت تێدەگەن کاتیّ قورئانیان بۆ دەخوێنیتەوەو ئامۆژگاریان دەکەیت، ئایا ئەوانە بیرو هۆشی لیّ حاڵی بون‌و تێڕامان‌و لیّ ورد بونەوەو تێگەیشتنی ڕاستەقینەی بەرنامەی خوایان هەیە، تاپەندو ئامۆژگاریەکانت وەریگرن‌و لێت حاڵی بن‌و بێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست‌و دەست بەرداری فرمانەکانی شەیتان بن، یان ئەوانە هەمو هۆش‌و گۆش‌و هیواو ئاوات‌و هەممو غەممیان تەنیا ڕابواردن‌و کەیف‌و سەیفی دنیاو دنیا خۆری‌و باوەش کردن بەدنیاو ئەڵقە لەگویّ‌و گویّ لەمستی شەیتانی نەفرین لێکراوو دور لەڕەحمەتی خوان، نەخێر ئەوانە بی سودە چەندە ئامۆژگاریان بکەیت‌و چەندە قورئان‌و سوننەتیان بۆ بخوێنیتەوەو بایەکەو بەبن گویّ یاندا دەڕوات‌و لەئاژەڵانیش خراپترن وگومڕان، چونکە ئاژەڵ ژیانی سروشتی خۆی بەپیّ ی ئەو نەخشەیەی کەخوا بۆی کێشاون دەبەنە سەرو بەمو لیّ ی لانادەن کەواتە ئاژەل لەو جۆرە کەس‌و لەو مرۆڤە نەفام‌و سەرکەش‌و کەللە ڕوتانە باشترن‌و هەرگیز لەفرمانی خوا لانادەن، بەپێچەوانەی ئەو جۆرە مرۆڤانە کەیاخی‌و سەرلێشێواوو هەمیشە گومڕان. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل٩٢٦.

خوای گەورە هـاوەڵاتی ئـەم بیرۆکـەو دیدو بۆچـونانە بەنـەفامو نـەزانو نازانسـتو نازانیـارو نەبونی زانستوزانیاری باس کردون، هەروەکو دەفەرموێت:﴿ وَعْدَ اللَّهِ لاَ يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۞ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴾ ([٢٤٧]).

ئەوانـە هـەر چـەندە ئـەهلی پسـپۆرو بەقسـەی خۆیـان بلیمـەتو شـارەزاو داهێنـەرو پیشەوەرو پیشە سازیش بن، هەر نەفامو نەزانو شایستەی ئەوە نین پێ یـان بگوترێـت ئەهلی زانستو زانیاریو بەزانستو زانیارو زانیـاری بـاس بکرێن، چـونکە ئـەو کارانـەیان لەڕواڵـەتی ژیـانی دنیـادا تـێ پـەڕ ناکـات، وەئەمـەش زانسـتو زانیاریـەکی ناتـەواوەو خاوەنەکەی شایستەی ئەوە نیە ئەو وەسف کردنە پایەبەرزەی بۆ بەکار بهێنرێـت، دەگوترێـت: زانایان(العلماء)، بەڵکو ئەمە بەئـەهلی زانسـتو زانیـاری خـوای گـەورەو ترسـان لـەخواو بـەخۆ لەخوا پارێزان دەگوترێتو تەنیا شایستەی ئەوانە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ سورة فاطر: (٢٨).( واتە: تەنیا ئەو کەسـانەی کـەزانانو زانسـتو زانیاریان هەیە بەخواو بەدەسەڵاتی بی سنوری خواو لەهەمو بەڵگەو نیشانەکانی دەورو بـەری خۆیان ڕادەمێننو دەسەلاتو توانای بی سنورو بی ئەندازەی خوایـان بـۆ دەر دەکـەوێتو بـڕوا بەخوا دەهێنن هەر ئەوانن کەلەخوا دەترسنو ئەوانە شاسیتەی ئەوەن پی یـان بگوترێـت زانـاو داناو لەخوا ترسو خۆ لەخوا پارێز. وەرگێڕ).

موسڵمانان ئاواتی ئەوە دەخوازن کەوەك ئەوان واتە وەك ئەو وڵاتە بێباوەڕانە بنو ئیرەییـان پی دەبەنو خۆزگەیان پی دەخوازن ، بەبەخت چاكو بـەختی زۆر ناوزەدیـان دەکـەن، بـەهۆی ئەودیدو تێڕوانینە ماددیەی کەهەیانـە، وەکو ئـەوەی کەئێسـتا لـەناو وڵاتـە کافرەکانـدا بـاوەو

([٢٤٧])أ ــ سورة الروم (٦ــ٧).

ب ـ واتە: ئەمە پەیمانی خوایەو دێتە دی واتە سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسـەر عەجەمەکانـداو هـەر دێتـە دیو دەبـی ڕو بدات، خوای گەورە هەرگیز پەیمانی خۆی ناشکێنیو دەیهێنێتە دیو لەبەدیهێنانی دا دوا ناکەوێتو لەکاتو سـاتی خـۆی دا دێتە دی، بەڵام زۆرینەی خەڵکی ئەم ڕاستیە نازانن چونکە ئاستی بیر کردنەوەو زانینیان هەر ئەوەندەیەو سنوردارەو زانستو زانینی مرۆڤەکان سەر کێڵانەیەو بیر ناکەنەوە تاسوننەتو یاساکانی خودایـان لەژیانـدا بـۆ دەر بکـەوێت، ئـاخر زانیاریو زانینی ئەوان تەنیا لەڕواڵەتو ڕوکەشی دنیادایەو تەنیالەخولگەی دنیـاو ژیـانی ڕازاوەی دنیـادا دەخولێتـەوەو لەسنورێکی تەسكو تەنگەبەردایەو هـەمو هەوڵەکانیان تـەنیا بـۆ ژیـانی ئـەم دنیایەیـەو هـەرگیز بیر لـەژیانی دنیـای تـر ناکەنەوەو وا دەزانن تەنیا ژیان ئەم ژیانی دنیایەیەو بەسو بۆ ڕۆژی قیامەتو بۆ ژیانی هەرگیز نەبڕاوەیان هەوڵێك نادەن و لێ ی بی ئاگان وساتێك لەساتەکان بیریان بـەلای دا ناچێتو تۆبە بکـەنو بگەڕێنـەوە لای خـوای گـەورەو ئـیدی لای شەیتان واز لێ بهێنن. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢، سورەتی ڕوم.

هەیە، لە پێشکەوتنی پیشەسازیو ئابوری دا، بەچاوی سەر دەبینیت کەبڕوا بی هێزەکانو ئیمان داڕوخاوەکان لەناو ڕیزی موسڵماناندا بەتێڕوانینێکی بەدڵ بونو سەرسامیەوە دەڕواننە ئەو وڵاتو گەلە کافرانە بی ئەوە سەیری ئەو بی بڕوایی یەی ئەوان بکەنو نیگایەکی چاو زانستانە بدەنە ئەو کوفرو نەفامیەی کەئەوان لەسەری دەڕۆن. و سەیری ئەو چارە ڕەشیەی ئەوان ناکەن کەلەڕۆژی قیامەتدا چاوەڕێیانە، ئەو تێڕوانینە هەڵەیە بەرەو ڕێز لێنانو بەهەند زانینو بەگەورە دانانی کافرانو ڕێز لێنانیان لەدڵو دەرنیاندا جلەو کێشیان دەکات، وایان لێ دەکات کەخۆ بەوان بچوێنن لەئەخلاقو ئاکارو ڕەوشتو هەڵسوکەوتە خراپو بۆگەنەکانیاندا، لەلایەنە خراپو بێ شەرعیوداڕوخێنەرەکان لاسایان دەکەنەوەو لەلایەنە باشو کردەوە چاکەکان بۆ بەهێز کردنی ڕیزی موسڵمانانو شتە باش و بەسودەکاندا لەداهێنانو پیشەسازیەکانو تەنکنۆلۆژی دا لاسایان ناکەنەوە بەڵکو لەلایەنی بی ئەخلاقیو سەماو سوڕدانو جرتو چەقەنەو مەی خۆریو داڕوخانو بۆگەن کردنی ئەندامانی کۆمەڵگەی موسڵماناندا سەرمەشقی کافرانو بێباوەڕو دوڕوانو لەئاین دەرچوانن. نەك بۆ بەهێز کردنو توانای لۆژیکی وڵاتانی موسڵمانان سودیان لێ وەربگرن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن ﴾ سورة الأنفال: (٦٠).

**ب ـ دیدو تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیان: تێڕوانینی ڕاستەقینە:**

بریتیە لەو تێڕوانینو دیدو بۆچونە کەمرۆڤ هەرچی لەم ژیانی دنیایەدا هەیەتی لەماڵو سامانو داراییو هێزو دەسەڵاتی ماددی بەهۆکار(وسيلة)یك دادەنێت بۆ گەیشتن بەژیانی دوایی واتە ژیانی بەهەشتی هەرگیز نەبڕاوەی.

لەڕاستی دا دنیا بەخودی خۆی بێزراو نەویست نیە، بەڵکو بەگوێرەی کردەوەکانی بەندەکان تیایدا وەسف بەچاکەو بەخراپە دەکرێت واتە چاك دەبێت یاخراپو بێزراو دەبێت، بەڕاستی دنیا پردێكو تێپەڕگەیەکە مرۆڤەکان دەتوانن بەسەری دا بۆ ژیانی دوایی بپەڕنەوە، لەو ژیانەشدا زادو زەخیرەی بەهەشت، و خۆشترین ژیانە کەئەهلی بەهەشت وەدەستی دێنن، بەرهەمی ئەو هەوڵو کۆششو ئەو کشتوکاڵەیە کەلەم دنیایەدا چاند بویانو لەوێش بەرهەمەکەیان چنیەوە.

بەڵێ، دنیا خانەی تێکۆشانو هەوڵ دانە، خانەی نوێژو ڕۆژوە، خانەی بەخشینو چاکە کردنو دەستگیرۆیی موسڵمانانە لەڕێگەی خوادا، گۆڕەپانی پێشبڕکێ یە بۆ چاکەو چاکەکاریو بەخشینو خێرات کردن، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾[٢٤٨].

---

([٢٤٨]) ـ سورة الحاقة: (٢٤).

## بەشـــی دەیەم

## نوشتەو گشتەك كردنو جادوگەری( الرقی والتمائم ).

**١ـ نوشتەو گشتەك(الرقیَ):**

كۆی(رقية)یەو بریتیە لەنوشـتەو گشـتەك كـردنو جـادو كـردن بـۆ كەسـێك بـۆ لابردنـی نەهامەتیەك كەخاوەنەكەی توشی هاتوە وەك تاو فێ گرتن،و هەر نەهامەتیەكی تر بێت، وە پێشیان دەگوترێت نوشتو یانوشتە(العزائم)، كەئەمەش بەدو جـۆر دەكـرێن كەلـەم دو خاڵانەی خوارەوەدا گردیان دەكەینەوە:

**جـۆری یەكـەم:** ئـەو دوعـاو نوشـتوانەی كەهاوبـەش دانانیـان تێدا نیـە، بـەو شـێوەیەی كەهەنـدێ قورئـان لەسـەر نەخۆشـەكە دەخوێنـدرێت، یـاخود بەنـاوە جـوانو سیفاتە بەرزەكانی خوا دوعای بۆ دەكرێت، دیارە ئەم جۆریان رێگـە پێـدراوە(مبـــاح)ە، چونكە پێغەمبەرﷺئەم جۆرە دوعایەی كردونو فرمانیشی كردوە بەكردنیو مۆڵەتی بـە موسڵمانان داوە، لەعوف كوڕی مالك هاتوە كەگوتویەتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامیمانـدا دوعاو نوشتەمان دەكرد گوتمان: ئـەی ڕەسـولی خـوا، ئەمـە چـۆن دەبینـی؟ فـەرموی: { أعرِضوا عليَّ رقاكم، لابأس بالرقى ما لم تكن شركاً }([٢٤٩]).

السيوطي گوتویەتی: زانایان هەمو لەسەر ئەوە كۆكن كەدوعا بۆ كـردن(الرقیَ) دروسـتە، بەمەرجێ ئەم سی مەرجەی تێدا كۆ ببنەوە:

١ـ دەبی ئەو دوعایە بەفەرمایشتی خوا واتە بە ئایەتـەكانی قورئـان بێـت، یـاخود بـەناوو سیفاتەكانی خوا بێت.

٢ـ وەدەبێ بەزمانی عەرەبی بێت كەتێ ی بگەیت.

---

ب ـ واتە: لەناوباخ‌ی باخاتی بەهەشتدا بەبڕواداران دەگوترێت: دەی بخۆن بخۆنەوە دەك عافێتتان بێت لەبەرهـەمی ئـەو هەمو كارە چاكو چاكگوزاریانەی كەلە ژیانی دنیادا ئەنجامتان دابو، و لەپێش خۆتاندا بەڕێتان كرد بو. وەرگێڕ.

([٢٤٩])أ ـــ رواه مسلم.

ب ـ واتە: دوعاو نوشتوەكانتانم پێشان بدەن، دوعا كردن هیچی تێدا نیە بیكەن مادام هاوبەش دانانی بۆ خوای گەورە تێدا نەبێت. وەرگێڕ.

٣ـ هەروەها دەبی باوەڕ وابێت کەئەو دوعایە بەخودی خۆی هیچ کاریگەریەکی نیە، بەڵکو بەقودرەتو بەتواناو بەفرمانی خواو بەویستی خوا چاك دەبێتەوە([٢٥٠])، وەچۆنیەتەکەشی بەم شێوەیەیە: دەبێ ئایەتەکانو فەرمودەکان بەسەر نەخۆشەکەدا بخوێندرێتو فوی پێدا بکات، یاخود لەئاو بخوێندرێتو نەخۆشەکە بیخواتەوە، هەروەك چۆن لەفەرمودەی ثابت کوڕی قیس دا هاتوە:(( کەپێغەمبەرﷺ هەندێ لەخۆڵی(بطحان) هەڵ گرتو، لەپەرداخێکی کرد، ئەوجار ئاوی تێ کردو ئەمجار فوی پێدا کردو بەسەر نەخۆشەکەی داکرد}([٢٥١]).

**جۆری دوەم**: ئەو دوعاو نوشتە نوسینەی کەلەهاوبەش دانان بەدەر نیە: بریتن لەو دوعاو نوشتانەی کەتیایاندا هانا بۆ غەیری خوا دەبردرێت، لەدوعا کردنو پاڕانەوەو هانا بردنو داوا کردنو پەنا گرتن بەغەیری خوا، وەك ئەو نوشتەو جادوانەی کەبەناوی جنۆکەکانەوە، یاخود بەناوی فریشتەو پێغەمبەرانو پیاو چاکان دەکرێن، ئەم جۆرە دوعایانەی کەبەغەیری خوا دەکرێت هاوبەش دانانی گەورەن، یائەو دوعایانەی کەبەغەیری زمانی عەرەبی دەکرێن، یاخود بەشتانێك دەکرێن کەواتاکانیان نازانرێتو ڕون نین، چونکە مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کەکوفرو هاوبەشی تێدا بێنو نەزانرێن، ئەم جۆرەیان لەدوعاو نوشتەدا قەدەغەو حرامنو دروست نین.

٢ـ نوشتەو ملبەندەکان(التمائم ـ حەمایلەکان):

کۆی(تیمـــــة)یەو بریتیە لەو نوشتەو گشتەکانەی کەبەملی منداڵانەوە هەڵ دەهاوەسرێت بۆ لادانی چاوەزار، زۆر جاریش بەلەشی پیاوانو ژنانیش دا هەڵ دەهاوەسرێت([٢٥٢])و دو جۆری هەن:

---

([٢٥٠]) فتح المجيد ص١٣٥.

([٢٥١]) رواه وأبو داود في كتاب الطب حديث رقم (٣٨٨٥).

([٢٥٢]) لەفەرهەنگی(المنجد في اللغة)دا نوسینی لوێس معلوف ، چاپی تاران، ساڵی ١٣٨٢هەتاوی.لاپەڕە٦٤ بەم جۆرە پێناسەی (التميمة)ی کردوە: (کۆیەکەی(التمائم)یاخود(التميمات)ە وبریتیە لەو مورو یان ڕشتە مورو هاو شێوەکانی کەخەڵکی بەخۆیانو بەمنداڵو بەگیاندارەکانیاندا هەڵیان دەهاوەسن بۆ چاوەزارو دور خستنەوەی گیانە پیسەکان). تەمیمە من پێم وایە بەزۆری بەو حەمائلو نوشتە زلانە دەگوترێت کەلەگەڵ چەند شاڵێکی پەڕۆی سەوزی سەر گۆڕی پیاو چاکانو داروبەردو چیلکەی سەر گۆڕستانو هەندێ جاریش خۆڵی سەر گۆڕەکان بەملبەندێکی چەرمی یان پەتێکی

**جۆری یەکەم لەنوشتەکان:** ئەوەی کەلەقورئان دا دەکرێت، بەنوسینی ئایەتەکانی قورئان، یاخود بەناوو سیفاتەکانی خوای گەورە، و بۆ شیفا بەکار دەهێنرێن‌و هەڵ دەهاوەسرێن، ئەم جۆرەیان زانایان تیایدا جیاوازن لەحوکمی هەڵواسینەکەی دا بەدو گۆتە:

**گۆتەی یەکەم: دروستە:** کەبرتیە لەقسەی عبداللە کوڕی عمرو کوڕی عاص، ڕواڵەتەکەی ئەوەیە کەلەعائشەوە دەگێڕێتەوە، وەأبو جعفر الباقر دەیهێنێ، وەأحمد بن حنبل لەڕیوایەتی ئەوەوە دەیهێنێ بەگوێرەی ئەم فەرمودەیە تەنیا ئەو نوشتانە قەدەغە دەکەن لەهەڵواسین کەهاوبەش دانانیان تێدایە.

**گۆتەی دوەم: قەدەغە کردن‌و دروست نەبونی هەڵواسینی نوشتەوگشتەک:** ئەمەش قسەی إبن مسعودو إبن عباس، ئەمەشیان ڕواڵەتی قسەی حذیفة وعقبة کوڕی عامر، وإبن عکیم. وەبەهەمان قسە کۆمەڵێك لەشوێن کەوتان هێناویانە لەوانە: هاوەڵانی إبن مسعود، وأحمد لەڕیوایەتێکدا کە زۆرێك لەهاوەڵەکانی هەڵیان بژاردوە، وە ئەوانی دوایش(کەلەوانەیە مەبەست لەزانایانی دوایی بێت - وەرگێڕ) بڕیاریان لەسەر داوەو پێیەوە پەیوەست بون، وەبەڵگەشیان بەوە هێناوەتەوە کەإبن مسعود ﷺ ڕیوایەتی کردوە کە گوتویەتی: گوێم لەپێغەمبەرﷺ بودەیفەرمو: { إن الرقى والتمائم والتولة شرك }([253]). (التولة): شتێکەو دەیکەن، دەڵێن گوایە ژن لەلای مێردەکەی خۆشەویست دەکات، هەروەها پیاو لەکن ژنەکەی خۆشەویست دەکات.

ئەمەش لەسێ ڕووەوە ڕاستە:

---

ئەستور نزیکەی پێنج تاشەش دانە لەو نوشتە پانە زلانە گرێ دەدرێن‌و بەملی خۆیان بەتایبەتی بۆ ئافرەتانی تازە منداڵ بو و لای مەلۆتکە دادەنرێت گوایە لەچاوەزارو لەشەوەو لەجنۆکەکان دەیان پارێزێت، یاخود بەحەیوانەکان‌و لای کشتوکاڵەکانیان هەڵی دەهاوەسن بۆ هەمان مەبەست. ئەوەی جێگەی داخ‌و شایەنی باسە ئەو نوشتەو گشتەکو حەمائلانە هەر هەمویان بریتین لەسیحرو جادو، بۆ چەواشە کردنی خەڵکی هەندێ ئایەت‌و ناوەپیرۆزەکانی خواشی تێ دەخەن بەڵام بەزۆری وایە ئایەتەکان لەدوای ناوی جنۆکەو شەیاتینیەکان‌و ئەستێرەی نیشانەی جادوگەرانی جولەکەوە دێت. لەزۆرێك لەو نوشتانەدا ناوی خواو هاوار کردنە خوای گەورە لەدوای ناوی سەرۆکی جنۆکەکان‌و لەدوای ئەستێرەی هیمای جادوگەرانی جولەکەوە دێت. ئەو ئەستێرەی کەئێستا لەناو ئاڵای قەوارەی جولەکەدا دەبینیت، بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ئایەت‌و ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە. وەرگێڕ.

([253])أ ــ رواه أحمد وأبو داود و إبن ماجة زالحاكم.

ب ـ واتە: نوشتە کردن‌و جادو کردن هاوبەشی دانانە. وەرگێڕ.

یەکەم: بەتێکڕایی قەدەغەیەو تایبەتی کردنی بۆ گشتی نیە.

دوەم: نەهێشتن‌و بەستنی بەهانەو بڕو بیانوەکانی کەدەبێتە هۆی هەڵواسینی کەڕێگە پیێ نەدراوە.

سێ یەم: ئەگەر شتێك لەقورئان بەخۆوە هەڵ بهاوەسرێت، ئەو کەسەی کەبەخۆیەوە هەڵ دەهاوەسێت گوناحبار دەبێت لەکاتی چونەو ئاوەدەست‌و سەر پێشاو.

جۆری دوەم لەنوشتەو ملبەندو حەمائلەکان:

کەلەغەیری قورئان دەکرێن‌و خەڵکی بەخۆیەوە هەڵ دەهاوەسن، وەك مورو کوژەك‌و هێسك‌و هێلکە شەیتانۆکەو نەعلەو بزمارو ناڵەکەرو ولاخە بەرزە، ناوی جنۆکەکان‌و شەیاتینیەکان‌و جادوو تەلسمەکان، ئەم جۆریان حەرامە بڕای بڕای‌و دروست نیە، و هاوبەش دانانە، چونکە پەیوەستە بەغەیری خوای پاك‌و بێگەردەوەو بەناوو سیفتەکان‌و ئایەتەکانی خواوە، وەلەفەرمودەدا هاتوە: { من تعلق شيئاً وكل إليـــه }([٢٥٤]) واتە: خوای گەورە ئەو کەسە دەداتە دەست ئەو شتەی کەبەخۆیەوە هەڵواسیوەو پیێ یەوە پەیوەستە بیپارێزێت‌و چاکی بکاتەوەو پێداویستەکانی بۆ جێ بەجێ بکات، هەر کەسێك خۆی پەیوەست بکات بەخوای گەورەو بەرەو خوا بچێت‌و ڕو بکاتە خوای پەروەردگار، کارو بارەکانی هەمو بداتە دەست خوا، ئەوە خوای بەسە، وهەمو دوریێکی بۆ نزیك دەکاتەوەو بۆی دێنێتە پێش، وهەمو گرژی‌و ناخۆشی‌و تەنگژەکانی بۆ ئاسان دەکاتەوەو گرێ کوێرەکانی بۆ دەکاتەوە، بەڵام هەر کەسێك پەیوەست بێت بەغەیری خوا لەدروستکراوەکان ونوشتەو گشتەك‌و جادووجادوگەری‌و داوو دەرمانەکان‌و گۆڕەکان و گۆڕ پەرستی، خوای گەورە ئەو کەسە دەداتە دەست ئەو شتەی کەپەیوەستە پیێ یانەوەو ناتوانن هیچ شتێکیان نەلێ لابدەن‌و نە هیچ شتێکیشیان بۆ بێنن، وەنەدەتوانێت نەزیانیان پیێ بگەیەنن‌و نەهیچ سودێکیان پی بگەیەنن، ئەو کەسە بیروباوەڕو عەقیدەکەشی دەدۆڕێنێت‌و لەدەست دەدات‌و پەیوەندیشی بەپەروەردگاری خۆیەوە دەپچڕێنێت‌و خوای گەورە سەر شۆڕی دەکات.

---

([٢٥٤]) أ ــ رواه أحمد والترمذي.

ب ـ واتە: هەر کەسێك هەر شتێك لەو جۆرانە بەخۆوە هەڵ بهاوەسێت .

ئەوەی لەسەر پێویستە بابای موسڵمان: بەهەر حاڵێكو هەر چۆنێك بێت پارێزگاری لەبیروباوەڕەكەی خۆی بكات لەو شتانەی كەبیروباوەڕەكەی تێك دەداتو بۆگەنی دەكات دور بكەوێتەوە، ئەو داوو دەرمانەی كەدروست نینو پیسن هەرگیز نابێ بدرێت بەنەخۆشەكان، نابێ بچن بۆ لای خڵەفاوو سەر لێشێواوەكانو قوڵ برەكان بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشەكانیان بۆ بكەن، چونكە دڵو دەرونو بیروباوەڕەكەیان نەخۆش دەكاتو لەخوای دور دەخاتەوە، و هەر كەسێكیش پشت بەخوا ببەستێت خوای بەسە.

هەندێ لەخەڵكی ئەو شتانە بەخۆیاندا هەڵ دەهاوەسن، هەر چەندە ئەوانە هیچ نەخۆشیەكی هەستیاریان نیە، بەڵكو نەخۆشی دەرونیو خەیاڵی یان هەیە، ئەویش ترسانە لەچاوەزارو چاو لێدانو ئیرەیی(الحسد)، یاخود بەئوتومبیلەكەی یاتاژەڵەكەیدا یابەدەرگای ماڵەكەی، یادوكانەكەی دا هەڵ دەهاوەسێت، ئەمە هەموی لەبێ هێزی بیروباوەڕەوەیە، وەبی هێزی پشت بەستنە بەخوای گەورە، وەئەگەر بیروباوەڕ بێ هێزی بو ئەوە نەخۆشی ڕاستەقینەیە كەپێویستە چارەسەری بكرێت بەزانستو زانیاری بەتەنها خوا پەرستیو بیروباوەڕی ڕاستەقینە.

*******    *******    *******

## بەشی پانزەهەم

## سوێند خواردن بەغەیری خوا، پاڕانەوەو هاناو پەنا بردنە بەر دروستکراوەکان

أ- سوێند خواردن بەغەیری خوا(الحلف بغير الله):

سوێند(الحلف): واتە(اليمين)، کەبریتیە لە: دڵنیا کردنەوەی حوکم بەیاد کردن یا ناو هێنانی شکۆمەند(مُعَظَّم) بەڕویەکی تایبەت، وەبەگەورە دانان: مافێکی خوای بەرزو بێ هاوتایە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە کەسوێند بەغەیری خوا بخورێت، زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کەدروست نیە سوێند بەغەیری خوا بخورێت تەنیا بەخوای گەورە نەبێت، یان بەناوو سیفەتەکانی خوا بخورێت، هەروەها لەسەر ئەوە کۆکن کەنابێ بەغەیری خوا بخورێت[٢٥٥]. وەسوێند خواردن بەغەیری خوا هاوبەش دانانە(شرك)، بەگوێرەی ئەوەی کەلەإبن عمر - رضي الله عنهما - دەگێڕدرێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك}[٢٥٦]. هاوبەش دانانی بچوکە(شرك الأصغر) ، مەگەر کاتێك سوێند پێ خوراو زۆر گەورە بێت لای سوێند خۆرو بگاتە پلەی بەندایەتی بۆ کردنو پەرستن ئەوە ئەو کاتە ئەو سوێند خواردنە هاوبەش دانانی گەورەیە، هەروەکو ئێستاو لەڕۆگاری ئەمڕۆماندا لەگۆڕپەرستەکاندا دەیبینین، ئەو گۆڕ پەرستانە ئەوەندە لەو خاوەنی گۆڕانە دەترسن کەبەگەورەیان دەزانن پتر لەترسانیان لەخوای گەورەو بەگەورە دانانی خوای پەروەردگار، بەجۆرێك کاتێك داوا لەیەکێك لەو گۆڕ پەرستانە بکرێت کەسوێند بەو وەلی یە بخوات کەبەگەورەو پیرۆزی دەزانێت، سوێندی پێ ناخوات تەنیا بەڕاستی نەبێت، وەئەگەر داوای لێ بکرێت سوێند بەخوا بخوات، ئەوە بێ سێ ودو سوێند دەخوات جابابەدرۆش بێت.

دەی سوێند خواردن بەگەورە دانانو بەپیرۆز زانینی سوێند پێ خوراوەکەیە کەلایەقو شایستە نیە تەنیا بۆ خوای پەروەردگار نەبێت، وەپێویستە هەمیشە سوێند کەم بخورێتو ئاگاداری سوێند خواردن بیت، زۆر سوێند خۆر نەبیت، خوای بەرزو بێ هاوتا

---

(٢٥٥) پەراوێزی( إبن قاسم) لەسە کتێبی(التوحيدص٣٠٣).

(٢٥٦) أـ رواه أحمد والترمذي والحاكم.

ب- واتاکەیمان لەڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

دەفەرموێت:﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ﴾([٢٥٧])، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ﴾ سورة المائدة: (٨٩). واتە هەرگیز سوێند مەخۆن مەگەر لەکاتی زۆر پێویستداو، وەبەڕاستیو لەکاتی چاکەو خێردا، چونکە زۆر سوێند خواردن یان خواردنی بەدرۆ سوکایەتی کردن بەخوای گەورە دەگەیەنێت، وەهەروەها بەگەورە نەزانینیو بێ ڕێزیە بەرامبەر بەخوای پەروەردگار، سەرباری ئەمەش پێچەوانەو دژی تەواویەتی بەتەنها خوا پەرستی یە(كمال التوحيد)، لەفەرمودەدا هاتوە کەپێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ثلاثـة لايكلمهم الله ولا يزكهم، ولهم عذاب أليم} هەروەها تیایدا هاتوە:{ورجل جعل الله بضاعتة لايشتري إلا بيميته، ولا يبيع إلا بيمينه}([٢٥٨]). هەڕەشەی توند لەبارەی سوێند زۆر سوێند خواردنەوە کراوەو پێ ی زۆر لەسەر داگیراوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێتو بەڵگەیە لەسەر حەرامیەتی سوێند خوارد وەك ڕێز گرتنو ڕێز نان لەناوی پیرۆزی خوای بەرزو بالاًدەست(الله) گیان و بەگەورەو پیرۆزدانانی خوای پاكو بێگەرد.

هەروەها حەرامە سوێند خواردن بەخوا بەدرۆ، کەبریتەیە لە: سوێند خواردنی بەدرۆ (الغموس)([٢٥٩]). خوای گەورە دوو ڕوەکانی بەوە باس کردون کەسوێند بەخوا بەدرۆ دەخۆنو دەشزانن کەبەدرۆ سوێندی پێ دەخۆن.

پوختەی ئەمە:

---

([٢٥٧])أ ــ سورة القلم: (١٠)

ب ـ واتە:گوێ ڕایەڵی ئەو کەسە مەکە کەهەمیشەو زۆر سوێندنی بەدرۆ دەخوات و بەقسەی سوێند خۆری سوكو چروكو ڕیسواو سوكەڵەکان مەکە کەهەمیشە خەریکی باسو خواسی ئەم و ئەونو هەر خەریکی فیتنە گێڕیو خۆش کردنی ئاگری ئاشوبن و هەڵگیرسێنەری فیتنەو فەسادین.وەرگێڕ.

([٢٥٨])أ ــ رواه الطبراني بسند صحيح.

ب ـ واتە: سێ کەس هەن خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا نەقسەیان لەگەڵ دا دەکاتو نەپاکیشیان دەکاتەوە، وەئازارێکی زۆر بەسەختو سوێشیان هەیە. یەکێ لەوانە پیاوێکە کەڵو پەلەکەی بەسوێندو سوێند خواردن نەبێت نافرۆشێت، هەروە بەسوێند خواردن نەبێت کەڵو پەڵو شتومەکەکانی ناکڕێت. وەرگێڕ.

([٢٥٩]) ئەوەیە کەخاوەنەکەی واتە سوێند خۆرەکە خۆی لەناو گوناحو تاوانەکاندا نقوم دەکات و بەهۆی ئەمەشەوە دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەویش ئەوەیە کەسوێندەکە لەسەر شتێكو لەسەر کارێکی ڕابردو دەخواتو دەشزانێت کەبەدرۆ دەیخوات.

١ـ حەرامە سوێند خواردن بەغەیری خوای بەرزو بالا دەست، وەك سوێند خواردن بە ئەمانەت، یابەكەعبە، یابەپێغەمبەرﷺ ئەم سوێند خواردنە هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورە.

٢ـ حەرامە سوێند خواردن بەخوای گەورە بەدرۆو بەقەستی، كەئەوە سوێند خواردنی بەدرۆیە.

٣ـ حەرامە زۆر سوێند خواردن بەخوای گەورە ـ هەر چەندە بەڕاستیش بیخۆیت ـ مەگەر زۆر پێویست بێتو كارەكە وا بخوازێتو هەر دەبێ بخورێت، چونكە ئەمە بێ ڕێزیو سوكایەتی كردنە بەخوای پاكو بێگەرد.

٤ـ دروستە سوێند خواردن ئەگەر بەڕاستی بخورێت، وەلەكاتی پێویستیش دابێت.

**ب ـ خۆ نزیك كردنەوە لەخوای گەورە بەهۆی دروستكراوەكانیەوە:(التوسل بالمخلوق):**

خۆ نزیك خستنەوە(التوسل): لەنزیك بونەوە لەشتێكو گەیشتن پێ ی بەهۆی شتێكی ترەوە، وە(الوسيلة) واتەهۆو هۆكارو لەسۆنگەو نزیكی یانزیكایەتی(القربة). خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ ﴾ سورة المائدة: (٣٥)، واتە: خۆلەخوا نزیك كردنەوە بەهۆی گوێ ڕایەڵیو بەندایەتی كردن بۆ خوای پاكو بێگەرد، گرتنە بەری ئەو كارو كردەوەو شتانەی كەخوای گەورە پێ یان ڕازیە.

**جۆرەكانی خۆ نزیك كردنەوە:**

خۆنزیك كردنەوەو هۆكارەكانی دو بەشن كەئەمانەی خوارەوەن:

**بەشی یەكەم: خۆنزیك كردنەوەی شەرعیو هۆكارەكانی: ئەویش چەند جۆرێكن لەم چەند خاڵانەدا دەیان گوشین:**

١ـ جۆری یەكەم:خۆ نزیك خستنەوە لەخوای گەورە بەناوو سیفاتەكانی، هەروەك خوای بەرزو بالا دەست فرمانی پێ كردوینو دەفەرموێت:﴿ وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾[٢٦٠].

٢ـ جۆری دوەم: خۆ نزیك خستنەوە لەخوای گەورە بەهۆی باوەڕ(الإيمان)وكردەوە چاكەكانی كەكردوتن، هەروەكو خوای گەورە لەبارەی ئەهلی باوەڕدارانەوە دەفەرموێت:

---

([٢٦٠])أ ــ سورة الأعراف: (١٨٠).

ب ـ واتاكەیمان لەبەشەكانی ڕابردودا نوسیوە تكایە بۆی بگەڕێوە. وەرگێڕ.

﴿رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ﴾(٢٦١).

هەروەکو لەفەرمودەی سێ کەسەکەدا کەبەردێکی زل دەرگای ئەشکەوتەکەیانی لێ داخستن،و دەرگای ئەشکەوتەکە داخراو لەوێدا گیریان خوارد، و نەیان توانی بێنە دەر، هیچ چارێکیان نەما ناچار هەر کەسە بەکردەوە چاکەکانی خۆیان خۆیان لەخوا نزیک کردەوە واتە کردیان بەهۆکار(الوسیلة ـ واسطة) لەنێوان خۆیان‌و خوای گەورەدا بۆ ئەوەی دەرگای ئەشکەوتەکەیان لی بکاتەوەو ڕزگاریان ببێت، ئەوە بو خوای گەورە نزاو پاڕانەوەکانیانی وەرگرت‌و دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ کردنەوەو هاتنە دەر(٢٦٢).

٣ـ جۆری سێ یەم: خۆ لەخوا نزیك خستنەوە بەبەتەنها خوا پەرستی، هەروەکو یونس ـ علیه السلام ـ کردی بەهۆکارو پێ ی لەخوای گەورە پاڕایەوە:﴿ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لاَّ إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ ﴾(٢٦٣).

٤ـ جۆری چوارەم: خۆلەخوای گەورە نزیك خستنەوە بەبێ هێزی‌و لاوازی‌و پێویست بون بەخواو موحتاج بون بەخوای تاك‌و تەنیا، هەروەکو ئەیوب ـ علیه السلام ـ بەکاری هێنا:﴿ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾(٢٦٤).

---

(٢٦١)أ ــ سورة آل عمران: (١٩٣).

ب ـ واتە: ئەی پەروەردگارا ئێمە گوێمان لەبانگ دەرێك بو بانگی دەکردین بۆ بڕوا هێنان، دەیگوت: ئەی خەڵکینە پەلە بکەن بۆ بڕوا هێنان بەپەروەردگاری خۆتان، ئێمەش بەپەلەو بێ دوا کەوتن بڕوامان بەتۆو بەپێغەمبەرەکانت‌و بەبەرنامەو شەریعەتەکەی تۆ کرد، دەی ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆش لەگوناحەکانمان ببورەو و تاوانەکانمان ڕەش بکەوەو بەڕەحمەتی خۆت دایان پۆشەو لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ بڕوادران‌و ئەستۆپاکاندا زیندومان بکەوە. وەرگێر.

(٢٦٢) ئەمە دەقی ناوەرۆکی فەرمودەکەیە(متفق علیه) یە. نوسەر.

(٢٦٣)أ ــ سورة الأنبیاء: (٨٧).

ب ـ واتە: یونس لەناو تاریکایی سکی ماسیەکەدا بانگی لەخوای گەورە کردو گوتی: ئەی خودای من هەر تۆ خوای بەهەقیت‌وهیچ خوایەکی تر نین بەهەق بپەرسترێت لەتۆ بەولاوە من پەشیمانم‌و ستەمم لەخۆم کردو بم بورە. وەرگێر.

(٢٦٤)أ ــ سورة الأنبیاء: (٨٣).

ب ـ واتە: خوایەگیان من توشی ئەم بەڵای ناخۆشیە بوم‌و زۆر ناڕەحەت‌و پەرێشان بوم‌و تۆش لەهەمو خاوەن سۆزو بەزەییەکان بەسۆز ترو بەبەزەیی تری بەزەیت پێمدا بێتەوەو شیفام بۆ بنێریت. وەرگێر.

٥ـ جۆری پێنجەم: خۆ لەخوا نزیك خستنەوە بەدوعاو پاڕانەوەی پیاو چاكانی زیندو و ئەوانەی لەژیاندا ماون، هەروەكو چۆن هاوەڵان كاتێ وشكە ساڵی و گرانی پەیدا بو داوایان لەپێغەمبەرﷺكرد كەبۆیان بپاڕێتەوە بەڵكو خوای گەورە بارانیان بۆ ببارێنێت، وەكاتێ پێغەمبەرﷺ وەفاتی كرد داوایان لەمامی پێغەمبەرﷺ عبـاس ـ ﷺـ كرد كەدوعایان بۆ بكات([٢٦٥]).

٦ـ جۆری شەشەم: خۆ لەخوا نزیك كرنەوە بەهۆی ددان نان بەگوناحو تاوانەكان:﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي ﴾ سورة القصص: (١٦).

**بەشی دوەم: خۆ نزیك خستنەوەو هۆكاری نامەشروع:**

بریتیە لەو هۆكارو خۆ نزیك خستنەوەیە كەبەجگە لەو جۆرانەی ڕابردو كەئاماژەمان پێ كردن لەو هۆكارو خۆنزیك كردنەوە شەرعیەكان دەكرێت، وەك خۆنزیك كردنەوە بەداوا كردنی دوعاو تكا كردن لەمردوان، خۆلەخوا نزیك كردنەوە بەپلەو پایەی(الجـاه) پێغەمبەرﷺ، یاخۆ لەخوا نزیك كردنەوە بەخودو بەهەقی دروستكراوەكان، درێژەی ئەم باسە لەم چەند ڕیز بەندیانەی داهاتودا دەخوێننەوە:

**١ـ داوای دوعا كردن لەمردوان دروست نیە:**

چونكە مردو توانای دوعا كردنی نیە، هەروەكو چۆن لەكاتی زیندویی و لەژیاندا دەتوانێت، هەروەها داوا كردنی تكا كردن لەمردوان دروست نیە، چونكە عمر كوڕی الخطاب و معاویة كوڕی أبي سفیان ـ رضي الله عنهما ـ لەگەڵ ئەو هاوەڵانەو شوێن كەوتوانەی بەچاكە كەلەگەڵیاندا بون، كاتێك توشی وشكە ساڵی و گرانی بون داوای دوعاو تكایان بەزیندوەكان كرد كەلایان بون و لەگەڵیاندا دەژیان كەدوعای باران بارینیان بۆ بكەن وەك عباس و یزید كوڕی الأسود، خۆیان لەخوا بەپێغەمبەرﷺ نزیك نەكردەوەو داوای باران بارین و تكایان لەپێغەمبەرﷺنەكردو نەچونە لای گۆڕەكەی و گۆڕی هیچ كەسی تر، بەڵكو ڕاست ڕۆیشتن لەبری گۆڕی ئەو ڕویان كردە عباس یا یزید، وعمر گوتی:(خوایە گیان ئێمە تاپێغەمبەرﷺلەناوماندا مابو خۆمان بەو لەتۆ نزیك

---

([٢٦٥]) رواه البخاري.

دەخستەوەو داوامان لێ دەکرد کەدوعامان بۆ بکات لەبارەگای تۆداو بۆ ئەوەی بارانمان بۆ ببارێنیو تۆش بارانت بۆ دەباراندین، ئێستاش کەپێغەمبەرﷺ لەناوماندا نەماوەو وەفاتی کردوە بەمامی پێغەمبەرﷺخۆمان لەتۆ نزیك دەکەینەوەو ئەو دەکەینە هۆکار لەنێوان ئێمەو تۆداو داوای دوعا لەو دەکەین کەلەبارەگای تۆدا بۆمان بپاڕێتەوە، خوایە گیان تۆش بارانمان بۆ ببارێنە)، لەبری پێغەمبەرﷺ دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺخۆیان لەخوا بەمامی پێغەمبەرﷺلەخوا نزیك کردەوەو داوای دوعایان لێ کرد، چونکە دروست نەبو کەدوای مردنی پێغەمبەرﷺداوای دوعا لەو بکەن بەشێوەیەکی شەرعیانە، خۆ ئەگەر دروست بایە دوای نەمانی پێغەمبەرﷺ ئەو کارە دروست بایە دەیان کردو نەدەچونە لای مامی پێغەمبەرﷺخۆ ئەو لێ یان دور نەبوو لەبەر دەستی خۆیاندا بو، دەی چونکە دروست نەبو ئەوەیان نەکرد.

خۆ دەیان توانی بێنە لای گۆڕەکەیو لێ ی بپاڕێنەوەو داوای لێ بکەن کەبۆیان لەبەر خوا بپاڕێتەوەو خۆیانی پێ لەخوا نزیك بکەنەوە([٢٦٦])، جانەکردنی ئەم کارەو نەچونە سەر گۆڕەکەی خۆی لەخۆی دا بەڵگەیە لەسەر دروست نەبونی داوا کردن لەمردوان کەدوعایان بۆ بکات یاپەنا بردن بۆ مردوان یا خۆ لەخوا نزیك کردنەوە بەهۆی مردوان دروست نیەو حەرامە، وەنەداوا کردنی تکاو دوعا کردن لەو خاوەن گۆڕانە بکرێت لەکاتێکدا ئەوان مردون، دەی ئەگەر داوا کردنی دوعاو داوا کردنی تکا بەزیندویی و لەحاڵەتی ژیانداو لەکاتی مردن وەك یەك بایە، ئەوا ئیمامی عمـــرو هاوەڵان ڕویان لەپێغەمبەرﷺلەگۆڕدا وەر نەدەگێڕاو نەدەچونە لای مامی و لای یزید کەلەپێغەمبەرﷺ پلەو پایەیان نزم تر بون.

٢- خۆ نزیك کردنەوە لەخوا بەپلەو پایەی پێغەمبەرﷺ یا بەپلەو پایەی غەیری پێغەمبەریشﷺ دروست نیە.

ئەو فەرمودەیەی کەتیایدا هاتوە:( ئەگەر داواتان لەخوا کرد بەپلەو پایەی من داوای لێ بکەن، چونکە پلەو پایەی من زۆر گەورەیە) ئەمە فەرمودەیەکی درۆیە، لەهیچ کامێك

---

([٢٦٦]) مجموع الفتاوی(١/٣١٨ــ٣١٩).

لەکتێبەکانی موسڵمانانـدا نیە کەڕاستن‌و پشتیان پێ دەبەسترێت، وەهیچ کامێك لەئـەهلی زانست‌و زانیاری فەمودە واتە فەرمودە ناسان باسی ئـەم فـەرمودەیان نـەکردوەو ناویـان نەهێناوە([٢٦٧])، دەی مادام بەڵگەی ڕاست‌و دروستی لەسەر نیە، ئەوە ئەو خۆ لەخوا نزیـك کردنەوەو ئـەو هۆکـار بـەکار هێنانـە بـەهیچ شـێوەیەك دروسـت نیـە، چـونکە بەندایـەتی کردن‌و خوا پەرستی بەبێ بەڵگەی ڕاست‌و شەرعی ناچەسـپێت‌و دروسـت نیـە ئـەو جـۆرە بەندایەتی‌و پەرستنە بکرێت.

٣ـ خۆ لەخوا نزیك کردنەوە بەخودی دروستکراوەکان(بذوات المخلوقين) دروست نیە.

لەبەر ئەوەی ئەگەر(ب)یەکە لەدەستەواژەی(بذوات المخلوقين) پیتـی سـوێند خـواردن بێت، ئەوە سوێند خواردنە بەو دروستکراوە واتە سوێند خواردنە بەغەیری خوای گەورە، وەئەگـەر سـوێند خـواردن بەدروسـتکراو لەسـەر دروسـتکراو واتـە سـوێند خـواردنی دروسـتکراو بەدروسـتکراو دروسـت نـەبێت، و بریتـی بێـت لەهاوبـەش دانـان هـەروەکو لەفەرمودەدا هاتوە، ئەدی دەبێ سوێند بەدروستکراو لەسەر خوای دروستکەرو بەدیهێنـەرێا واتە بەغەیری خوا ـ جل وعلا ـ چۆن بێت؟!

وەئەگەر ئەو(ب)یە بـۆ هۆکـار واتـە سـەبەب بێـت خـوای پـاك‌و بێگـەرد داوا لێ کردنـی بەدروستکراو نەکردۆتە هۆکارێك بۆ وەڵام دانەوە، و بۆ بەندەکانی نەکردۆتـە شـەریعەت‌و ڕێبازێك هەتاکو بەهۆی ئەو دروستکراوانەوە داوا لەخوا بکرێت‌و لەبەری بپاڕێنەوە.

## ٤ ـ خۆ لەخوا نزیك خستنەوە بە هەقی دروستکراوەکان(بحق المخلوق) دروست نیە لەبەر دو هۆ:

یەکەم: هیچ کەسێك ناتوانێت مافێك یـان کارێك بەسـەر خـوای پـاك‌و بێگـەردا پێویسـت بکـات‌و بەسـەریدا بسـەپێنێت، بـەڵکو ئـەوە خـوای پـاك‌و بێگـەردە ئـەو مافـەی لەسـەر دروستکراوەکانی خۆی هەیەو ئەو بڕیارە لەسەر خۆی دەدات بۆ دروستکراوەکانی خۆی، هەروەکو خوای گـەورە دەفـەرموێ:﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ سورة الروم: (٤٧).

([٢٦٧]) سەرچاوەی ڕابردو (٣١٩/١٠). نوسەر.

(واتە: پێویست بو لەسەرمان کەباوەڕداران بەسەر بێباوەڕان‌و خراپەکاراندا سەر بخەین. وەرگێڕ).

ئەگەر گوێ ڕایەڵ(المطيع) شایستەی پاداشتە لەبەرامبەر گوێ ڕایەڵی‌و چاکەکاری خۆی دا، کەبەڕاستی شایستەی ڕێزو چاکەو بەخشش‌و خەڵاتە، نەك ئەو شایستەیە بەرامبەری بێت هەروەکو دروستکراو بەسەر دروستکراویەوە هەیە.

دوەم: ئەو مافەی کەخوای گەورە بەلوتفی خۆی‌و میهرەبانی خۆی بەسەر بەندەکەی دەنوێنێ ئەوە مافێکی تایبەتە بەخۆی، هیچ پەیوەندیەکی بەغەیری خۆیەوە نیە، ئەگەر بەشتێکی تری غەیری خاوەن ماف نزیك بکاتەوە یاباشتر بڵێین بەغەیری خاوەنی ئەو میهربانی‌و فەزڵە پاڕایەوە ئەوە بەشتێکی نامۆو بەدەر لەخاوەنی شایستەی خۆی پاڕاوەتەوەو هۆکارێکی نامەشروعی گرتۆتە بەر کەلێ ی وەرناگیرێت، هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نیەو هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت.

بەڵام ئەو فەرمودەیەی کە(أسألك بحق السائلين ـ بەمافی ئەو کەسانەی کەلێت دەپاڕێنەوە داوات لێ دەکەم)ی تیادا هاتوە، ئەو فەرمودەیە نەچەسپاوەو نەسەلمێندراوە، چونکە لەپاڵ پشتەکەی دا(إسناده) (عطية العوفي) تێدایە، کەبێ هێزو لاوازەو هەمو کۆڕان لەسەر بی هێزیەکەی، هەروەکو هەندێ لەفەرمودە ناسان گوتویانەو باسیان کردوە، بەم شێوەیە نەبوە، ئەو فەرمودەیە لەم کێشە گرنگەدا لەکاروبارەکانی بیروباوەڕدا بەبەڵگە وەرناگیرێت‌و ناهێنرێتەوە، هەروەها ئەو فەرمودەیە هیچ دوعا کردن‌و خۆ نزیك خستنەوەی بەهەقی کەسێکی دیاریکراو تێدا نیە، بەڵکو خۆ نزیك کردنەوەی بەهەقی داواکاران‌و نزاکاران بەگشتی تێدایە، وەمافی نزاکاران وەڵام دانەوەیە هەروەکو خوای گەورە ئەم پەیمانەی پێداون.

ئەو مافەیە کەخوای گەورە بۆ وەڵام دانەوەی نزاکاران لەسەر خۆی پێویست کردوە، و هیچ کەسی تر جگە لەخوای گەورە ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە، ئەوە هۆکارێك‌و خۆ نزیك کردنەوەیەکە لەخوای گەورە بەپەیمانی ڕاستگۆیانەی(وعده الصادق) خۆی نەك بەهەقی دروستکراو(المخلوق).

**ج ـ حوکمی هانا بردن‌و پەنا بردنە بەر دروستکراو(المخلوق):**

پەنا بردن(الإستعانة): داوای یارمەتی لێ کردن‌و پشت گرتن لەکارەکاندا.

هانا بردن(الإستغاثة): داوای یارمەتی و پشتگیری‌و هانا بردنە بەر بۆ لادانی ناکۆکی‌و بەڵاو کێشەو توندو تیژیەکان. وەهانا بردن‌و پەنا بردنە بەر دروستکراو(المخلوق) بەدو جۆرە:

جۆری یەکەم: پەنا بردن‌و هانا بۆ بردن بەدروستکراو لەو بوارانەی کەتوانای هەیەو دەتوانێت جێ بەجێ یان بکات، ئەم جۆرەیان دروستە، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى ] سورة المائدة: (٢). هەروەها خوای گەورە لەچیرۆك‌و بەسەرهاتی موسادا دەفەرموێ:﴿ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ ﴾ سورة القصص: (١٥). وەهەروەکو ئەو کەسەی کەلەشەڕێك‌و یالەهەر شتێکی تردا بێت هاناو داوای یارمەتی لەبرادەرو هاوەڵەکەی دەکات کەدەستبارێکی لەگەڵ بگرێت‌و یارمەتی بدات‌و سەری بخات، لەو شت‌و لەو بوارانەی کەدروستکراوەکان لەسنوری تواناو دەسەڵاتی خۆیاندایە.

جۆری دوەم: هانا بۆ بردن‌و پەنا بردنە بەر دروستکراو(المخلوق)، لەشتێك یالەبوارانێك دا کەلەسنوری تواناو دەسەڵاتی ئەو دانیەو تەنیا خوای گەورە دەتوانێت، وەك هانا بۆ بردن‌و پەنا بردنە بەر مردوان، و پەنا بردنە بەر زیندوان، لەکارو لەشتێکدا کەجگە لەخوای گەورە کەسی تر تواناو دەسەڵاتی بەسەری دا ناشکێت‌و ناتوانێت ئەنجامی بدات وەك شیفا هێنانی نەخۆشەکان، و ڕزگار کردن لەبەڵاو ماتەمینی‌و تەنگژەکان‌و لادانی زەرەرو زیانەکان، ئەم جۆرەیان دروست نیە، وهاوبەش دانانی گەورەیە، لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ دورو هەبون‌و ئازاری بڕوادارانیان دەدا، هەندێکیان دەیان گوت: هەستن بابچین هانا بۆ ڕەسولی خواﷺ بەرین لەدەست ئەو دورووە، پێغەمبەرﷺفەرموی:{ إنه لايستغاث بي، وإنما يستغاث الله }[٢٦٨]. وەپێغەمبەرﷺ زۆری پێ ناخۆش بو ئەو وشەو ئەو قسەیەی لەئاستدا بەکار بهێنرێت، هەتاکو لەو کارو لەوشتانەشدا کەلەژیانی خۆی دا لەدەسەڵات‌و توانای خۆشی دابایە، بۆ پاراستن‌و ڕێزی بەتەنها خوا پەرستی‌و بن بڕ کردنی بڕو بیانوو بەستنی ڕێگاکانی هاوبەش دانان، هەروەها وەك نواندنی ملکەچی‌و خۆ بەکەم دانان‌و ئەدەب ڕێزێك بۆ خوای پەروەردگار،

(٢٦٨)أ ـــ رواه الطبراني.

ب ـ واتە: پەناو هانا بۆمن نابردرێت، بەڵکو ئەوەی پەناو هانای بۆ دەبرێت تەنیا خوای پەروەردگارە. وەرگێر.

وەوەك ئاگادار كردنەوەيەك بۆ ئوممەتەكەی لەهۆو هۆكارەكانی هاوبەشی دانان لەقسەو گوتەو كردەوەكاندا، ئەم خۆ پارێزیو خۆ گرتنەوە لەو كارو لەوشتانەی كەلەژيانی خۆی دا لەتواناو دەسەڵاتی خۆی دا بون قبوڵی نەبو، ئەدی چۆن لەدوای مردنی دا هاناو پەنای بۆ دەبرێت، و داوای شتانێكی لێ دەكرێت كەلەتوانای كەس دانيە جگە لەخوای گەورە[٢٦٩]. ئەوە ئەگەر بۆ پێغەمبەرﷺ دروست نەبێت، ئەوە بۆ غەيری پێغەمبەرﷺ هەر دروست نيە.

*******　　　　*******　　　　*******




[٢٦٩] فتح المجيد ص١٩٦ــ١٩٧.

## دەرگــای پێنجەم

## ڕونکردنەوەی ئەو بیروباوەڕەی کەدەبێ بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺو خاوو خێزانیو هاوەڵەکانی هەت بێت

ئەم بەشە ئەم لقانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

بەشی یەکەم: پێویستی(وجوب) خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرو بەگەورە دانانی، قەدەغە کردنی زێدە ڕەویو پی تێپەڕاندن لەپیاهەڵدانی، وخستنە ڕوی پلەو پایەکەیﷺ.

بەشی دوەم: پێویست بونی(وجوب)گوێ ڕایەڵی کردنیو شوێن کەوتنو پەیڕەو کردنی.

بەشی سێ یەم: لەشەرعیەتی سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەرﷺ.

بەشی چوارەم: لـەڕێزی ئەنـدامانی خێزانـی پێغەمبـەرﷺ، ئـەوەی پێویسـتە لەسـەر موسڵمانان بەبێ زێدە ڕەویو کەمتەرخەمیوکورت ڕەوی.

بەشی پێنجەم: لەڕێزی هاوەڵانو ئەوەی کەپێویستە لەبیروباوەڕ بون لەئاستیاندا، وەڕێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەوەی کەلەنێوانیاندا ڕوی دا.

بەشی شەشەم: لەقەدەغە کردنو حەرامی جنێو دانو سوکایەتی کردن بـەهاوەڵانو پێشەوایانی ڕێگەی ڕاست گرتو(أئمة الهدى).

## بەشی یەکەم:

## پێویستی(وجوب) خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرو بەگەورە دانانی، قەدەغە کردنی زێدە ڕەویو پێ تێپەڕاندن لە پیاهەڵدانی، وخستنە ڕوی پلەو پایەکەیﷺ.

### ١- پێویست بونی خۆشەویستنو ڕێز لێنانو بەگەورە دانانیﷺ:

یەکەمین شتێك کەلەسەر بەندەکانی خوا پێویستە: خۆشویستنی خوای گەورەیە، کەئەمە لەگەورە ترینو چڵە پۆپەو دۆندو لوتکەی جۆرەکانی خۆشەویستیە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ سورة البقرة: (١٦٥) . چونکە ئەو پەروەردگارەیانەو مافی ڕێزو سوپاسگوزاریو خۆش ویستنی بەسەر بەندەکانیەوە هەیە بەرامبەر بەو هەمو بەخشندەییو نازو نیعمەتەی کەبەسەر بەندەکانی خۆی دا ڕشتوە بەونیو بەئاشکرا، ئەمجار دوای خۆشویستنو سوپاسگوزاری خوای گەورە، پێویستە لەسەر موسڵمانان کەڕەسولی خوا محمدﷺیان خۆش بوێت، چونکە ئەو بو کەبانگەشەی موسڵمانانی بۆلای خوا کردوەو دەستی گرتونو لەزەلکاوی تاریکیو نەفامیەت دەری هێنانو ڕێگەی تەنها خوا پەرستی نیشان داونو ڕێنومایی کردون، وخوای گەورەی پێناساندون، وشەریعەتەکەی خوای بەگوێی مرۆڤەکان ڕاگەیاندوە، و حوکمەکانی ئەو شەریعەتەی ڕون کردۆتەوە، هەر خێرو چاکەیەك دەست بڕواداران کەوتبێت لەدنیاو لەقیامەتدا هەمو لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرە بو، کەس ناچێتە ناو بەهەشتەوە تەنیا بەگوێ ڕایەڵیو شوێن کەوتنو پەیڕەو کردنی ئەوﷺنەبێت، وەلەفەرمودەدا هاتوە:{ثلاث من كنَّ فيه وجد حلاوة الإيمان، أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لايحب إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه، كما يكره أن يقذف في النار}([٢٧٠]).

---

([٢٧٠]) أ- متفق عليه.

ب - واتە: سێ شت هەن هەر کەسێك ئەو سی سیفاتەی تێدا بن ئەو شیرینی ئیمانی چێشتوە، دەبێ خواو پێغەمبەری خوای لەخۆیو لەهەمو کەسێك و لەهەمو شتێکی ترخۆش تر بوێت، وەهەر کەسێکی خۆش بوێت دەبێ لەبەر خاتری خوا خۆشی بوێت، هەروەها زۆری پی ناخۆش بێت کەبۆ کوفر بگەڕێتەوە دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردوە لەدەستی هەروەکو چۆن پێ ی ناخۆشە کەبیخەنە ناو گڕی ئاگرەوە. وەرگێڕ.

خۆشەویستی پێغەمبەر لەدوای خۆشەویستی خوای بەرزو بالآ دەستەوە دێت، پێ یەوە لکاوەو لێ ی جیا نابێتەوە، ولەدوای ئەوەوە دێت لەپلەو پایەدا، سەبارەت بەخۆشەویستی پێغەمبەرﷺهاتوە کەدەبێ لەگشت خۆشەویستێك خۆشتر بوێت جگە لەخوای گەورە، هەروەکو خۆیﷺفەرمویەتی: {لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ء والده والناس أجمعين}([٢٧١]).

بەڵکو هاتوە لەسەر بڕوادار پێویستە کەدەبێ پێغەمبەریﷺلەنەفسی خۆشی خۆشتر بوێت، هەروەکو لەفەرمودەدا هاتوەکە: عمر کوڕی خەتتابرضي الله عنهبەپێغەمبەریﷺ گوتوە: ئەی ڕەسولی خوا من تۆم لەهەمو شتێك خۆشتر دەوێت تەنیا لەنەفسی خۆم نەبێت، فەرموی: {والذي نفسي بيده حتى أكون أحب إليك من نفسك}فقال له عمر: فإنك الآن أحب إليّ من نفسي، فقال: {الآن ياعمر}([٢٧٢]).

لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت کەخۆش ویستنی پێغەمبەرﷺ پێویستە(واجبة)لەسەر هەر موسڵمانێك کەخۆی بەموسڵمان دەزانێتو باوەڕی هەیەو دەبێ جگە لەخوای گەورە پێش خۆش ویستنی هەمو خۆشەویستێکی خۆی بخات، خۆش ویستنی ئەوﷺدوای خۆش ویستنی خوای گەورەیەو پێیەوە پەیوەستە، چونکە خۆشەویستیەکەولەبەر خاتری خوایەو لەپێناو ئەو دایە، ئەم خۆشەویستیە پتر دەبێت بەپتر خۆشەویستی خوا لەدڵی بڕواداردا، هەروەها بەپێچەوانەشەوە بەکەم بونی خۆشەویستی خوا کەم دەکات، هەر کەسێك خۆشەویستی خوا بێتو خوای خۆش بوێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە لەبەر خواو لەپێناو خوادا خۆشی دەوێت.

---

([٢٧١]) أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە: هەر یەکێ لەئێوە باوەڕی تەواو نابێ هەتاکو منی لەمنداڵەکانیو لەباوکو لەهەمو خەڵکی بەگشتی خۆشتر نەوێت. وەرگێڕ.

([٢٧٢]) أ ـ رواه البخاري.

ب ـ واتە: سوێندم بەوکەسەی کەگیانی منی بەدەستە باوەڕت تەواو نابێ هەتاکو منت لەنەفسی خۆشت خۆشتر نەوێت. عمر گوتی: ئەی ڕەسولی خوا ئێستا تۆم لەنەفسی خۆشم خۆشتر دەوێت، فەرموی: ئا ئێستا باوەڕت تەواوە ئەی عمر. وەرگێڕ.

دەی خۆشەویستیﷺدەخوازێت کەپێغەمبەرﷺ بەچاوی ڕێزو گەورەیی سەیری بکرێتو بڕوای پێ بکەیتو شوێنی بکەویتو پەیڕەوەی بەرنامەو شەریعەتەکەی بکەیت کەلەخواوە بۆی هێناوین، فەرمودەو قسەکانی پێش قسەو بیرو ڕای هەمو کەسێك بخەیت، هەروەها بەگەورە زانینی سوننەتەکەی.

ڕابەرو پێشەوا إبن القیم ـ رحمه الله ـ گوتویەتی:(هەمو خۆشەویستیەكو بەگەورە زانینێك بۆ ئادەمیزاد، دوای خۆشەویستیو بەگەورە دانانی خوای گەورەوە دێتو ئەو کات دروستە، وەك خۆش ویستنی پێغەمبەری خواﷺو بەگەورە زانینی، ئەمە لەتەواویەتی خۆش ویستنی نێردراوەکەی خواو بەگەورە زانینیەتی، جانومەتەکەی پێغەمبەریان خۆش دەوێت لەبەر ئەوە خوای گەورە خۆشی دەوێت، هەروەها بەگەورەی دەزانن‌و ڕێزی دەگرن چونکە خوای گەورە بەگەورەی دەزانێتو خۆشی دەوێتو ڕێزی لێ دەگرێت، دەی کەواتە ئەمە خۆشەویستیەکە بۆ خوای گەورەو لەپێناو ئەو دایەو لەپێویستیەکانی(موجبات) خۆشەویستی خوای پەروەردگارە.

نیازو مەبەست ئەوەیە کە: خوای گەورە ترس‌و سام‌و خۆش ویستنی پێغەمبەرﷺ خستۆتە دڵی خەڵکیەوەو پێ ی بەخشیوە .. بۆیە هیچ ئادەمیزادێك نیەلای ئادەمیزادێکی تر خۆشەویستر بێت، وسامدار ترو گەورە تر بێت لەسینگی دا واتە لەدڵی دا، پتر بێت لەپێغەمبەری خواﷺلەدڵی هاوەڵەکانی داﷺ، عمرو کوڕی العاص لەدوای موسڵمان بونی گوتویەتی: هیچ کەسێك نەبو بەقەد پێغەمبەرﷺرقم لێ ی ببێتەوە، بەڵام کەموسڵمان بوم، کەسێکی تر نەبو بەقەد پێغەمبەرم خۆش بوێت، نەهیچ کەسی تر گەورە ترو بەڕێز تر بێت لەچاومدا لەو بەولاوە، ئەگەر داوام لێ بکەن بۆتان باس بکەم هەرگیز لەتوانامدا نیە بۆتان باس بکەم، چونکە من لەبەر ڕێزو گەورەیی ئەو پێغەمبەرەﷺ هەرگیز چاوم لەتەماشا کردنی پڕ نابێتو لێ ی تێر نابێت.

عروة کوڕی مسعود بەقوریشیەکانی گوت: ئەی گەلۆ، سوێندم بەخوا من بەنێردرا(وفد) بۆلای کسری وقەیسەرو پاشاکان نێدراوم، هیچ کامێکیانم لەو پاشایانە نەدیوە کەدەستو پێوەندو هاوەڵەکانیان ڕێزیان لێ بگرن‌و خۆشیان بوێت بەقەد ئەو خۆشەیستیو ڕێز گرتن‌و بەگەورە دانانەی هاوەڵانی محمد بۆمحمدﷺهەیانە، وڵلاهی لەبەر

ڕێز گرتن و بەگەورەدانانی پێغەمبەرﷺ چاویشی لەبەر هەڵ ناهێنن، وا لەدەوری کۆ دەبنەوە هەتاکو تفێك ڕۆ ناکات کەدەکەوێتە لەپی دەستی یەکێك لەوان، و لەسەرو سینگی خۆی هەڵ دەسوێت لەبەر ڕێزی ئەو پێغەمبەرەﷺ، وەئەگەر دەست نوێژ هەڵ دەگرێت هاوەڵەکانی شەڕو پێشبڕکێ ی لەسەر دەکەن)... تەواو.([273]).

٢ـ قەدەغە کردنی زێدەڕەوی و پێ تێ پەڕاندن لەمەدح و پیاهەڵدانی دا:

زێدەڕەوی(الغلو): واتە: لەسنور تێ پەڕاندن، هەروەکو دەڵێ: (غلا غلواً ـ ڕۆچون یا لەسنور دەرچو) ، ئەگەر لەسنوری ئەو بڕە یاشەو سنورەی کەبۆی دانراوە، ، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ﴾ النساء:١٧١. واتە : پێتان لەسنوری ئایینی خوا تێ مەپەڕێنن.

پیاهەڵدان:(الإطراء): ڕۆچون و پێ تێ پەڕاندن لەسنور لەکاتی مەدح کردن و پیاهەڵداندا، وپڕی بکەیت لەدرۆو درۆی تێدا بکەیت، مەبەستیش لەم ڕۆچون و تی پەڕاندنە پەیوەندە بەمافی پێغەمبەرﷺ: لەکاتی مەدح کردنی ئەودا زێدە ڕەوی تێدا بکەیت وپتر لەو سنورەی کەبۆی کێشراوە، وای لێ بکەیت بگاتە سەروی پلەو پایەی بەندایەتی بۆ کردن و پەیام، و هەندێ لەپلەو پایەو جیاکاری و تایبەتمەندیەکانی خوایەتی بدەیت بە پێغەمبەرﷺ، بەوەی کەبەغەیری خوا داوای لێ بکەیت و هاناو پەنای بۆ بەریت وسوێندی پێ بخۆیت.

وەمەبەست لەڕۆچون و زێدە ڕۆیی لەمافی پێغەمبەرﷺ: واتە لەڕادەبەدەر مەدح و وەسفی بکەیت، پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی لەو کارە ناشەرعیەی قەدەغە کردوین کە فەرمویەتی:{لانطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبدالله ورسوله}([274])، واتە: بەڕاستی نەبێت مەدح و وەسفم مەکەن، بەدرۆ باس و وەسفم مەکەن، ولەمەدح کردنمدا پێ لەسنور تێ نەپەڕێنن، هەروەکو گاورەکان لەمافی عیسی ـ علیه السلام ـ تێ ی دا ڕۆچون و پێ یان لەسنور تێ پەڕاندوەو بەخوایان دەزانی و سیفەتی خوایەتیان دابوە پاڵ، ئێوە بەو شێوەیەم باس و وەسف بکەن کەخوای گەورە وەسفی

---

([273]) جلاء الإفهام ص١٢٠ـــ١٢١.

([274])أ ـــ متفق عليه.

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

منی کردوە، پێم بڵێن: بەندەی خواو پێغەمبەری خوا. وەدەربارەی ئەوەی کەهەندێ هاوەڵەکانی پێ یان گوت: تۆ گەورەی ئێمەی ( أنت سيدنا)، فەرموی: {السيد الله تبارك وتعالى}([٢٧٥])، وەکاتێ پێ یان گوت: تۆ لەهەمومان بەرێز ترو گەورە تری، فەرموی: { قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستجرينكم الشيطان([٢٧٦]).

وەخەڵکی پێ یان دەگوت: رەسولی خوا، ئەی چاکترین لەئێمە وەکوڕی چاکترین لە ئێمە، وەگەورەمان‌و کوڕی گەورە تر لەئێمە، فەرموی: {ياأيها الناس، قولوا بقولكم، ولا يستهوينكم الشيطان، أنا محمدٌ عبدالله ورسوله، ماأحب أن ترفعوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عزوجل([٢٧٧]).

پێغەمبەرﷺ پێ ی ناخۆش بوە بەم شێوە زاراوەوقسانە مەدح‌و وەسفی بکەن وەك: (أنت سيدنا ـ تۆ گەورەی ئێمەی))، أنت خيرنا ـ تۆ چاکترینی ئێمەی))،( أنت أفضلنا ـ تۆ لەهەمومان بەرێز ترمانی)،( أنــت أعظمنــا ـ تۆ لەهـەمومان گـەورە ترینمانی)، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەو باشترینی درو ستکراوەکانەو بەڕەهایی لەهەمو کەس شەریف ترو چاکتر بوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو شتانەی قەدەغە کردن‌و قەدەغەی کردوین، بۆ ئەوەی لەزێدەڕەوی‌و ڕۆچون و پێ تێ پەڕاندن لەسنوری مافەکانی خۆی جڵەو گیرمان بکات، و بۆ پاراستنی بەتەنها خوا پەرستی وەری دەچەرخاندن‌و وەرمان دەچەرخێنێ، وەئامۆژگاری دەکردن‌و ڕێنومایی دەکردن کەبەدو سیفەت باسی بکەن یاوەسفی بکەن، کەبەرزترین پلەکانی بەندەن، هیچ زێدەڕەوی‌و ڕۆچونی یان تێدا نیەو هیچ مەترسیەکی بۆ سەر بیرو باوەڕ(العقيدة) نیە، کەبریتین لە: بەندەو پێغەمبەری خوا (عبدالله ورسوله)، پێ ی خۆش نەبو بەرزتری بکەنەوە بەسەر ئەو پلەو پایەی کەخوای گەورە بۆی داناوەو پێشی ڕازیە، بەڵام زۆرێك لەموسڵمانان سەرپێچی ئەو ئامۆژگاریە بەنرخ‌و قەدەغە کردنەی

([٢٧٥]) واتە: گەورە تەنیا خوای گەورەو بەرزو بێ هاوتایە. وەرگێڕ.

([٢٧٦]) أـــ رواه أبو داود بسند جيد.

ب ـ واتە: بەقسەی خۆتان بلێن، یان بەهەندێ لەقسەی خۆتان، و ئاگاشتان لەخۆتان بێت شەیتان هەڵتان بخلەتێنێت. وەرگێڕ.

([٢٧٧]) أـــ رواه أحمد والنسائي.

ب ـ واتە: ئەی خەڵکینە، بەقسەی خۆتان بڵێن، وریا بن شەیتان لەخشتەتان نەبات، من محمدم‌و بەندەو پێغەمبەری خوام، حەزناکەم‌و پێم خۆش نیە لەوجێگەو پلەو پایەم بەرز تر بکەنەوە کەخوای گەورە بۆی داناوم. وەرگێڕ.

پێغەمبەریانﷺ کردوەو هاواری دەکەنی و داوای لیّ دەکەنو هاناو پەنای بۆ دەبەن، وسوێندی پیّ دەخۆن ، وەداوای شتێکی لیّ دەکەن کەلە توانای ئەوەدا نیە جگە لەخوای گەورەو داوا لەکەسی تر ناکرێت، هەروەکو لەئاهەنگەکانی مەولود خوێندنەوەو چامەکان(القصائد)و سرودەکاندا دەکرێنو ئەنجام دەدرێنو دەیان بینینو گوێمان لیّ دەبن، هیچ جیاوازیەك لەنێوان مافەکانی خواو لەنێوان مافەکانی پێغەمبەرداﷺ ناکەن.

ناودارو بلیمەت إبن القيم لەنونیەکەی خۆی دا دەڵێت:

لله حـــق لايـــكون لـــغيره

ولعبـــده حـــق همـــا حقـــان

لاتجعلوا الحقين حقـــاً واحداً

مـــن غـــير تمييـــز ولافـــرقـــان

٣. ڕونکردنەوەی پلەو پایەی پێغەمبەرﷺ:

مەدح کردنو باسو وەسف کردن و ڕون کردنەوەی پلەو پایەی پێغەمبەرﷺ بەو شێوەی کەخوای گەورە باسی کردوەو پیّ ی داوە هیچی تێدا نیەو دروستە، وەباس کردنی پلەو پایەکەی بەوەی کەخوا پیّ ی بەخشیوەو بیروباوەڕ وابێت، دەی ئەو ﷺپلەو پایەکی بەرزو بڵندی هەیە کەخوای گەورە پیّ ی بەخشیوەو بۆی ناردۆتە خوار، ئەو بەندەو پێغەمبەری خوایە، وەچاکترین کەسێکە لەدروستکراوەکانی خۆی، وەباشترینی دروستکراوێکە بەڕەهایی، ئەو نێردراوی خوایە بۆ هەمو گرۆهی ئادەمیزادەکان لەسەر ڕوی زەوی، وەبۆ هەمو جنۆکەو مرۆڤەکان ڕەوانە کراوە، وەباشترینو گەورە ترینی ڕەوانە کراوانە، وکۆتای پێغەمبەرانە، وهیچ پێغەمبەرێکی لەدوا نایەت، خوای گەورە سینگی شوشتۆتەوەو سافو پاکی کردوە لەگوناحو هەڵەوپەڵەو سەرپێچیەکان پاکی ڕاگرتوە، وەناوی بەرز کردۆتەوە، سەرشۆڕیو بەدبەختیو بچوكو سوکی کردوە بە یاوەر وهاوەڵو بەشی ئەو کەسەی کەسەرپێچی ئەو پێغەمبەرە دەکاتو پێچەوانەی ئەو دەبێت، ئەو پێغەمبەرە خاوەنی پلەی بەرزە(المقام المحمود) کەبریتیە لەتکا کردن واتە شیفاعەت کردن لەڕۆژی قیامەتدا، کەخوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: ﴿

عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾[٢٧٨]، واتە ئەو پلەو پایەی کەخوای گەورە بۆی ئامادەو دادەمەزرێنێت کەشیفاعەت کردنە بۆ خەڵکی لەڕۆژی قیامەتدا، بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لەتوندو تیژیو ناخۆشیەکانی ڕۆژی کۆکردنەو ئەو هەڵوێستە ناخۆشو پڕ ناسۆرە واتە لەگۆڕەپانی حەشر ڕزگاریان بکاتو دادگاییان بکات و هەر کەس بۆ شوێنی خۆی بچێت، کەئەمەش پلەو پایەیەکی تایبەتە بەپێغەمبەری ﷺ ئێمەو نادرێت بەهیچ پێغەمبەرێکی تر.

ئەو لەهەمو دروستکراوەکانی خوا پتر لەخوا دەترسا، لەهەمو کەسێکیش پتر خۆی لەخوا دەپاراست، خوای گەورە قەدەغەی کردوە کەدەنگ لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەرز بکرێتەوە، وەئەو کەسانەی کەدەنگیان لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ نرم دەکەنەوە واتە لەسەرخۆو بەنرمی لای ئەو قسە دەکەن لەبەر ڕێزی پێغەمبەر ﷺ بەباشی باسی کردونو نرخاندونی، ئەوەتە دەفەرموێ:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلاَ تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تَشْعُرُونَ۞ إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ۞ إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ۞ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[٢٧٩].

---

(٢٧٨)أ ــ سورة الإسراء: (٧٩).

ب ـ واتە: تاخوای گەورە پلەو پایەی بەرزت پێ ببەخشێتو بیگەیتێ کەبریتیە لەپلەی تاکا کردن بۆ خەڵکی لەڕۆژی قیامەتدا. وەرگێڕ.

(٢٧٩)أ ــ سورة الحجرات (٢ ــ٥).

ب ـ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە هەرگیز دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز مەکەنەوەو لەخزمەتی دا قسەی زلو پان پان بەئاشکراو بەرز مەکەن هەروەکو چۆن لەنێوان خۆتانداو هەندێکتان لەگەڵ هێندێکی تردا بەرزی دەکەنەوەو قسە دەکەنو دەنگتان بەسەر دەنگی ئەودا هەڵ مەبڕنو زۆر بەڕێزەوە قسەی لەگەڵ دا بکەن، نەوەکا کردەوەکانتان ڕەش ببێتەوەو ئێوە هەستیش بەخۆتان نەکەن، دیارە گومانی تێدا نیە ئەو کەسانەی کەلای پێغەمبەر ﷺ دەنگیان نرم دەکەنەوەو بەهێواشیو بەڕێزەوە لەگەڵی دا دەدوێن ئەو کەسانەی بەڕاستی خوای گەورە دڵی تاقی کردونەوەو پاکی کردونەوەو لەلایەن خواوە لێ خۆش بونو پاداشتێکی باشو زۆریان هەیە، بێگومان ئەو کەسانەی لەدوای هۆدەکانی ماڵەتەکەوە بەدەنگی بەرزو بێ ڕێزەوە بانگت لێ دەکەن زۆربەیان کەم هۆشو نەفامو تێنەگەیشتون. .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بو کەهۆزی (تمیم) لەساڵی نۆیەمی کۆچی دا هاتنە شاری مەدینە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەی خۆی دا پاڵی دابوەوەو ڕاکشا بو، هەر لەدەرەوە بەدەنگی بەرز هاواریان کردو گوتیان: ئەی

ئیمامی إبن كثير ـ رحمه الله ـ گوتویەتی:(بەم ئایاتە پیرۆزانە خوای گەورە بەندە بڕوادارەکانی خۆی پەروەردەو ئامۆژگاری دەکات کەزۆر بەسەنگینیو لەسەرخۆو هێمنی وبەڕێزەوە هەڵسو کەوت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، ولەسەرخۆو دەنگ بەرز مەکەنەوە لەبەر دو دەستی پێغەمبەردا ﷺ و دەنگتان بەسەر دەنگی ئەودا هەڵ مەبڕن).

هەروەها خوای پاكو بێگەرد بەرز قەدەغەی کردوە کەبانگی نێدراوی خوا بەناوی خۆیەوە بانگ نەکەن هەروەك چۆن خەڵکی بانگی یەکتری دەکەن، ویلێن: هۆ محمد، بەڵکو بەسیفاتی پەیامبەرو بەناوی پێغەمبەری خواو بەم جۆرە سیفاتانە بانگی بکەنو بیلێن: ئەی نێدراوی خوا، یاخود بەئەی پێغەمبەری خوا بانگی بکەنو لەگەڵی دا بدوێن، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿لاَ تَجْعَلُوا دُعَاء الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاء بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾(٢٨٠).

هەروەکو خوای گەورەو پاكو بێگەرد خۆی بە﴿ يأيها النبي ـ ئەی پێغەمبەری خوا يأيها الرسول ـ ئەی نێردراوی خوا﴾ بانگی دەکات، خوای گەورەو فریشتەکانیشی داوای ڕەحمەتو سۆزو بەزەیی خوای بۆ دەکەن، هەروەها داوای لەبەندەکانیشی کردوە کوداوای ڕەحمەتو بەزیەو سەلامەتی لەلایەن خواوە بۆ بکەن ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾(٢٨١).

بەڵام دەبی ئەمەش بزانین کەکاتو چۆنیەتی مەدح کردنی ﷺ تایبەتو دەست نیشان نەکراوە تەنیا بەبەڵگەی ڕاستو دروست لەقورئانو سوننەت نەبێت، لەوەی کەهاوەڵانی

---

محمد وەرە دەرەوە. ئەوانە دەوار نشینو کەم هۆشو نەفام بون بەم جۆرە بانگیان لەپێغەمبەری ﷺ خوا کرد. ئەمجار خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ئەوانە تۆزی ڕێزیان هەبایەو ئارامیان بگرتایە تادەچویتە دەرو قسەت لەگەڵدا دەکردن باشتر بو، دەی باداوای لێ خۆش بون لەخوا بکەن چونکە خوای گەورە لێ بوردەو بەبەزەییو بەخشندەیی فراوانە بەڵکو لێیان خۆش ببێتوبیان بورێت. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٣٥١-١٣٥٢.

(٢٨٠)أ ـ سورة النــور: (٦٣).

ب ـ واتە: نەکەن بانگ لەپێغەمبەر ﷺ بەوشێوە بکەن کەلەنێوان خۆتاندا بانگی یەکتری دەکەن بەڵکو زۆر بەڕێزو بەسەنگینیو بەهێمنیو لەسەرخۆ بانگی بکەن. وەرگێڕ.

(٢٨١)أـ سورة الأحزاب: (٥٦).

ب ـ واتە: خوای گەورەو فریشتەکان سڵاوات لەسەر محمد ﷺ لێ دەدەنو داوای ڕەحمەتو بەزەیی خوای بۆ دەکەن، دەی ئێوەش ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدەنو داوای بەزەییو ڕەحمەتو بەرەکەتی خوای بۆ بکەن. و زۆر سەلامی لێ بکەنو ڕەحمەتی خوای بۆ داوا بکەن.وەرگێڕ..

مەولود خوێندنەوە کەڕۆژێکیان تایبەت کردوەو دەڵێن گوایە ئەو ڕۆژە ڕۆژی لەدایك بونیەتیو ئاهەنگی تیادا دەگێڕنو وەسفو مەدحی پێغەمبەری تێدا دەکەن، کەئەوە داهێنانو تازەگەریەتی بێزراوو ناشیرینو قێزەونە.

وەلەبەگەورە زانینی ئەو پێغەمبەرەﷺ وڕێز لێنانی بەگەورە زانینو ڕێز گرتنو پەیڕەو کردنی سوننەتەکەیەتی، بیروباوەڕی وابێت کەشوێن کەوتنو پەیڕەو کردنو کار پێ کردنی واجبە، و بیرباوەڕ وابێت کەبەپلەی دوەم دێت لەدوای قورئانی پیرۆز و لەواجب بونی بەگەورە زانینو ڕێز لێنانو کار پێ کردنی، چونکە ئەوەش وەحیەکەو لەلایەن خواوە هاتۆتە خوار، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى۞ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾(٤) سورة النجم (٣ — ٤).

بەهیچ شێوەیەك نابێ لەوەدا گومان هەبێت، و لەپلەو پایەی کەم بکرێتەوە، یاقسە کردن تیایدا بەڕاست کردنەوە یا بەلاواوو بێ هێز کردنی ڕێگاکانیو پاڵ پشتەکانی(أسانيدها) یا ڕاڤە کردنو لێك دانەوەی واتاکانی تەنیا بەزانستیو خۆپارێزیەوە، لەسەردەمی خۆماندا دەم درێژیو ناماقوڵی زۆر دەکرێت بەرامبەر بەسوننەتی پێغەمبەرﷺبەتایبەتیش لەلایەن هەندێ لەگەنجە هەرزەکارە تازە پێگەیشتوەکان، کەهێشتا لەتافو قۆناغەکانی سەرەتایی فێر بونو زانیاری وەرگرتندان، کەدەستیان کردوە گوایە بەڕاست کردنەوەو بێ هێز کردنی فەرمودەکانی، وەبەبێ زانستی جگە لە خوێندنەوەی چەند کتێبێك تیرو توانج لەڕیوایەتکاران دەگرن، دیارە ئەمە مەترسیەکی گەورەی هەیە لەسەر ئەوانو لەسەر ئوممەتی ئیسلامی، بۆیە ئەوانە پێویستە لەسەریان کەخۆ لەخوا بپارێزن، و لەسنوری دا بوەستنو قاچ تێ نەپەڕێنن.

******* ******* *******



## بەشـی دووەم:

## پێویست بونی(وجوب)گوێ ڕایەڵی کردنیﷺو شوێن کەوتنو پەیڕەو کردنی.

گوێ ڕایەڵی کردنی پێغەمبەرﷺواجبە بە کردنو جێ بەجێ کردنـی ئـەوەی کـەفرمانی پێ کردوین کەئەنجامیان بدەین، وەکشانەوە لەو کارانەی کەقەدەغەمان دەکات کەلێ یان دور بکەوینــەوە؛ ئەمـەش یەکێکـە لەداواکاریـەکانی شـایەتمانی (محمــدﷺ نێـردراوو پێغەمبەری خوایە(أشهد أن محمد رسول الله)، بەدڵنیاییەوە خـوای گـەورە فرمـانی کـردوە بەگوێ ڕایەڵی کردنی ئەو پێغەمبەرەﷺ لەزۆرێك لەئایەتە پیرۆزەکانی خـۆی دا ئامـاژەی پێ کردوە، وەهەندێ جاریش بـەگوێ ڕایـەڵی خـواوە لکێنـراوە، هـەروەکو لەفەرمایشـتی خۆی دا هاتوە:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ ﴾ ســورة النســاء: (٥٩). ئەمەو چەندان وێنەی تر لەئایەتەکاندا، وەهەندێ جاریش بەتەنیا فەرمانی بەگوێ ڕایـەڵی پێغەمبەرﷺکردوە، هەروەکو دەفـەرموێت:﴿ مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّــهَ ﴾ ســورة النساء: (٨٠). (واتە: هەر کەسـێك گـوێ ڕایـەڵی پێغەمبـەرﷺ بکـات ئـەوە گـوی ڕایـەڵی خوای کردوە. وەرگێڕ). وەهەروەها دەفـەموێت:﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَــاةَ وَأَطِيعُــوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾[٢٨٢].

وەجارێکی تر هەڕەشە لەو کەسە دەکرێت کەسەرپێچی ڕەسولی خواﷺبکات سزا دەدرێت، هەروەکو خوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[٢٨٣]. واتە: توشی فیتنەیان بکاتو ئاشوبیان بخاتە دڵـەوە وەکـو کوفرو دوڕوییو داهێنانو تازەگەری(بدعة)، یاخود ئازارێکی توندو بەسفتو سوێ یان بدات لەدنیادا، بەکوشـتن

---

[٢٨٢] أ ــ سورة النــــور: (٥٦).

ب ـ واتە: نوێژەکانتان بکەنو زەکاتی ماڵتان بدەنوگوێ ڕایەڵی پێغەمبەرﷺبکەن بەڵکو خوای گەورە بەزەیی پێتان دا بێتەوەو لێتان خۆش ببێتو بتان بورێت. وەرگێڕ.

[٢٨٣] أ ــ سورة النـــور: (٦٣).

ب ـ واتە: بائەو کەسانەی کەسەرپێچی پێغەمبەرﷺدەکەن ئاگادار بن کەهەر لەدنیادا توشی فیتنەو سەرلێشێواویان بکان وەك کوفرو دوڕویی و ناخۆشیو تەنگو چەڵەمەی یان بکاتو لەڕۆژی قیامەتیشدا ئازارو ئەشکەنجەیەکی بەسفتو سویان توش بکات. وەرگێڕ.

پابەبەند کردن‌و دیلیەتی‌و سنور لێدان(حد)، یاهەر شتێکی تری لەم جۆرە سزایانە هەر لەدنیادا وێڕای سزای قیامەتیش.

هەروەها خوای گەورە خۆشەویستی‌و گوێ ڕایەڵی پێغەمبەری کردۆتە هۆکارێك بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوا بۆ بەندەکانی‌ولێ خۆش بون لەگوناحەکانیان. ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾([284]). هەروەها گوێ ڕایەڵی کردنی پێغەمبەرﷺڕێگای هیدایەتەودۆزینەوەی ڕێگەی ڕاستەو سەرپێچی کردنی سەر لێشێواوی‌و گومڕایی‌و ڕێگە لێ ون بونە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ﴾ سورة النور: (٥٤). (واتە: ئەگەر گوێ ڕایەڵی پێغەمبەرﷺ بکەن ڕێگەی ڕاستتان دۆزیوەتەوەو ڕێنومایتان وەرگرتوە. وەرگێڕ). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾([285]).وەخوای گەورە هەواڵی پێداوین کەئەو پێغەمبەرەﷺ پێشەنگیەتی باش‌و پڕ خێرو بەرەکەتی بۆ ئوممەتەکەی هێناوەو پێشەنگێکی چاك‌و پڕ بەرەکەتە بۆ ئوممەتی ئیسلامی کەشوێنی بکەون، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾([286]).

---

([284])أ ــ سورة آل عمران: (٣١).

ب ـ واتە: ئەی محمدﷺ پێ یان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن کەخواتان خۆش دەوێت شوێن من بکەون‌و گوێ ڕایەڵیم بکەن، خوا خۆشی دەون‌و لەگوناحەکانتان خۆش دەبێت . وەرگێڕ.

([285])أــ سورة القصص: (٥٠).

ب ـ واتە: ئەگەر ئەو بێباوەڕو خوانەناسانە وەڵامی داواو بانگەشەکەی تۆیان نەدایەوە ئەوە بزانە ئەوانە هەر لەسەر بێباوەڕی‌و ملهوڕی‌و خوا نەناسی خۆیان بەردەوامن‌و وازی لێ نامێنن‌و بەڵکو ئەوانە شوێن هەواوو ئارەزوەکانی خۆیان کەوتون، جاتوخوا کێ لەو کەسە گومڕا ترو سەرلێشێواترو ملهوڕ ترە کەدوای هەواوئارەزوە بۆگەنەکانی خۆیان دەکەون‌و لەسەر غەیری ڕێنومایی‌و هیدایەتی خوا دەڕۆن‌و ڕێگەی کوفری شەیتانیان گرتۆتە بەر، بەدڵنیاییەوەو هیچ گومانی تێدا نیە کەخوای گەورە هەرگیز یارمەتی‌و دەست گیرۆیی ستەمکاران‌و بێباوەڕان‌و مولحیدان‌و ملهوڕان نادات. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گولشەن ب٢ل١٠٠٤.

([286])أــ سورة الأحزاب: (٢١).

ب ـ واتە: ئەی بڕواداران بەڕاستی پێغەمبەری خوا بۆ ئێوە پێشەنگی چاکە لەخۆڕاگری‌و ئارامگرتن‌و وەستان لەبەر دەم کافران‌و بێباوەڕادا دەی ئێوەش چاو لەو بکەن‌و شوێنی بکەون‌و گشت فەرمانەکانی جێ بەجی بکەن‌و گوێ ڕایەڵی بکەن ئەگەر داوای بەخشندەیی‌و بەزەیی‌و لێ خۆش بونی خواتان دەوێت و ئارەزوتان لەژیانی خۆشگوزەرانی ناو بەهەشتە، هەروەها زۆر یادی خوا بکەن‌و ناوی هەمیشە بێنن‌و باهەم دەم زمانتان بەویردویادی خواوە تەڕو پاراو بێت،

إبن كثير ـ رحمه الله ـ گوتويەتی:(ئەم ئايەتە پيرۆز بنەڕەتێكەلەچاو كردن لەپێغەمبەر ﷺ لەگفتاروقسەكانیو لەكردەوەكانیو لەباروگوزەرانەكانی دا، هەر لەبەر ئەمە بو كەخوای گەورە فرمانی بەخەڵكی كردوە كەچاو لەپێغەمبەر ﷺ بكەنو بيكەن بەپێشەنگی خۆيان وەك ئەوەی كەلەڕۆژی (الأحزاب) نواندی لەخۆڕاگریو ئارامو لەخۆ بوردەيیو بەردەوامی، خۆئامادە كردنو تێكۆشانو هەوڵی نەپساوەی، لەچاوەڕوانیو بەئومێدی هاتنی سەركەوتن لەلايەن پەروەردگاری خۆيەوە ـ عز وجل ـ صەلاتو سەلامی هەميشەيی خوای لێ بێت، تاڕۆژی قيامەت).

خوای گەورە لەچل شوێندا باسی گوێ ڕايەڵی خۆیو شوێن كەوتنی كردوە لەقورئانی پيرۆزدا، نەفسەكان پێويستيان بەزانينو شارەزا بونی ئەو بەرنامەو شوێن كەوتنی پێغەمبەرە ﷺ پتر لەخواردنو خواردنەوە هەيە، خواردنو خواردنەوە ئەگەر نەمانو لەدەست چون ئەو پەڕی دەبێتە هۆی مردن لەدنيادا، بەڵام ئەگەر گوێ ڕايەڵیو شوێن كەوتنو پەيڕەوی پێغەمبەر ﷺ لەكيس چون ئەوا توشی سزاو بەدبەختیو چارە ڕەشی هەميشەيی دەبيت، پێغەمبەر ﷺ فرمانی كردوە كەشوێن ئەو بكەونو وەك ئەو بكەن لەئەنجامدانی بەندايەتيەكانو خوا پەرستی دا، وەك چۆن ئەو ئەنجامی داون ئێوەش بەهەمان شێوە ئەنجاميان بدەن، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ سورة الأحزاب: (٢١). هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی:{صلوا كما رأيتموني أصلي} [٢٨٧]، هەروەها فەرمويەتی:{خذوا عني مناسككم}[٢٨٨].. هەروەها فەرمويەتی:{من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌ}[٢٨٩]. هەروەها فەرمويەتی:{من رغب عن سنتي فليس مني } [٢٩٠] .ئەمەو چەندان دەقو بەڵگە گەلێكی تر لەم بوارەوە هەن، كەتيايانـدا فرمان بەشوێن كەوتنو گوێ ڕايەڵی وپەيڕەو كردنی پێغەمبەر ﷺ كراوە، هەروەها كشانەوە لەوكارو كردەوەو گفتارو قسانەی كەقەدەغەی كردون و قەدەغەی كردوە كەسەر پێچی فرمانەكانی بكرێت

---

چونكە بەمە هەميشە دڵتان بەخوای گەورەوە پەيوەست دەبێتو دڵەكانتان زيندو دەبێت نەك مردو. وەرگێڕ لەتەفسيری گوڵشەن ب٢ل١٠٨١ـ١٠٨٢.

([٢٨٧])الحديث رواه البخاري.

ب ـ واتە: من چۆن نوێژ دەكەم ئێوەش ئاوا نوێژەكانتان بكەن. وەرگێڕ.

([٢٨٨])الحديث رواه مسلم.

ب ـ واتە: شێوەی كردنی بەندايەتيەكانتان لەمن وەر بگرنو چاو لەمن بكەن. وەرگێڕ.

([٢٨٩]) أ ـ الحديث رواه مسلم.

ب ـ واتە: هەر كەسێك كارێك بكاتو ئێمە فەرمانمان لەسەر نەبێت و ئێمە نەمان كرد بێت ئەو دای بتاشێتو ئەنجامی بدات ئەوە بەسەر چاوی خۆی دادەدرێتەوە. وەرگێڕ.

([٢٩٠])أـ متفق عليه.

ب ـ واتە: هەر كەسێك پشت لەسوننەتی من بكاتو پەيڕەوی نەكات ئەوە لەمن نيە، واتە: موسڵمان نيە. وەرگێڕ.

## بەشــی سێ یەم

## لەشەرعیەتی صڵاوات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەرﷺ

لەمافەکانی پێغەمبەرﷺ کەخوای گەورە بۆی دارشتوە(شرع)ولەسەر ئوممەتەکەی پێویست کردوە کەصڵاوات و سەلامی لەسەر لێ بدەن، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ سورة الأحزاب: (٥٦).

وەك لەلێك دانەوەی (صلاة الله) هاتوە بریتیە لە: باس و کردن و مەدح کردنی پێغەمبەرﷺ لای فریشتەکان لەلایەن خوای گەورەوە، وصڵاواتی فریستەش بریتیە لە: دوعا بۆ کردن، وصڵاواتی ئادەمیزادەکانیش بۆ پێغەمبەرﷺ بریتیە لەداوا کردنی لێ خۆش بون و رژانی خێرو بەرەکەت لەلایەن خوای گەورەوە([291]). خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بەپلەو پایەی بەندەو پێغەمبەرەکەی خۆی کردوە لەجیهانی بەرزدا(الملأ الأعلى)، بەوەی کەلەلای فریشتە نزیکەکان باسی پلەوپایەو بەرزیەتی پێغەمبەر دەکات و پیای هەڵ دەڵێت، وەفریشتەکانیش ڎاوای بارینی رەحمەت و بەزەیی خوای بۆ دەکەن واتەصڵاواتی لەسەر لێ دەدەن، هەروەها خوای گەورە فرمان بەجیهانی خوارەوە(العالم السفلي) واتە مەردوم دەکات کەصلاوات و سەلامی لەسەر لێ بدەن و داوای پلەی بەرزو رەحمەتی خوای بۆ بکەن.

وەواتای﴿وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾: سەلامی لێ بکەن بەو شێوە سەلامەی کەلەشەریعەتی ئیسلامدا دارێژراوە، وەهەر کاتێك صلات لەسەر پێغەمبەرﷺدرا پێویستە صلات و سەلام بەیەکەوە کۆ بکرێنەوە واتە بڵێ: (الصلاة والسلام) لەسەر پێغەمبەرﷺ، با هەر لە یەکێکیاندا کورت هەڵ نەیەت و بەس بگوترێ:(صلى الله عليه)، یاباتەنیا نەگوترێ:(عليه السلام)، چونکە خوای گەورە فرمانی کردوە هەردوکیان بەیەکەوە کۆ بکرێنەوەو بگوترێن هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێ کرد.

صڵاوات لەسەر پێغەمبەرﷺو گوتنی لەچەند شوێنێکدا دانراوەو پێشی لەسەر داگیراوە کەدەبێ لەو شوێنانەدا ئەنجام بدرێت، جا یان بەواجبێتی یا بەسوننەتێکی جەخت لەسەر کراوە(إستحباباً مؤكدة) ، إبن القيم ـ رحمه الله ـ لەکتێبەکەی خۆی دا( جلاء الأفهام) ئاماژەی پێ کردوە کەلەچڵ و یەك شوێندا هاتەوە بەم شێوەیە دەستی پی

([291]) البخاري لە( أبي العلية )وە ئاماژەی پی کردوە.

کردوە: ( شوێنی یەکەم:ـ کەئەمەیان لەهەموان گرنگترەو لەهەموان جەخت لەسەر کراو ترە ـ ئەویش لەناو نوێژداو لەکۆتایی تەشەهودە واتە تەحیات، موسڵمانان لەسەر شەرعیەتی ئەم شوێنە کۆڕانو لەسەر واجب بونی جیاڕان)([٢٩٢]). هەروەها لەشوێنێکی تر باسی کردوە: کەلەکۆتای قەنوتدا دەخوێنرێت، هەروەها لەوتارەکاندا وەك وتاری ڕۆژی هەینی، و لەهەردو جەژنەکانو لەنوێژە بارانەدا(الإستسقاء)، لەدوای وەڵامدانەوەی بانگدەر، وە لە کاتی دوعا کردندا،و چونە ناو مزگەوتو دەرچون لێ ی، وەلەکاتی ناو هێنانیﷺدا، هەروەها إبن القيم ـ رحمه الله ـ ئامازەی بەو بەرهەمو بەرو بومەو دەست کەوتەکانی کەلە صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرﷺدەست دەکەوێت کردوە، ودەڵێ چل بەرهەمو سودی هەیە ([٢٩٣]). لەوانە ئامازەی بەمانەی خوارەوە کردوە:

وەڵامدانەوەو جێ بەجێ کردنی فرمانەکانی خوا لەم بوارەدا.

- دەست کەوتنی دەصەڵاوات لەلایەن خواوە بۆ ئەو کەسەی یەك جار صەڵاوات لەسەر پێغەمبەرﷺ لێ دەدات.
- ئومێدی دوعا قبوڵ بون ئەگەر لەپێش دوعاکە صەڵاواتەکە لێ بدەیت([٢٩٤]).
- هۆکارە بۆ بەدەست هێنانی تکای پێغەمبەرﷺئەگەر بلکێنرێت بەداوا کردنی هۆکار (الوسيلة) بۆیﷺ.
- صەڵاوات لێدان دەبێتە هۆی لێ خۆش بونو بوردن لەگوناحەکان.
- هۆکارێکە بۆ وەڵامدانەوە(لرد)ی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەو کەسەی صەڵاوات یان سەلامی بۆ دەنێرێت.

فصلوات الله وسلامه على هذا النبي الكريم.

****** ******* *******

([٢٩٢]) جلاء الأفهام ص٢٢٢ــ٢٢٣.

([٢٩٣])سەرچاوەی ڕابردو ٣٠٢.

([٢٩٤]) یەکێ لەمەرجەکانی دوعا قبوڵ بون ئەوەیە کەپێش ئەوەی دوعاکان دەست پی بکەیت سوپاسو ستایشی خوا بکەیتو صەلاتو سەلام لەسەر پێغەمبەرﷺلێ بدەیتو ئەمجار دەست بە دوعاکان بکەیت. یەکێك لەم ویردانە ئەوەیە(الحمد لله فاطر السموات والأرض رب كلّ شيء و ملكه، والصلاة والسلام على رسول الله وأصحابه وأزواجه وذرياته ومن ولاه إلى يوم الدين) . وەرگێر.

## بەشــی چوارەم

### لەشکۆمەندی ئەندامانی بنەماڵەی پێغەمبەرﷺ، ئەوەی پێویستە لەسەر موسڵمانان بەبێ زێدە ڕەوی وکورت ڕەوی.

بنەماڵــە ئەوانــەن کــەبریتین لەئەنــدامان و خــاوو خێــزان و خــزم و کــەس و کــاری پێغەمبەرﷺکەخێرو سەدەقەیان لەسەر حەرامە، وبریتن لەخزمان وکەس و کاری علــي، خزمان وکەس و کاری جعفر، و خزمان وکەس و کاری عباس، و خزمان وکەس و کاری عقيل،و کوڕانی الحارث بــن عبــدالمطلب، وەخێزانــەکانی پێغەمبــەرﷺوکچەکانی، بــەگوێرەی فەرمایشتی خوای بەرزو بێ هاوتــا:﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الـرِّجْسَ أَهْــلَ الْبَيْــتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾([295]).

ئیمامی إبن كثير- رحمه الله - گوتویەتی:(هەروەها ئەوەی کەهیچ گومانی تێدا نیە لــەتێڕامان و ورد بونەوەو توێژینەوە لەقورئانی پیرۆز، کەخێزانەکانی پێغەمبەرﷺنــەو فەرمایشــتەی خــوای گەورە دەیان گرێتــەوە کەدەفــەرموێ:﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الـرِّجْسَ أَهْــلَ الْبَيْــتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾.

ڕەوتی گفتار لەگەڵ خێزانەکانی پێغەمبەرﷺدایە، لەبەر ئەوە دوای ئەمە هەموی خوای گەورە دەفــەرموێ:﴿ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًــا خَبِيرًا﴾([296]). واتــە: ئەی خێزنەکانی پێغەمبــەرﷺلەماڵەکانی خۆتانــدا هــەوڵی فێـر بـون و وەرگرتن و وردبونەوەو تێڕامان لەوئایەتە پیرۆزو پڕ واتاو حیکمەت و ژیریە بدەن کەخوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ ناردۆتە خوار ، لەقورئان و لەسوننەتدا هــەوڵی بۆ بــدەن و بیانهێننەوە یادی خۆتان و لەبەریان بکەن بۆ ئــەوەی ڕێگــەی ژیانی دنیــاو قیامــەتتان بــۆ ڕۆشن بکاتەوە. ئەمە قەتادەو کەسانی تر هێناویانەو ئاماژەیان پی داوە.

---

([295])أ ـ سورة الأحزاب: (٣٣).

ب ـ واتــە: ئــەی خێزانــەکانی پێغەمبــەرﷺبەڕاسـتی خـودا دەیــەوێت ئێـوە لەگشـت عـەیب و عارێـك و خراپەیــەك پارێزێت وولەهەمو کەم و کورتیەك و ئەنگیەك دورتان بخاتەوە. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل١٠٨٧.

([296])أـ سورة الأحزاب: (٣٤).

هەروەها ئەو نازو نیعمەتە بهێننەوە یادی خۆتان ئەی خێزانەکانی پێغەمبەرﷺکەلەناو هەمو خەڵکی خوای گەورە بە ئێوەی بەخشیوەو بۆ ئێوەی تایبەت کردوە: کەسروش(الوحي) لەناو سەرتاپای خەڵکی دا لەماڵەکانی ئێوەدا دادەبەزی، وەعائشە راستگۆی کچی راستگۆ أبوبکر - رضي الله عنها - لەهەموان لەپێش تر بو لەو نازو نیعمەتە خواییە، وەتایبەتی تریان بو لەورەحمەتو نیعمەتە گشتگیریە، ئەوە بو سروش هیچ جارێك دانەدەبەزیە سەر پێغەمبەرﷺ لەسەر فەرشی هیچ ژنێکیان جگە لەهی عائشە نەبێت، هەروەکو لە پێغەمبەرەوە ﷺدەق لەسەر ئەم راستیە هاتوە، هەندێ لەزانایانیش ئاماژەیان پێ کردوەو هێناویانەو نوسیویانە: پێغەمبەرﷺ هیچ کامێك لەخێزانەکانی کچ نەبون جگە لەعائشە، و هیچ پیاوێکی لەگەڵ دا نەخەوتوە جگە لە پێغەمبەرﷺ (دەیویست هاوسەگیریەتی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکات جگە لەپێغەمبەرﷺ) گونجاوو شایستە بو کەتایبەت بکرێت بەو پلەو پایە پرشنگدارە، ئەو شکۆداریە بەرزە بەتەنیا بۆ ئەو بێت، بەڵام ئەگەر خێزانەکانی لەکەس‌و کارو بنەماڵەی پێغەمبەرﷺبن، خزمایەتی‌و نزیکایەتی هەق ترو شایستە ترە بەم ناو نانەوە(التسمية)) ... ئەوەی لەتەفسیری إبن کثیر وەرگیراوە تەواو بو.

ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت ئەهلی بەیتی پێغەمبەریﷺخوایان خۆش دەوێت‌و سات‌و کاتێك لایەنگیری‌و خۆشەویستیان بۆ هەیە،و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەرﷺدەربارەی ئەهلی بەیت دەپارێزن‌و گوێ رایەڵی دەکەن، کاتی لەرۆژی(غدير خم - ناوی شوێنێکە) دا فەرمو بوی: {أذكركم الله في أهلي بيتي}([٢٩٧]).

ئەهلی سوننەت خۆشیان دەون‌و رێزیان دەگرن، چونکە ئەوە بەشێکە لەخۆشەویستی‌و رێز گرتنی پێغەمبەرﷺ ئەمەش بەمەرجێك: کەشوێن کەوتەی سوننەت بن‌و لەپەیرەوکارانی سوننەت بن‌و لەسەر ئاین بەردەوام بن‌و لەقورئان‌و لەسوننەت لانەدەن، وەك پێشینەی خۆیان وەك عباس‌و کوران‌و کچانی‌و، علی وکوران‌و نەوەکانیان، بەلام ئەوانەی پێچەوانەو دژایەتی سوننەت بکەن،و لەسەر ئاین راست نەرۆن‌و بەرنامەی

---

([٢٩٧]) رواه مسلم.

قورئان‌و سوننەت نەگرن‌و لایاندا بێت ئەوانە دروست نیە خۆشت بون‌و دۆستایەتیان بکەیت موالاتت بۆیان هەبێت هەتاکو ئەگەر لەئەهلی بەیتیش بن.

دەی هەڵویستی سوننەت‌و جەماعەت لەئەهلی بەیت هەڵوێستێکی مام ناوەندو بەدادپەروەری‌و ویژدانیە، ئەوانەیان خۆش دەوێت‌و پشتگیری ئەوانەیان دەکەن کەبەڕاستی ئەهلی ئایین بن‌و بەردەوام‌و پێ دامەزراو بن‌و لانەدەن، وەئەستۆ پاک‌و بێ بەرین لەوانەیان کەپێچەوانەی سوننەتن‌و لەئاییینی خوا لایان داوە‌و سەر لێشێواو بون، هەر چەندە لەئەندامان‌و بنەماڵەی پێغەمبەریشﷺبن، تەنیا بەوەی کەلەبنەماڵەو خزمان‌و ڕەچەڵەکی پێغەمبەرن سودیان پێ ناگەیەنێت‌و ڕزگاریان نابێت‌و ئیدی پالی لێ بدەنەوە هەتاکو لەسەر ئاییینی خوا بەردەوام نەبن‌و دەست بەبەرنامەو شەریعەتی خواوە نەگرن، لەأبو هريرة وەﷺهاتوە کەگوتویەتی: کاتێ پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوار کەدەفەرموێت:﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ سورة الشعراء: (٢١٤). هەستاو فەرموی: {يامعشر قريش ــ أو كلمة نحوها ــ إشتروا أنفسكم، لاأغني عنكم من الله شيئاً، ياعباس ابن عبدالمطلب لاأغني عنك من الله شيئاً، ياصفية عمة رسول اللهﷺ، لاأغني عنك من الله شيئاً، ويافاطمة بنت محمد، سليني من مالي ماشئت، لاأغني عنك من الله شيئاً} (٢٩٨).

هەروەها فەرمودەی: {من بطأ عمله لم يسرع به نسبه}(٢٩٩).

وەئەهلی سوننەت‌و جەماعەت ئەستۆپاک‌و بێ بەرین لەڕێگەو ڕێبازی ڕافزیە شیعیەکان، ئەوانەی زێدە ڕەویان کردوە لەبەرامبەر هەندێ لەئەندامان‌و بنەماڵەی پێغەمبەرﷺو پروپاگەندەی پارێزراوی‌و بێ گوناحیان(العصمة) بۆ دەکەن، وەهەروەها لەڕێگەو ڕێبازی(النواصب - ئاژاوەگێران)، ئەوانەی کەهەمیشە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەهلی بەیت‌و موسڵمانانی ڕاستڕەو لەسەر ئاییینی خوا واتە قورئان‌و سوننەت دەکەن‌و ئاژاوەو

---

(٢٩٨) أ ــ رواه البخاري.

ب ـ واتاکەیمان لەبەشەکانی ڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

(٢٩٩) أ ــ رواه مسلم.

ب ـ هەر کەسێك کردەوەکانی خراپ بون‌و لەسنوری خوا تێ پەڕیوە، وڕێگەی شەیتانی هەڵ بژاردوە، بنە ماڵەو ڕەچەڵەك هیچ دابی نادات با لەئەهلی بەیتی پێغەمبەریشﷺبێت. وەرگێڕ.

ئاژاوەگێڕی دەنێننەوەو پەرەی پێ دەدەن([300])، تیرو توانجو تانو تەشەرەیان لێ دەدەن، هەروەها لەڕێگەو ڕێبازی داهێنەرانو تازەگەران (المبتدعــة) و ئەفسانەگەرایان (الخرافيين)، بیروباوەڕ پوچەڵان کەلەبەر ئەهلی بەیت دەپارێنەوەو داوایان لێ دەکەنو هاناو پەنایان بۆ دەبەن،و دەیان کەن بەپەروەردگارانی خۆیان جگە لەخوای گەورە.

ئەهلی سوننەت لەم بەش ولەم دەرگایەو لەشوێنی تریش دا لەسەر مەنهەجو بەرنامەی مام ناوەند(المعتدل)و ڕێگای ڕاستن کەنەزێدەڕەویو نەکورت ڕەوی هەڵ دەگرێت، و دور لەدڵڕەقیو زێدە ڕەوی لەبەرامبەر ئەهلی بەیتو غەیری ئەوانیشدا، ئەهلی بەیتی ڕاستو موسڵمانو پابەند بەقورئانو سوننەتەوە زێدە ڕەوی لەمافیاندا واتە بەرامبەری ئەواندا قبوڵ ناکەنو ڕقیان لێ یەتی، و لەو زێدە ڕەوو ستەمکارانە بێ بەریو ئەستۆپاکن، ئەوەتە ئەمیری بڕواداران علي کوڕی أبي طالب ﷺ ئەو زێدە ڕەوانەی لەئاگردا سوتاندن لەلەبەرمبەر ئیمامی علی دا زێدەڕەیان کردوەو لەپلەو پایەو تواناو دەسەڵاتی خۆی پتریان پێ ڕەوا بینیوە، وەإبن عباس بڕیاری کوشتنی دابون ، ئەو وادەبینێ کەبەشیر بکوژرێن لەبری سوتاندنیان، وەعلی ـ رضي الله عنهما ـ داوای عبدالله کوڕی سبأ سەری هەمو زێدەڕەوانو ستەمکارانو دوڕوان کردو بەدوای دا گەڕان بەڵام ئەو ڕای کردو خۆی شاردەوە.

******* ******* *******

---

([300]) کورد گوتەنی: ( ئاگری بن کایەن)یان (گێرە شێوێنن) یاخود (زەرو ئاسان لەزەلکاودا نەبێ ناتوانن بژین). خوای گەورە لەسزای ئەوانەدا دەفەرموێت:[ {فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ} سورة المعارج: (٤٢). واتە: ئەی محمد ﷺ لەو ملهوڕو کەللە ڕەقو خوا نەناسو بێباوەڕو دو ڕوانە گەڕێو گوێ یان پێ مەدە بابکەونە ناو زەلکاوی بێباوەڕیو گاڵتەو گەپو شۆخی خۆیان و باهەر خەریکی کاری هیچو پوچ بن تادەگەنە ئەو ڕۆژە ڕەشەی کەبەڵێنیان پێدراوە، هەشیان بەسەر وا دەزانن هەر لەم ژیانی دنیایەدا دەمێننەوە، یان وا دەزانن کەمردن زیندو ناکرێنەوەو حسابیان لەگەڵ دا ناکرێتو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچنو ئاوا دەی خۆن؟!! وەرگێڕ.

## بەشی پێنجەم

## لەڕێزو پلەو پایەو کەسایەتی هاوەڵان و بیروباوەڕ لەبەرامبەریاندا وەڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و لەوەی کەلەنێوانیاندا ڕوی داوە

**١ـ مەبەست لەهاوەڵان چی یە؟ وەدەبێ بیروباوەڕ چۆن بێت لەبەرامبەریاندا؟**

(الصحابة ـ هاوەڵان) کۆی(صحابي ـ هاوەڵ)ە: کەبریتیە لەو کەسەی کەپێغەمبەری ﷺ بینیوەو لەگەڵیدا ژیاوەو بڕوای پی هێناوەو لەسەر ئەو بیروباوەڕە مردوە واتە بەبڕواداری تەواوەوە مردوە، وەدەبێ بیروباوەڕ لەبەرامبەریاندا وابێت کەئەوانە باشترینی ئوممەتی ئیسلامین، وەباشترین و پڕ خێرو بەرەکەت ترین سەدەیەکن، بەهۆی ئەوەی کەبەوە جیادەکرێنەوەو تایبەتمەندن بەهاوەڵیەتی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ژیاون و لەگەڵی دا تێکۆشاون(الجهاد معه)، وەشەریعەتیان لەوەوە وەرگرتوەو هەڵیان گرتوە، بەو کەسانەیان ڕاگەیاندوە کەلەدوای خۆیانەوە دێن، کەخوای گەورە خۆی لەقورئانی پیرۆزدا باس و مەدحیان دەکات و دەفەرموێت:﴿ وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (٣٠١).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾(٣٠٢).

---

(٣٠١) أ ـ سورة التوبة: (١٠٠).

ب ـ واتاکەیمان لەڕابردودا نوسیوە تکایە بۆی بگەڕێنەوە. وەرگێڕ.

(٣٠٢) أ ـ سورة الفتح: (٢٩).

واتە: محمد ﷺ پێغەمبەری خوایەو بۆڕێنومایی و هیدایەت دانی خەڵکی سەر ڕوی زەوی ڕەوانە کراوە هەروەها ئەوانەی لەگەڵی دان لەبڕواداران بڕوایان پێ هێناوە بەتایبەتی ئەو بڕوادارانەی کەلەپەیمانی حودەیبیەدا لەگەڵی دا بون کەسانێکی زۆر ئازاو بەجەرگو جوامێرن و لەسەر کافران و بێباوەڕان و مولحیدان و ملهوڕاندا زۆر توندو تیژن بەڵام لەنێوان خۆیاندا زۆر نەرم و نیان و بەبەزەیی و میهرەبانن دەیان بینی هەمیشە لەرکوع و لەکڕنوش دان داوای ڕەحمەت و

هەروەها دەفەرموێت:﴿ لِلْفُقَرَاء الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ۞ وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (٣٠٣).

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای پاكو بێگەردباسیو مەدحی كۆچكاران(المهاجرين) و پشتیوانان(الأنصار)كردوە، وەبەوە باسی كردون كەهەمیشە پێشبڕكێ ی چاكەو كاری خێر دەكەن، وەپێمان ڕادەگەیەنێت كەخوای گەورە لەوان ڕازیە، وبەهەشتی بۆ ئامادە كردون، وەبەوە وەسفی كردون كەلەنێوان خۆیاندا واتە لەناو بڕواداراندا زۆر بەبەزەییو

---

بەخشندەییو بەزەیی خوا دەكەنو سیماو كاریگەریو شوێنەواری كڕنوش بەنێو چاوانیانەوە دیارەو لەدوورەوە دەدرەوشێتەوە وێنەی ئەم ڕەوشتانەیان لەتەوراتو لەئینجیل دا هەیە بەوێنەی درەختێكە كەلقو چڵو پۆپی لەڕەگەوە لێ ڕوا بێتو قەدەكەی ئەستور بوبێتو لەگەڵ لقەكانی دا توندو تۆڵو تۆكمەو بەهێز كرد بێتو یەكتریان خاوەن هێزو توانا كرد بێتو بەشێوەیك كەببێتە سەرسامی ئەو كەسانەی كەچاندویانە، هەروەها ببێتە مایەی بوغزو ڕقو كینەی كافرانو بێباوەڕو دڵ نەخۆشو سیخنەكان ئەمە پەیمانێكەو خوا بە ئەو كەسانەی داوە كەبڕوایان هێناوەو گوی ڕایەڵو چاكەكارو خوا پەرستی ڕاستەقینەنو لەسەر قورئانو سوننەت دەڕۆن كەلێ یان خۆش دەبێتو پاداشتێكی بێ پایانیان دەداتەوەو لەدنیاشدا هەمیشە دڵیان خۆشەو بەئومێدی پاداشتی خوای پەروەردگاری خۆیانن. وەرگێڕ؛ بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٣٥٠.

(٣٠٣)أ ــ سورة الحشر (٨ــ٩).

ب ـ واتە: ئەو ماڵو سامانەی كەلەجولەكەكان بەتاڵان دەست موسڵمانان كەوتوە بۆ ئەو بڕوادارانەیە كەلەسەر ماڵو موڵكو زێدو سامانی خۆیان لەمەككە دەركەوتونو لەدوای خۆیان بەجێ یان هێشتوەو دەركراونو هەرچیەكی هەیان بوە وازیان لێ هێناوە لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو فەزڵو بەخشندەیی بی سنوری خوای گەورەو وەلەپێناو سەرخستنی ئایینی خواو پێغەمبەری خوادا كۆچیان كردوەو وڵاتی خۆیان بەجێ هێشتوە، بەڕاستی ئەوانە خاوەنی بیروباوەڕی ڕاستەقینەنو ڕاستگۆن، خوای گەورە بەزەیی بەموسڵمانانی مەدینە داهاتەوە كەپێ یان دەگوترێ (الأنصار) دەفەرموێت: ئەوانەی كەپێش ئەوەی موسڵمانەكان بۆ مەدینە كۆچ بكەنو لەشارەكەی خۆیاندا مەدینەدا نیشتەجێ بون دڵیان هەر بەئیمانەوە بو، ئەو موسڵمانانەیان خۆش دەویست كەلەمەككەوە كۆچیان كرد بو بۆ ناویانو لەجێگاو ماڵی خۆیاندا جێگەیان كردنەوەو لەگەڵ خۆیاندا نیشتەجێ یان كردنو حەواندیاننەوە، ئەوان لەناخی دڵی خۆیانەوە هەستیان بەهیچ ناخۆشیو ناڕەحەتیەك نەكرد كەئەو ماڵو سامانەی لەجولەكەكان بەتاڵان كەوتە دەست موسڵمانان بەسەر كۆچەریەكاندا(المهاجرين) دابەش كرا..ئەوانە لەقوڵایی دڵیانەوە خۆشیو چاكەیان بۆ غەیری خۆیان دەوێت هەرچەند بۆخشیان حەزیان لێ بوو پێویستیان پێ بو، جاهەر كەسێك خۆی لەڕەزیلیو بەخیلی بپارێزێت ئەوە بەڕاستی ڕزگارو سەرفراز دەبێتو قازانجو سودو سەرفرازیەكی زۆری بەسەردا دەڕژێت. تەفسیری گوڵشەن ب٣سورەتی حەشر. وەرگێڕ.

بەرەحمو نەرمو نیانن، وەلەبەرامبەر کافرانو بێباوەڕانو دوڕوانو ملهوڕاندا توندو تیژن، هەروەها بەوە باسیان دەکات کەهەمیشە لەڕکوعو کڕنوش دان بۆ خوای گەورەو دڵی یان پاکو باشە، وەبەسیماو ڕوخساری گوێ ڕایەڵیو بەندایەتیو خوا پەرستیو بەئیمانەوە دەناسرێنەوە، وەخوای گەورە بۆ هاوەڵێتیو پاڵ پشتی پێغەمبەرەکەی پاڵاوتونیو هەڵی بژاردون بۆ ئەوەی دوژمنەکانیان لەکافرانو بێباوەڕان لەداخیانو لەڕقانیان دڵیان بتەقێتو لەمەراقانیان شەق بەرن، هەروەکو وەسفی کۆچکارانی (المهاجرین)بەوە کردوە کەماڵو سامانو موڵکو زێدی باوکو باپیرانو نیشتمانی خۆیان لەپێناو خوادا بەجێ هێشتوەو بۆ سەرخستنی ئایینەکەیانو لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەحمەتو بەزەییو بەخشندەییو ڕەزامەندی خوادا کۆچیان کردوە، بەڕاستی ئەوانە لەپەیمانو لەبیروباوەڕەکەیاندا ڕاستگۆ بون، هەروەها پشتیوانانی(الأنصار) بەوە وەسف کردون کەبەڕاستی خانەدانی دڵسۆزو ڕاستەقینە بونو خاوەنی خانەی کۆچ بۆ کردنو خانەی پشتیوانانو خانەی سەرخەری ئایینی خواو جێگەی حەوانەوەی کۆچکاران بون، هەروەها خاوەنی بیروباوەڕی ڕاستەقینەو ڕاستگۆیی بون، هەروەها بەوە وەسفی کردون کەبەواتای وشە خاوەنی خۆشەویستی بون بۆ برا کۆچکارەکانیانو بەرژەوەندی خۆ نەویستو بەرژەوەندی براکانیان پێش حەزو بەرژەوندیەکانی خۆیان خستو بەڕاستی نمونەی یەکسانی بونو برا کۆچکارانیان لەگەڵ خۆدا یەکسان کرد لەسەرو سامانو ماڵدا، وەشاهیدی دوریان بۆ دەدا لەڕزیلیو دڵ قرچۆکیو پیسکەییو بەدل فراوانیان باس دەکاتو دەفەرموێت ئەوانە بەو کارەیان سەرکەوتنو سەرفرازی دنیاو قیامەتیان بەدەست هێنا. ئائەمانە هەندێك بون لەدڵ نەرمیو بەزەییو بەخشندەییو فەزڵی گشتی ئەوان. هەروەها هەندێ لەفەزڵو بەخشندەیی تایبەتیو پلەی تریان هەبو لەنێوان خۆیاندا بەهەندێکیان بەهەندێکیان دەبەخشی ﷺ، ئەمەش بەپێ ی پێشبڕکێ یان بۆ ئیسلامو تێکۆشانو کۆچ کردن.

**باشترینی هاوەڵان چوار جێنشینەکان بون:** أبوبکر و عمر وعثمان وعلـي، ئەمجار ئەوانی تر لەدە کەسە مزگێنی پێدراوەکان بون بەبەهەشت، کەبریتین لەو چوارەو طلحة، زبیر وعبدالرحمن بن عوف، وأبو عبیدة بن جراح، وسعد بن أبي وقاص، وسعید بـن یزیـد،

وەکۆچکاران لەپشتیوانان بەرز ترن، وئەهلی بەدرو بەیعەتی رضـــوان، وەئـەو کەسـەی لەپێش ئازاد کردنی مەککە موسڵمان بو بێت و جەنگا بێت واتە تێکۆشا بێت، بەرەز تـرە لەو کەسانەی کەلەدوای ئازاد کردنی مەککە موسڵمان بوبێت.

٢ ـ ڕێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەئاست ئەوەی کەلەنێوان هاوەڵاندا ڕوی داوە لەکوشتارو ئاشوب:

**هۆی سەر هەڵدانی فیتنەو ئاشوب:** جولەکەی خوا نەناس دەستیان کرد بەپیلان گێڕان بەسەر ئیسلامو موسڵماناندا، دەستیان کرد بەپیلان گێڕان وسیخوڕیو فێڵی پیسو بۆگەنو لەسەرەوە موسڵمان بونی خۆیان ڕاگەیاند بەدرۆو بەساختەو لەژێروە بێباوەڕو دو ڕو کەبریتی بو لە: عبدالله کوڕی سـبأ لەجولەکەکانی یەمەن، ئەو جولەکە پیسو بۆگەنەڕقو کینەو بۆگەنی خۆی بەسەر موسڵماندا ڕشت، ژەهری خۆی بەسەر خەلیفەی سێ یەم لەخەلیفە ڕاشیدینەکاندا ڕشت کە خەلیفە عثمان کوڕی عفانﷺودەستی کرد بەپیلانو تەڵەکە لەدژیو تاوانی بۆ دروست کرد، ڕوی کردە ئەوانەی کەهەڵی خەڵەتاند بون لەوانەی کەکورت بینو باوەڕیان بێ هێزو لاواز بو وخوازیارانی فیتنەو ئاشوب خوازان بون، تائەنجام فیتنەو ئاشوبەکە بەکوشتنی خەلیفەی ڕاشید عثمـان ﷺو ستەملێکراو کۆتایی هات، وەلەئەنجامی کوشتنی عثمـان جیاوازیو جیاڕایی لەنێوان موسڵماناندا ڕوی دا، فیتنەو ئاشوب پەرەی سەند بەهاندانو ئاگر خۆش کردنی ئەو جولەکەو شوێن کەوتوانو دارو دەستەکەی، کوشتار کەوتە نێوان هاوەڵان بەهۆی کۆشش کردن(إجتهاد) یان.

شرۆڤەکار الطحاوية گوتویەتی:(بنەڕەتی نەویستن(الرفض) لەلایەن دو ڕوێکی زەندیقی لەئایین دەرچو دای هێنانو دروستی کرد، بەمەبەستی پوچەڵ کردنەوەی ئایینی ئیسلام، بریندار کردنو تیرو توانج گرتن لەپێغەمبەرﷺهەروەکو زانایان ئاماژەیان پێ کردوە، عبدالله کوڕی سبأ، کاتێ ئیسلام بونی خۆی ڕاگەیاند، بەنیەتی پیسو بۆگەنو فێڵو تەڵەکەی خۆی ویستی ئایینی ئیسلام پوچەڵو لەکار بخات، هەروەکو چۆن پۆڵس بەئایینی گاورایەتی(النصرانية) کرد، خوا پەرستی خۆی ئاشکرا کرد، دواتریش فرمان بەچاکەو قەدەغە کردنی لەخراپە ئاشکرا کرد، ئەوجار کەوتە هەوڵو تەقەلا بۆ فیتنەو

ئاشوب گێڕان لەدژی عثمانو کوشتنی، ئەمجار کەهاتە کوفە دەستی کرد بەزێدەڕەوی لەمافی علی، وپاڵ پشت کردنو سەر خستنی، بۆ ئەوەی لەو زەلکاوەداو لەو سەنگەرەوە هیواو ئاواتو مەبەستەکانی بێنێتە دیو بەدەستیان بێنێت، کاتێ ئەم دەنگو باسە بەعلی گەیشتەوە فرمانی کوشتنی داو داوای کوشتنی کرد، بەڵام ئەو لەدەستی رای کردو چوە قرقیس، هەواڵەکانی ئەو نەفرین لێکراوە لەمێژودا ناسراووبەناوبانگە.

وەشێخی ئیسلام إبن تيمية رحمه الله گوتویەتی:(کاتێ عثمان کوژرا رضي الله عنه دڵەکان لێك جیا بونەوەو بەڵاو فیتنەو ئاشوبەکان گەورە بون، خراپکاران سەریان هەڵداو چاکەکاران کەساسو داماوو زەبون بون، ئەوەی تاکو ئەو کاتە لەخراپەکاریو فیتنەو ئاشوب پەکی کەوت بو کەوتە خۆو سەری هەڵداو دەستی بەکارو چالاکی شاراوەی خۆی کرد، وەئەو کەسانەی کەدەیانەویست چاکەو چاکەکاریو بەرخورداری خێرو بەرەکەت بەرخوردارو بەرقەرار بێت پەکیان کەوت، بەیعەتیان بەعلـي کوڕی أبي طالـب عليه السلام دا کەباشترین کەسێكو شایستە ترینی خەڵکی بو بەخەلافەت لەو کاتەدا، وەباشترینی ئەو کەسانە بو کەمابون، بەلام دڵەکان پەرتەوازەو لێك جیا بون، و ئاگری فیتنەو ئاشوبیش داگیرسا بو، لەبەر ئەمە وشەکان یەك نەکەوتنو دەستەو گروپەکان ڕێك نەکەوتن، خەلیفەو باشترینی ئوممەتی ئیسلام نەیتوانی هەرچی دەوێت لەچاکەو خێر ئەنجامی بدات، گروپو جیاوازیو فیتنەی گەلانو دەستەو گرۆپەکان هاتە ناوو ئاشوب باڵی ڕەشی خۆی بەسەردا کێشاو ئەوەی روی دا روی دا)([٣٠٤]).

هەروەها عوزرو بەهانەی جەنگاوەرانی هەوەڵانی رون کردۆتەوە لەکوشتاری نێوان علیو معاویەدا کەگوتویەتی:(معاویە داوای خەلافەتی نەدەکرد، وەلەکاتی شەڕ کردن لەگەڵ علی دا داوای بەیعەتی نەدەکرد، وەشەڕیشی بۆ ئەوە نەدەکرد کەخەلیفەیە، وەنە بۆ ئەوەش بو کەشایستەو موستەهەقی خلافەتە، وەمعاویە ددانی بەو ڕاستیە دێنا ئەگەر پرسیاریان لێ کردبایە، وەنەمعاویەو هاوەڵەکانی ئەوەیان دەبینی کەدەست پێشخەر بون

([٣٠٤]) مجموع الفتاوى(٢٥/٣٠٤ــ٣٠٥).

لەکوشتاریاندا لەگەڵ علی‌و هاوەڵەکانی دا، بەڵکو کاتێ علی ﷺوهاوەڵەکانی بینیان پێویستە لەسەریان کەگوێ ڕایەڵی‌و بەیعەتیان پی بدەن، چونکە دەبێ موسڵمانان لەیەك خەلیفە پتریان نەبێت‌و دروست نیە، وەئەوەانەش لەگوێ ڕایەڵی خەلیفە دەرچوون‌و، ئەم واجبەیە قەدەغە دەکەن، وەئەوانە ئەهلی هێزو توانای ئوممەتن، وای بینی کەدەبێ شەڕیان لەگەڵ دا بکرێت تابێنەوە سەر ڕێگای ڕاست‌و ئەو واجبە جی بەجێ بکەن، بەمە گوێ ڕایەڵی‌و کۆمەڵی‌و گرد بونەوەو لەدەوری یەکتری دا بەدەست دێت. ئەوانە واتە(معاويە‌و ئەوانەی لەگەڵی دابون) گوتیان: ئەم شتە لەسەر ئەوان واجب نیە، وەئەوان ئەگەر لەسەر ئەوە بکوژرێن ئەوا ستەم لێکراون: گوتیان: چونکە عثمان بەکۆڕای زانایانی موسڵمان بەستەم لێکراوی کوژرا، وەئەوەی کوشتیشی لەسەربازگەی علی دابو، وەئەوانە بەزۆری هێزو توانا بون بۆ ئەوان، ئەگەر قەدەغە بین‌و ڕازی نەبین ستەممان لێ دەکەن‌و دەست درێژیمان دەکەنە سەر، وەعلی ناتوانێت لێمان لابدات‌و بەرگریمان لێ بکات هەروەکو چۆن نەیتوانی لەعثمان یان لابدات‌و بەرگری لێ بکات، بەڵکو پێویستە لەسەرمان کەبەیعەت بەخەلیفەیەك بدەین کەدادپەروەریمان بۆ دەستەبەر بکات‌و لەگەڵماندا دادپەروەر بێت.

وەڕێبازی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لە جیاوازی دا، سەبارەت بەو ئاشوبەی کەڕوی داو کەوتەوە دەرئەنجامەکەی کوشت‌و کوشتاری هاوەڵانی لێ کەوتەوە لەنێوان خۆیاندا لەدو خاڵ دا پوختەو گردیان دەکەینەوە:

کاری یەکەم: ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لەئاست ئەم ڕوداوە دڵ تەزێنەی کەلەنێوان هاوەڵاندا ڕوی دا بێ دەنگ بون‌و هەرگیز لێ ی نەدەکۆڵینەوەو کپیان دەکردەوە، چونکە لەم بوارەدا بێ دەنگی سەلامەت ترین‌و باشترین ڕێگەیەك بو کەبگیرێتە بەر، دەیانگوت :﴿ وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[٣٠٥].

---

([٣٠٥])أ ــ سورة الحشر:(١٠).

ب ـ واتە: ئەو موسڵمانانەی کەلەدوای کۆچکاران‌و پشتیوانان هاتون‌و دین تادنیا خەرا دەبێت دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە لەگوناحەکانی ئێمەش‌و ئەو برا موسڵمانانەمان خۆش ببە کەلەپێش ئێمەوە هاتون‌و بەڕاستی بڕوادار

**کاری دوەم:** وەڵامدانەوەی ئەو شوێنەوارە خراپانەی کەدەربارەیان دەگێڕدرێنەوە، ئەمەش لەچەند ڕویەکەوە:

**ڕوی یەکەم:** ئەو شوێنەوارانە واتە ئەو قسەو قسەلۆکانە هەندێکیان درۆیە، دوژمنانەکانیان بۆیان هەڵ بەستون بۆ ئەوەی کەسایەتیان لەکەدارو بڕوشێنن.

**ڕوی دوەم:** ئەم شوێنەوارە هەیە بۆی زیاد کراوەو هەیە لێ ی کەم کراوە، و لەڕوی ڕاستەقینەی خۆی لادراوەو شێوێندراوە، و درۆو دەلەسەی تێکەڵ کراوە، دەی ئەوەی شێوێندراو لادراوە ئاوڕی لێ نادرێتەوە واتە بڕوای پێ ناکرێت.

**ڕوی سێ یەم:** ئەوەی ڕاست بێت لەو شوێنەوارەدا ئەویش دەگمەن وکەمە - ئەوان لەم حاڵەتەدا عوزرو پاکانەیان هەیە، چونکە ئەوان یان تێکۆشاون و پێکاویانە یان تێکۆشاون و هەڵەیان کردوە، ئەمەشیەکێکە لەدەست کەوتو داهاتەکانی تێکۆشان ئەگەر تێکۆشەر لەتێکۆشانەکەی دا پێکای ئەوە دو جار پاداشتی بۆ هەیە، وەئەگەریش هەڵەی کرد ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە، وەهەڵەش لەم پێگەیەدا بوردراوە، بەگوێرەی ئەوەی کەلەفەرمودەدا هاتوە کە: پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {إذا إجتهد الحكم فأصاب فله أجران، وإن أجتهد فأخطأ فله أجر واحد}[٣٠٦].

**ڕوی چوارەم:** ئەوانیش مرۆڤ بون و مرۆڤیش هەمیشە قابیلی هەڵە کردنە، تێ یاندا هەبوە کەهەڵە بکات، ئاخر ئەوانیش پارێزراوو مرۆڤی بی هەڵەو پەڵە نەبون و بێ گوناح نەبون سەبارەت بەتاک تاکەکانیان، بەڵام لەوەی کەتێ ی کەوتون کوژێنەرەوەو هۆکاری سڕینەوەی گوناح و تاوانەکانیان هەبو کەدەکری لەم ڕیزبەندیەی خوارەوەدا خڕیان بکەینەوە:

---

بون و دڵیان بەڕۆشتایی ئیمان ڕۆشن ببوەوە، وەهیچ بوغزو ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە بەرامبەر بەو برِوادارنەی پێش ئێمە کەدڵەکانیان بەڕۆشنایی ئیمان ڕۆشن بو بوەوە ، ئەی خوایە تۆ زۆر بەبەزەیی و بەڕەحم و میهرەبانیت. وەرگێڕ.

[٣٠٦] أ ــ في الصحيحين من حديث عمرو بن العاصرضي الله عنه.

ب - واتە: ئەگەر دادوەر تێکۆشاو پێکای ئەوە دو پاداشتی بۆ هەیە، وەئەگەر تێکۆشاو نەی پێکا ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە. وەرگێڕ.

١. لەوانەیە دوای هەڵەو گوناحەکە پەشیمان بوبنەوەو تۆبەیان کرد بێت، دیارە شتێکی ئاشکرایە کەتۆبە کردن خراپەو گوناحەکان دەسرێتەوە هەر چۆنێکی بوبن، هەروەکو بەڵگەی لەبارەوە هاتوە.

٢. ئەوان ئەوەندەیان ڕابردوی باشو کاری چاکە هەبوە کەشایستەی ئەوەن ببێتە هۆی لێ خۆش بونو سڕینەوەی ئەو هەڵەو گوناحانەی کەلێ یانەوە دەربچێت، ئەگەر ڕوی دابا، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ﴾[٣٠٧]. ئەوانە بەشی ئەوەندەیان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺهاوەڵایەتیو تێکۆشان (الجهاد) هەبوە کەهەڵەو گوناحە کەمەکانیان داپۆشێتو بیان سڕێتەوە.

٣. ئەوانە پتر لەغەیری خۆیان چاکەکانیان بەدو هێندە بۆ هەژمار دەکرا ، کەس لەگەڵ ئەواندا یەکسان نەبوە لەکاری چاکەو چاکگوزاری دا، بەفەرمودەی پێغەمبەرﷺچەسپاوو سەلمێنراوە کەئەوان چاکترینی سەدەکان بون، ئەگەر یەکێك لەوان یەك مستی ببەخشیایە، باشتر بو لەغەیری ئەوان ئەگەر بەقەد کێوی أُحد زێڕی ببەخشیایە([٣٠٨]).ﷺوأرضاهم).

شێخی ئیسلام إبن تیمیة رحمه الله گوتویەتی:(هەمو ئەهلی سوننەتو جەماعەتو پێشەوایانی ئایین بیروباوەڕیان بەپارێزراویو بێ هەڵەو پەڵەی هاوەڵان نەبوەو وای بۆ نەچون، نەئەوانەی نزیکیانو نەئەوانەی دوا ئەوانو نەغەیری ئەوانیش، بەڵکو شیاوی ئەوە بون کەهەڵەو گوناحیان لێ ڕو بدات، خوای بەرزو بالا دەست لێ یان خۆش دەبێتو تۆبەیات لی وەردەگرێت، وپلەکانیان بۆ بەرز دەکاتەوە، وەبەهۆی چاکە ڕەشکەرەوەکانیان(بحسناتهم الماحیة) لێ یان خۆش دەبێت، یاخود بەهەر هۆیەك لەهۆیەکانی تر دەیان بورێت، خوای بەرزو بی هاوتا دەفەرموێت:﴿ وَالَّذِي جَاء بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ۞ لَهُم مَّا يَشَاءونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ ۞لِيُكَفِّرَ اللَّهُ

---

([٣٠٧]) أ ـ سورة هود: (١١٤).

ب ـ واتە‌ك چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە. وەرگێڕ.

([٣٠٨])في الحديث متفق عليه.

عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٣٠٩]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ۞ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّئَاتِهِمْ فِي أَصْحَابِ الْجَنَّةِ وَعْدَ الصِّدْقِ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾[٣١٠]... تەواو[٣١١].

دوژمنانی خوا ئەوەی کەوتە نێوان هاوەڵانەوە لەکاتی فیتنەو ئاشوبدا لەجیاوازیو جیاڕاییو کوشتو کوشتار بەهەلیان قۆزتەوە بۆ ئەوەی لەو دەلاقەیەوە بێنە ناو قەڵای سەختی ئیسلامو

---

([٣٠٩]) أ ــ سورة الزمر: (٣٣ــ٣٥).

ب ـ واتە: ئەو کەسەی کەپێغەمبەری خۆشەویستەﷺ پەیامی خوای هێناوە کەقورئانی پیرۆزە و بەخەڵکی ڕاگەیاندوە، وەئەوانەیش بڕوایان پێ هێناوە کەلەلایەن خودای پەروەردگارەوە هاتوەو فەرمایشتەکانی خوایان جێ بەجێ کردوەو بەڕاستی خوا بەتەنها دەپەرستنو بەندایەتی بۆ دەکەنو هیچ هاوەڵی بۆ دانانێنو خۆیان لەخوای خۆیان دەپارێزن و ڕاستگۆن، ئەوانە بەڕاستی خۆلەخوا پارێزان، ئەوانە هەرچی بیانەوێت لەنازو نیعمەتەکانی بەهەشت لای خوای خۆیان دەستیان دەکەوێتو بۆیان ئامادە دەکرێت، ئائەمەیە پاداشتی چاکەی چاکەکاران، بۆ ئەوەی خوای گەورە خراپترینی کارەکانیان بۆ ڕەش بکاتەوەو بەباشترینی شێوە پاداشتی یان بداتەوە پتر لەو کردەوانەی خۆیان کەئەنجامیان داوە. وەرگێڕ، لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٢١٠ـ١٢١١.

([٣١٠]) أ ــ سورة الأحقاف ( ١٥ــ١٦ ).

ب ـ واتە:ئەو مرۆڤە کەدوای ئەوەی لەدایك دەبێتو گەورە دەبێتو پێ دەگاتو گەشە دەکاتو دەگاتە تەمەنی چل ساڵیو هۆش وبیر دەکاتەوەو دەگاتە کامڵیوهۆشو گۆشی خۆی ڕو دەکاتە خوای پەروەردگاریو دەڵێ: ئەی پەروەردگارا وام لێ بکەیتو بخەیتە دڵمەوە کەشوکرانە بژێری نازو نیعمەتەکانی تۆ بمو بەندایەتی تۆ بەتەواویو بەچاکی بکەم وەك خۆت پێت خۆشەو لێ ی ڕازی لەسەر ئەو نازو نیعمەتەی کەبەمنو بەدایکو باوکمت بەخشیوە، هەروەها کردەوەی چاك بکەمو سوپاسگوزاری تۆ بکەمو لەبەرنامەکەی قورئانو سوننەت لانەدەم، هەروەها ئەوەو ڕۆڵەکانم بۆ چاك بکەیتو کردەوەی چاكو خوا پەرستیو ڕێگای ڕاستیان نیشان بدەیتو ڕێنومایان بکەیت پشت بەپشت هەتاکو ڕۆژی دوایی ئەوەو وەچەکانم صالحو پیاو چاكو خواناسو خوا پەرست بکەیتو زاناو دانایان تێدا هەل بکەوێت خوایە گیان، وەمن لەموسڵمانانمو لەموسڵمانانم بژمێرێتو من لەو کەسانەم بەیارمەتی تۆ کەبەتەواوی ملکەچی تۆنو گشت فەرمانەکانت جێ بەجێ دەکەن، ئەوانەی کەباسمان کردن کردەوەباشەکانیان وەردەگرین بەپێ ی باشترین کردەوەیان پاداشتی یان دەدەینەوەو لەکردەوە خراپەکانیان دەبورینو چاوپۆشی دەکەینو لەگەڵ بەهەشتیانی تردا بەباخو باخاتو جۆباره دڵڕفێنەکانی بەهەشتی بەرین شادمانیان دەکەین. ئائەمەش ئەو بەڵێنە باشو چاکانەن کەلەژیانی دنیادا پێمان دابون، دیارە گومانی تێدا نیە کەخوای گەورە بەڵێنو پەیمانەکانی خۆی دەهێنێتە دی و هەرگیزاو هەرگیز لەبەڵێنەکانی خۆی پەشیمان نابێتەوەو دواش ناکەوێت. ١ــ تەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٣٢٢ـ١٣٢٣+ ٢ــ عیمان عبدالعزیز، تەفسیری قورئانی پیرۆز ب١٢ل١٧٧ـ ١٧٩/ج٢٥ـ٢٦. وەرگێڕ.

([٣١١])تەماشای(مجموع الفتاوى(٣٥/٩٦) بکە.

موسڵمانانەوەو بکەونە ناویانەوەو سخوڕم لەکەلەکەیان بکوتن، لەپایەو کەرامەتو شکۆمەندیان کەم بکەنەوەو هێزو تواناو پشتو قوەتیان دابڕوخێنن، هەندێ لەنۆسەرە هاوچەرخەکانیش لەسەر هەمان نەخشەو پیلانی بۆگەنی پێش خۆیان ڕۆیشتن، ئەوانەی وڕێنە بەشتانێکەوە دەکەن کەهەر نەشیان دەزانیو هەریان لەفرێ نەدەکردەوە، خۆیان کرد بوە نابژیوان(حکم)لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، بەبێ بەڵگەو شارەزایی هەندێکیان بەڕاست دادەنانو هەندێکیش بەهەڵە، بێ بەڵگەو بێ شت، بەڵکو نەفامانەو بەگوێرەی هەواو ئارەزوەکانی خۆیان بەنێو دەکەوتن، کاوێژی ئەوەیان دەکردەوە کەقین لەدڵەکانو دڵ پیسو بۆگەنەکان لەڕۆژهەڵاتناسان و کلکو گوی لەمستەکانو دوڕوو خۆفرۆشەکان دەیان گوتو فێریان دەکردن، هەتا گومانو دو دڵیو ڕاڕاییان خستە ناو دڵی موسڵمانە تازە پێگەیشتوەکان - لەوانەی کەتێگەیشتنو ڕۆشنبیریان زۆر کەم بو و فامکاڵ بونو شارەزاییان زۆر کەم بو - بەمێژوی پڕ سەروەری ئوممەتە ئیسلامیە پڕ سەروەریەکەیان، وپێشینە پیاو چاکەکانیان ئەوانەی کەباشترینو چاکترین سەدەی موسڵمانان بون، بۆ ئەوەی لەئەنجامی ئەم کارە بۆگەنەیاندا خەنجەری ژەهراوی لەپشتەوە لەگرچوی ئیسلامو موسڵمانان بوەشێنن، و وشەی موسڵمانان پەرتەوازەو لەیەك جیا بکەنەوە، بوغزو کینەو ڕقو نەخۆشی بخەنە دڵی کۆتای ئەم ئوممەتە بەرامبەر بەسەرەتاو پێشینەی ئەم ئوممەتی ئیسلامەو هەرگیز ددان بەپێشینەی خۆیاندا نەهێننو هەمیشە ڕقیان لێ ببنەوەو تانەو تەشەرە لەپێشینە بەڕێزەکانی خۆیان بدەنو لەیەکتریان بکەنە دوژمن هەروەکو کردیشیانو تائێستاش هەر بەردەوامە([٣١٢])، لەبری ئەوەی

---

([٣١٢]) دەگێڕنەوە لەکۆتایی سەدەی(١٩) گلاجستۆن سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی بەریتانی لەکۆبونەوەیەکی ئەو ئەنجومەنەدا هەستایە سەر پێو گوتی: بەڕێزان ئێمە هەر وا بەئاسانی بەسەر موسڵماناندا سەر ناکەوینو زاڵ نابین هەتاکو ئەم دو خاڵە ئەنجام نەدەین: ١) قورئانێکی بچوکی بەدەستەوە بو گوتی هەتا ئەو قورئانە لەناویاندا بمێنێو تادەست بەم قورئانەوە بگرن ئەوا ئێمە بەسەریاندا سەر ناکەوین، جاکەواتە با ئێمە وا بکەین ئەو قورئانەیان لەژێر دەست دەر بهێنین. یەکێك لەئەندامان هەستاو گوتی: جا ئەوە چی یە هەمو قورئانەکان کۆ دەکەینەوەو دەیان سوتێنینو دەیان دڕێنین. گوتی: نا ئەیا نا ! !، دەبێ لەناو دڵیاندا دەری بکەینو لێکیان دور بخەینەوە لەئاکاری قورئان دوریان بخەینەوەو بێ ئاگایان بکەین و مێشکیان بشۆینەوە(غسل الدماغ) یان بۆ بکەین. لەیەکتریان بێ ئاگا بکەین وایان لێ بکەین هەر یەکەیان لەدۆڵێك دابن. لەپێغەمبەرﷺگێڕدراوەتەوە کەفەرمویەتی: { سيأتي زمان على أمتي القرآن في واد وهم في واد غيره }.

٢) هەروەها دەبێ وایان لێ بکەین کەدوریان بخەینەوە لەکاری حەج کردن، چونکە حەج نیشانەی یەکگرتنو لێك نزیك بونەوەی موسڵمانانەو نیشانەی هێزو تواناو خۆشەویستی و سەرکەوتنە. حەج کۆنگرەیەکی ساڵانەی موسڵمانانەو ساڵانە لەبارو گوزەرانو

شوێن پیێ ی ئەوان هەل بگرن‌و بەیداخی دەستی پێشینەکانی خۆیان بەرز تر ڕابگرن‌و لەسەر بەرنامەو مەنهەجی ئەوان بڕۆن، کار بەم فەرمایشتەی خوای گەورە بکەن کەدەفەرموێت:﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾([312]).



 

---

ئێش‌و ئازارو تەنگو چەڵەمەوئاستەنگو ئاریشەو ئەندێشەکانی یەکتری ئاگادار دەبنەوەو کێشە هەنوکەییەکانی یەکتری چارەسەر دەکەن. وەرگێڕ.

([312]) أ ـــ سورة الحشر: (١٠).

ب ـ واتاکەیمان تۆزێك پێشتر نوسیوە تکایە بۆی بگەڕیوە. وەرگێڕ.

## بەشی شەشەم

## قەدەغە کردنی جنێو دان و سوکایەتی کردن بەهاوەڵان و پێشەوایانی ڕێگەی ڕاست گرتو( أئمة الهدى )

١- نەهێڵانی جنێو گوتن و سوکایەتی کردن بەهاوەڵان: لەبنچینەو بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت: دڵ و دەرون و زمانیان سەلامەت و پاک و خاوێنە لەبەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەکو چۆن خوای گەورە بەوە باسی کردون و دەفەرموێت:﴿ وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ سورة الحشر:(١٠).

وەبە گوێ ڕایەڵی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کەلەفەرمودەیەکی خۆی دا فەرمانمان پێ دەکات و دەفەرموێ:{لاتسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أحد ذهباً مابلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه} ([٣١٤]). وەئەهلی سوننەت و جەماعەت لەڕێبازی شیعە ڕافزی و خەوارجەکان بێ بەری و ئەستۆپاکن کەجنێو بەهاوەڵان ﷺ دەدەن و سوکایەتیان پێ دەکەن و ڕقیات لێ دەبنەوە، وڕێزو پلەو پایەیان دادەپۆشن و لەشکۆمەندیان کەم دەکەنەوە، بڕوایان بەزۆرینەی هاوەڵان نیە.

وەئەهلی سوننەت و جەماعەت هەرچی لەقورئان و سوننەتدا هاتوە لەبارەی فەزڵ و ڕێز و پلەو پایەی هاوەڵان قبوڵیانەو بڕوایان پێ یەتی، وەبیرباوەڕیان وایە کەئەوانە چاکترین و باشترینی سەدەکانی مێژوی ئیسلام و موسڵمانانن، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {خيركم قرني .....} فەرمودە([٣١٥]).

وەکاتێ پێغەمبەر ﷺ باسی جیایی و پەرتەوازەیی ئوممەتی ئیسلامی کرد بۆ حەفتاو سێ گروپ و دەستە، کەهەمویان دەچنە ناو ئاگری دۆزەوە تەنیا یەک گروپیان نەبێت، پرسیاریان لێ کرد ئەو گروپە کامەیە فەرموی:{هم من كان على مثل ماأنا عليه اليوم و أصحابي}([٣١٦]) .

---

([٣١٤])أ ــ الحديث متفق عليه.

ب ـ واتە:تاکەیمان تۆزێ پێشتر لێك داوەتەوە. وەرگێڕ.

([٣١٥])أ ــ الحديث في الصحيحين.

([٣١٦])رواه الإمام أحمد وغيره.

أبو زرعة ـ کەدیارترینی شێخەکانی ئیمامی موسلمە ـ گوتویەتی: ئەگەر هەر کەسێکت دیت یەکێك لەهاوەڵان کەم دەکاتەوە واتەبڕوای پی نیە ، ئەوە بزانە کەئەو کەسە زندیقە و لەئایین دەرچوە، چونکە قورئان هەقە، وپێغەمبەرﷺهەقە، وەهەرچی هێناویەتی هەقە، وەئەوەی لەسەری بو بۆ ئێمە هەموی گەیاند هەتاکو هاوەڵان، جاهەر کەسێك ئەوان بریندار بکاتو تیرو توانجو تەشەرەیان تی بگرێت ئەوە دەیەوێت قورئانو سوننەت پوچەڵ بکاتەوە، بریندار کردنی خۆی شایستە ترەو حوکم دان بەزندیقو گومڕاو سەر لێشێواو ڕاسترو هەق ترو دادوەرانە ترە.

زاناو بلیمەت إبن حمدان لە(نهاية المبتدئين)دا نوسیویەتیودەڵێ:(هەر کەسێك جنێو بەهەر یەکێك لەهاوەڵان بداتو سوکایەتیان پێ بکاتو بەحەڵاڵی بزانێت، ئەوە کوفری کردوەو کافر بوە، وەئەگەر بەحەڵاڵی نەزانێت ئەوە فاسقە، هەروەکو لەوەوە هاتوەکە: بەڕەهایی کافرە، وەهەر کەسێك بەفاسقیان دانێت، یاخود تیرو توانجو تەشەر لەئایینیان لێ بدات، یاخود بەکافریان دابنێت، ئەوە کافر بوە.([317]).

**٢ـ قەدەغەی جنێودانو سوکایەتی کردن بەپێشەوایانی ڕێگای ڕاستگرتو(الهدى) لەزانایانی ئەم ئوممەتی ئیسلامە:** لەدوای هاوەڵان لەڕێزو کەرامەتو پلەو پایەو جێگەدا: پێشەوایان دێت لەشوێن کەوتوانو شوێنکەوتوانیان لەسەدە زێڕینەکان، وەئەوانەی کەلەدوا ئەوان دێن لەوانەی کەشوێن هاوەڵان کەوتون بەچاکە، هەروەکو خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێت:﴿ وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ سورة التوبة: (١٠٠).

بەهیچ شێوەیەك دروست نیە لەپلەو پایەوشکۆمەندیان کەم بکەیتەوەو جنێویان پێ بدەیتو سوکایەتیان پێ بکەیت، چونکە ئەوان مەشخەڵانی ڕێنومایيو هیدایەت بون، خوای باڵا دەستو کاربەجێ دەفەرموێت:﴿ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيرًا﴾ سورة النساء: (١١٥).

---

ب ـ واتە: ئەوانەی لەسەر ئەو بەرنامەیە دەڕۆن کەئەمڕۆ منو هاوەڵانم لەسەری دەڕۆین. وەرگێڕ.

([317])شرح عقيدة السفاريني(٢/٣٨٨ـ ٣٨٩).

شرۆڤەکار الطحاوية گوتویەتی:(لەسەر هەمو موسڵمانێك پێویستە دوای خۆشەویستیو لایونگیریەتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، پێویستە خۆشەویستیو دۆستایەتیت بۆ بڕواداران هەبێت، هەروەکو قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ کردوە، بەتایبەتی ئەوانەی کەمیراتگری پێغەمبەرانن، کەخوای گەورە لەجێگەی ئەستێرەی داناون یابەئەستێرەی چواندون، کەبەهۆی ئەوانەوە لەتاریکایی وشکانیو دەریایی دا ڕێگەی خۆیانی پێ دەدۆزنەوە، ئاواش موسڵمانان لەدەوری تیشکی زانستو زانیاریو ڕێنومایيو هیدایەتی ئەواندا کۆبونەتەوە ورێگای ڕاستی خۆیانی پێ دەدۆزنەوە.

ئەوانە جێنشینانی پێغەمبەرن ﷺ لەئوممەتەکەی دا، زیندو کەرەوەی سوننەتە مردوەکانن، کتێبەکەی خوا بەوان ڕاوەستاوەو ئەوانیش بەکتێبی خواوە ڕاوەستاون، بەهۆی ئەوانەوە کتێبەکەی خوا گفتار دەکاتو ئەوانیش بەهۆی کتێبەکەی خواوە گفتار دەکەن، هەمویان بەدڵنیاییەوە کۆڕان لەسەر ئەوەی کەپێویستە پەیڕەوو پێغەمبەر ﷺ بکرێتو شوێنی بکەویت، بەڵام: ئەگەر ڕاو گۆتەی یەکێك لەو پێشەوایانە بینرا کەپێچەوانەی قسەی ئەو فەرمودەی ڕاست هاتوە، گومانی تێدا نیە کەدەبێ لەواز لێ هێنانی دا پاساوو بەهانە هەبێت.

**کۆی پاساوەکان(الأعذار) سی پۆلن:**

**یەکەم: بیروباوەڕی وا نەبێت کەپێغەمبەر ﷺ فەرمو بێتی.**

دوەم: بیروباوەڕ وانەبێت ئەو گۆتەیە یائەو ڕایە مەبەستی لەو کێشەو تەنگژەیە بێت.

سێ یەم: بیروباوەڕ وابێت کەحوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە(منسوخ).

ئاخر ئەوانە ئەزڵو ڕێزو منەتیان بەسەر ئێمەوە هەیە، بەپێشبڕکێ کردن بۆگەیاندنو ڕاگەیاندنی ئەو بەرنامەی کەپێغەمبەر ﷺ پێ ی ڕەوانە کراوە بۆ ئێمە، هەروەها ڕون کردنەوەو شی کردنەوەی ئەوەی کەلای ئێمە ڕونو ئاشکرا نەبوەو لێ ی حاڵی نەدە بوین ، خوای گەورە لێ یان ڕازیەو ئەوانیش لەخوا ڕازین:﴿ وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ سورة الحشر: (١٠).

کـەم کردنـەوە لەپلەپایـەو توانـای زانایـان، بـەهۆی ڕودانـی هەڵەیـەکی تێکۆشـانی (الإجتهادي) لەهەندێکیانـەوە، ڕێگـەو ڕێبـازی تازەگـەران‌و داهێنـەران(المبتدعـة)ە، ولـە نەخشەو پیلانی دوژمنانی ئوممـەتی ئیسلامە، بۆ گومان‌و دو دڵـی خسـتنە نـاو ئـایینی ئیسلام، ودوژمنایەتی‌و دو بەرەکایەتی خستنە نێوان موسـڵمانانەوە، وەلـەپێناو دابڕان‌و دور خسـتنەوەی پاشـینەی ئوممـەتی ئیسـلام لەپێشـینەکانیان، وەبـڵاو کردنـەوەی جیاوازی‌و لێك دابـڕان لـەنێوان گـەنج‌و لاوان‌و زانایـانی ئـەم ئوممەتـە، هـەروەکو ئێسـتاو لەواقعی ئەمڕۆماندا ئەم ڕاستیە بەچاوو بەدیدی خۆمـان دەبیـنین، هەنـدێ لـەقوتابیان‌و خوێنـدکارە سـەرتاییەکان لەمـە بێدار بونـەوە، ئەوانـەی کـەڕێز لـەتواناو پلـەو پایـەی فیقهزانان دەگرن ، ولەتواناو بڕی فیقهی ئیسلامی زیاد دەکـەن‌و هـەوڵی گەشـە سـەندن‌و پێش خستنی دەدەن، بۆ خوێندن‌و توێژینـەوە لـەفیقهی ئیسـلامی تێدەکۆشـن ، و سـود لەڕاست‌و هەقـەکانی، شـانازی‌و فـەخر بەفیقهـەوە دەکـەن، وەڕێـز لـەزانایانی خۆیـان، بەپڕوپاگەندەو دعایەی گومڕایانەو قین لەدڵانەو فڕو فێڵۆ تەڵەکە بـازی لەگـەڵ ئیسـلام‌و موسـڵمانان‌و زانایـانی بـەڕێزی ئیسـلام ناکـەن‌و خەنجـەر لەپشـتەوە لەگرچـوی زانایـان‌و موسڵمانان ناسرەوێنن. خودای گەورە پشتیوان‌و سەرخەرە(والله الموفق).

******* ******* *******

# دەرگـــای شەشەم

## تازەگەری و داهێنان( البدع )

ئەم بەشانەی خوارۆەوە لەخۆ دەگرێت:

بەشانەی یەکەم: پێناسەی داهێنان - جۆرەکانی - حوکمەکانی.

بەشی دوەم: سەرهەڵدانی داهێنانەکان لەژیانی موسڵماناندا، هۆکارەکانی کەبونە هۆی سەرهەڵدانیان.

بەشی سێ یەم: هەڵوێستی ئوممەتی ئیسلامی لەداهێنەران، وەمەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەبەرپەرچ دانەوەیان.

بەشی چوارەم: قسە کردن لەسەر نمونەکانی داهێنراوە هاوچەرخەکان(البدع المعاصرة): کەبریتیە لەمانەی خوارە:

١. ئاهەنگ گێران بەبۆنەی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ.

٢. بەپیرۆز دانانی شوێنەکان و شوێنەوارو مردوان و واتە مەزارو پیر نەزرگەکان و لەم جۆرانە.

٣. داهێنانەکان لەبواری بەندایەتیەکان و خۆنزیك کردنەوە لەخوای گەورە.

## بەشـــی یەكەم

### پێناسەی داهێنان ـ جۆرەكانی ـ حوكمەكانی.

**١ـ پێناسەكەی: داهێنان(البدعة) لەزماندا:**

لەوشەی(البَدْع) وەرگیراوە، واتە دروست كردنو داهێنان لەسەر شێوەیەك كەلەپێشتر بونی نەبوبێت بەواتایەكی تر داهێنانی سەرەتایی، وەك لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتوە:﴿ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾[٣١٨].

واتە داهێنان لەسەر وێنەیەك كەپێشتر وێنەی نەبوبێتو لەنوێوە هێنرا بێتە دی، وەك لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا دەردەكەوێت:﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنْ الرُّسُلِ ﴾[٣١٩].واتە: من یەكەم كەس نیم كەپەیامی خوام بۆ هاتبێتە خوارو یەكەم كەس نیم كەبەپێغەمبەرایەتی نێردرا بم، ئەوەی بەئێوەی ڕادەگەیەنم پەیامو ئایینی خوایە، بەڵكو چەندان پێغەمبەرو ڕەوانە كراوی تر لەپێش مندا هاتونو هەمان پەیامی خوایان بەخەڵكی سەردەمی خۆیان ڕاگەیاندوە.

وەزۆر جار هەیە دەڵێن: فلانە كەس شتێكی جوانو سەیری داهێناوە، واتە: بەڕێگەیەك یابەشێوەیەك هەتاكو ئێستا ئەو ڕێگەو شێوەیە كەس نەیگرتۆتە بەرو نەیزانیوەو پەی پێ نەبردوە.

**داهێنانیش دابەش دەبێت بەسەر دو بەشدا:**

**أ- داهێنان لەدابو نەریتەكاندا(العادات):** وەك داهێنانی داهێنراوە تازەو نوێكان، ئەوەش ڕێگە پێدراوە(المباحة)، چونكە بنەڕەت لەدابو نەریەكاندا ڕێگە پێدانە(الإباحة).

---

([٣١٨])أ ــ سورة البقرة: (١١٧).

ب ـ واتە: داهێنەری ئاسمانەكانو زەوی لەنەبونو بەبێ ئەوەی كەرەسەو ماددە سەرەتاییەكانی هەبێت، عپمان عبدالعزیز ،تەفسیری قورئانی پیرۆزب١ل١٦٤ ، وەرگێڕ.

([٣١٩])أ ــ سورة الأحقاف: (٩).

ب- داهێنان لەئاینـدا: ئـەم جۆرەیان حەرامەو بـەهیچ شـێوەیەك دروسـت نیـە، چـونكە بنەڕەت لەم بـوارەدا بڕانـەوەو وەسـتانە واتـە ڕێگـە پـێ نەدانـە(التوقيـــف)، ئەوەتـە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{من أحدث في أمرنا هذا ماليس منه فهو ردٌ}([320]).

وەلەڕیوایەتێكی تردا هاتەوە كەفەرمویەتی:{من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌ}([321]).

٢- جۆرەكانی داهێنان(أنواع البدع):

**داهێنان لەئایندا دو جۆرن:**

**جۆری یەكەم:** داهێنانی گفتـاری بیروبـاوەڕی(بدعة قولية إعتقاديـــة) ، وەكـو وتارەكـانی جەهمیو موعتەزیلەو شیعە ڕافزیەكان، وسەرتاپا گروپـە سەرلێشـێواو گومڕاكـانی تـرـو بیر و باوەڕەكانیان.

**جۆری دوەم:** داهێنان لەبەندایەتیەكاندا(العبادات)، وەك بەندایەتی كردن بۆ خـوای گـەورە كەخوای گەورە شەرعیەتی پێ نەدابێتو پێ ی ڕازی نەبێت، ئەمەش چەند بەشێكن:

**بەشی یەكـەم:** ئەو داتاشینەیە كەلەبنەڕەتی بەندایـەتی كردنـدا بێـت: بـەوەی جـۆرە بەندایەتیەك دابتاشێت كەشـەریعەتی خـوادا هـیچ بنـەماو بنـەڕەتێكی نـەبێت، وەك ئـەوە كەنوێژێكی نامەشروع دابتاشێت، یاخود ڕۆژویەك دابهێنێت كەلەبنەڕەتـدا شـەرعی نـەبێت یاخود جۆرە جـەژنو بۆنەیـەكی ناشـەرعی دابتاشـێت كەلـەئایینی خـوادا بـونی نیـە وەك جەژنو بۆنەو ئاهەنگی لەدایك بونو غەیری ئەوانەش.

**بەشـی دوەم:** ئـەو داهێنـانو داتاشـینەیە كەزیادەیـەو دەخرێتـە سـەر بەندایەتیـە مەشروعەكان، وەك ئەوەی بۆ نمونە ڕكاتی پێنجەم بخاتە سەر نوێژی نیوەڕۆ یان عەسردا .

**بەشی سێ یەم:** وەك ئەو داهێنانەی كەلە سیفەتی ئەنجامـدانی بەندایـەتی مەشـروعدا بێت: وەك ئەودی كەبەندایەتیەك لەسەر شێوەو سیفەتێكی نامەشروع ئەنجام بدات، وەك ئەنجامدانی ویردو زیكرە مەشروعەكان بەدەنگی كۆمەڵی ئاوازدار واتە بەكۆرس، هەروەها

---

([320]) أ ـ رواه البخاري ومسلم.

ب ـ واتاكەیمان لەپێردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

([321]) رواه البخاري ومسلم.

وەك توندو تیژیو زۆری لەخۆ كردن لەئەنجامدانی بەندایەتیەكان بەجۆرێك لەسنوری سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەرچێت.

**بەشی چوارەم:** بریتیە لەو داهێنانو داتاشینە كەپەیوەندە بەتایبەت كردنی كاتێك بۆ بەندایەتیە مەشروعەكان، كەشەریعەتی خوا ئەو كاتەی تایبەت نەكردوە وەك تایبەت كردنی ڕۆژی نیوەی شەعبانو شەوەكەی بەڕۆژو گرتنو شەو نوێژ تێدا كردن واتە شەوەكەی زیندو بكەیتەوە بەشەو نوێژ تێدا كردنو ڕۆژەكەی بەڕۆژو بیت، دەی بنەڕەت لەڕۆژوو شەو نوێژو زیندو كردنەوەی شەو مەشروعە واتە دروستە، وەلێ تایبەت كردنەكەی بەكاتێك لەكاتەكان پێویستی بەسەلماندنو بەڵگە هێنانەوە هەیە.

**٣ـ حوكمی داهێنانو داتاشین(البدعة) لەئاییندا بەهەمو جۆرەكانیەوە:**

هەمو داهێنانێك لەئاییندا حەرامەو گومڕاییو سەر لێشێواویە، بەگوێرەی فەرمودەی ﷺ: {وإیاكم ومحدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة}([٣٢٢])،(واتە: وریابنو زۆرتان ئاگا لەخۆ بێت لەداهێنانو داتاشینی كارو كردەوەكان، چونكە هەمو تازەگەریو داهێنانێك داتاشینە(بدعة) وەهەمو داتاشینێكیش گومڕاییو سەرلێ تێك چونە ـ وەرگێڕ ـ) ، هەروەها بەگوێرەی فەمودەیﷺ: {من أحدث في أمرنا هذا مالیس منه فهـو ردٌ} ([٣٢٣]). وەلەڕیوایەتێكی تردا هاتوە {من عمل عملاً لیس علیه أمرنا فهـو ردٌ}([٣٢٤]). ئەم دو فەرمودەیە دەلالەت لەوە دەكەن كەهەمو تازەگەریەك لەئاییندا داتاشینو داهێنانە، و هەمو داهێنانێكیش گومڕاییو سەر لێشێواویەو بەرسەر چاوی خۆی دا دەدرێتەوە، واتای ئەمەش ئەوەیە كەداهێنانو داتاشینەكان لەبەندایەتیەكانو كاروبارە بیروباوەڕیەكاندا (العبادات والإعتقادات) حەرامو قەدەغەیە، ئەم حەرامیەش بەگوێرەی جۆری داهێنانەكە دەگۆڕێت وەك لەم ڕیز بەندیەی خوارەوەدا گردیان دەكەینەوە:

١ـ هەیانە كوفری ئاشكراو ڕونە(كفر صراح): وەكو سوڕانەوە بەدەوری گۆڕەكانو ئەزرگەو مەزارەكاندا بەنیازی خۆ نزیك كردنەوە لەخاوەنەكانیان واتە ئەو مردوەی وا

([٣٢٢]) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

([٣٢٣]) متفق عليه.

([٣٢٤]) رواه مسلم.

تیایدا نێژراوە، وەپێشکەش کردنی سەربڕینو قوربانیو نەزرەکان بۆیان، هەروەها لەبەر پاڕانەوەو دوعا کردن لەخاوەنەکانیان، وەهانا بردنو پەنا بۆ بردنو مەدەد لێ یان، کردنیان هەروەها وەك قسەو گۆتەوگفتارەکانی زێدەڕەوە جەهمیەکانو موعتەزیلەکان.

٢ـ داهێنان هەیە هۆکارێکە لەهۆکارەکانی هاوبەشی دانان(الشرك)، وەك خانوو بینا دروست کردن لەسەر گۆڕو هەڵبەستنو گڵکۆ لەسەر دروست کردنو نوێژ کردنو دوعا کردن لەلای گۆڕو پیرو چاکەکان.

٣ـ داهێنان هەیە لەئایین دەرچونێکی بیروباوەڕیە(فسق إعتقادي): وەك داتاشینو داهێنانی خەوراجەکانو قەدەریەکانو مەرجەئیەکان لەگفتارو گۆتەو بیرباوەڕەکانیان کەپێچەوانە بون لەگەڵ بەڵگە شەرعیەکاندا.

٤ـ هەشیانە کەسەرپێچیو یاخی بونە(معصية): وەك داهێنان یاداتاشینی ڕەبەنایەتی واتە واز هێنان لەژن هێنانو مێرد کردن(التبتل)و بەڕۆژو بونو وەستان لەبەر خۆر، وەخۆ خەساندن بەنیازی بڕینو نەمانی ئارەزوی جوت بون(شهوة الجماع)([325]).

* بێدار کردنەوە: هەر کەسێك داهێنان(بدعة) دابەش بکات بۆ داهێنانی باشو داهێنانی خراپ، ئەوە بەهەڵە داچوەو پێچەوانەی فەرمودەی پێغەمبەرەﷺکەفەرمویەتی: {فإن كل بدعة ضلالة} چونکە پێغەمبەرﷺ حوکمی بەسەر هەمو داهێنانەکان(البدع)دا کردوە کەگومڕاییو سەر لێ تێك چونە، کەچی ئەمیش دەڵێ: هەمو بیدعەیەك گومڕایی نیە، بەڵکو بیدعەی چاك هەیە، الحافظ ابن رجب لە(شرح الأربعين)دا گوتویەتی:(فەرمودەیﷺ {كل بدعة ضلالة}لە(جوامع الكلم)ەو هیچ شتێکی لێ دەرناچێت، و بنەماو بنەڕەتێکی زۆر گەورەیە لەبنەماو بنەڕەتەکانی ئایین، ئەمە هاوواتای ئەم فەرمودەیﷺکەفەرمویەتی: {من أحدث في أمرنا ماليس منه فهو ردٌ}دەی هەر کەسێك کارێك، شتێك دابهێنێتو بیداتە پاڵ ئایین، و لەئایینیشدا هیچ بنەماو بنەڕتێکی نەبێت ئەوە بەسەر سەری خۆی دا دەشکێتەوەو گومڕاو سەرلێشێواو ماڵ وێرانە، و ئایین لێ ی بێ بەریەو ئەستۆپاکە لەئاستی دا، جائەو داتاشینو داهێنانو

([325]) بڕوانە: الإعتصام للشاطبي (٢/٣٧).

تازەگەریە لەمەسەلەو کێشە بیروباوەڕیەکاندا بێت، یاخود لەکارو کردەوەو گوتەو گفتارە دیارو نادیارەکاندا(الطاهرة والباطنة) بێت)([٣٢٦]).

ئەوانە هیچ بەڵگەو بیانویەکیان نیە کەداهێنانی چاك(بدعة حسنة) هەبێت، تەنیا ئەو فەرمودەی عمرﷺنەبێت کەلەنوێژی تەراویحدا گوتویەتی: (نعمت البدعة هذه ـ چاکترین داهێنانێکە ئەمە).

هەروەها دەڵێن: کەچەندان شتی تر داهێنراون‌و پێشینەکانیش دەنگیان نەکردوەو پێ یان نخۆش نەبوە، وێنەی کۆکردنەوەی قورئان لەیەك تاکە کتێبدا، هەروەها نوسینەوەی فەرمودەو تۆمار کردنی.

ئێمەش لەوەڵامی ئەوانەدا دەڵێین: ئەو کارانەی لەشەرعدا ڕەگو ڕیشەو بنەماو بنەڕتێکی هەبوە، و داهێنراوو تازەگەری نین، وەقسەی عمر::( نعمت البدعة ـ چاکترین داهێنان) مەبەستی داهێنانی زمانی بوە نەك شەرعی، هەر شتێك لەشەرعا ڕەگو ڕیشەی هەبێت ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەو ڕەگو ڕیشەو لەوێوەو چرۆ دەکات‌و دەژیەتەوە. ئەگەر گوترا : ئەوە داهێنانە، ئەوە داهێنانێکی زمانیەو شەرعی نیە، چونکە داهێنان لەشەرعدا هیچ ڕەگو ڕیشەو بنەمایەکی نیە، وەکۆکردنەوەی قورئانیش لەیەك تاکە کتێبدا ڕەگو ڕیشەو بنەڕەو بنەمای خۆی لەشەریعەتدا هەبو لەسەر ئەو بنەماوو ڕەگو ڕیشەیە قورئانیان کۆکردەوە لەکتێبێکدا، چونکە پێغەمبەرﷺفرمانی دەکرد بە نوسینەوەی قورئان، بەڵام نوسینەوەکەی پەرت‌و بڵاو بو، هاوەڵانﷺلەمەسحەفدا کۆیان کردنەوە بۆ پارستنی قورئان لەون بون‌و تێدا چون.

وەنوێژی تەراویح کاتی خۆی پێغەمبەرﷺئەوانە بەهاوەڵەکانی دەکرد، وەلەکۆتایی مانگدا نەدەچو خۆی لێ دەکێشانەوە لەترسی ئەوەی نەبادا نوێژی تەراویح لەسەر ئوممەتەکە فەرز بکرێت، وەهاوەڵان ﷺبەردەوام نوێژی تەراویحیان بەتەنیاو بەپەرتەوازەیی دەکرد لەژیانی پێغەمبەرﷺداو لەدوای وەفاتی پێغەمبەریش، هەتاکو ئەو کاتەی کەعمر کوڕی خەتتاب لەدوای یەك ئیمام کۆی کردنەوە هەروەکو چۆن کاتی

---

([٣٢٦])جامع العلوم والحكم ص٢٣٣.

خۆی لەدوای پێغەمبەرەوەﷺبەکۆمەڵ دەیان کرد، کەواتە ئەمە ڕەگو ڕیشەیەکی لەشەرعدا هەبو وداهێنراو نیە لەئایین دا تاپێ ی بڵێ ی ئەمە بیدعەی چاکە.

هەروەها نوسینەوەی فەرمودەش دیسان بنەماوو بنەڕەتو ڕیشەیەکی لەشەرعدا هەبو، پێغەمبەرﷺفرمانی بەهەندێ لەهاوەڵەکانی کرد کەفەرمودە بنوسنەوە، کاتێك لەم بارەوە داوای لێ کرا، ئەوە بو أبوهريرةرضي الله عنه لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺفەرمودەی دەنوسینەوە، بەسیفەتێکی گشتی لەکاتی پێغەمبەرﷺدا بەهانەی نەنوسینەوەی فەرمودەکانی ئەوە بو لەوە دەترسان نەوەکو شتی تر لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا تێکەڵ ببێت کەبەشێك نیە لەقورئان، جاکاتێ پێغەمبەرﷺ نەماو وەفاتی کرد ئیدی ئەم برو بیانو مەترسیەش نەما، چونکە قورئان ئیدی تەواو بوو چیدی نایەتە خوارەوە،و پێش وەفاتیﷺهەموی زەبتو ڕێکخراو و مەترسی نەما، ئیدی ئەمجار موسڵمانان دەستیان کرد بەتۆمار کردنو نوسینەوە فەرمودەکان لەترسی تێدا چونو گوم بونو لەناوچون، خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە لەلایەن ئیسلامو لەموسڵمانانەوە، کەبەڕاستی کتێبەکەی خوا واتە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺخۆیان پاراستو لەگەروی بی ئامانی لەناوچونو خراپەی خراپەکارانو خیانەتی خیانەتکاران پاراستیان.

******* ******* *******

قبل أن تقدم على فعل المعصية تذكر أن

الله

يـــراك ...

## بەشی دووەم

## سەرهەڵدانی داتاشین‌وداهێنانەکان لەژیانی موسڵماناندا،

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانیان

### أ- سەرهەڵدانی داهێنانەکان لەژیانی موسڵماناندا، ئەمەش دو مەسەلەی لەژێر دان:

مەسەلەی یەکەم: کاتی سەرهەڵدانی داهێنانەکان(البدع):

شێخی ئیسلام إبن تيمية رحمه الله([٣٢٧]): گوتویەتی: بزانە کەبەگشتی داهێنانەکان پەیوەستن بەزانستو زانیاری‌و بەندایەتیەکان‌و لەکۆتایی سەردەمی جێنشینە ڕاشدینەکاندا ڕویانداو سەریان هەڵدا، هەروەك چۆن پێغەمبەرﷺ لەژیانی خۆی دا ئەم هەواڵەی ڕاگەیاند کەفەرمویەتی: {من يعش منكم، فسيرى إختلافاً كثيراً، فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين}([٣٢٨]). وەیەکەمین داهێنانێك کەڕوی دا داهێنانی چارەنوس(القدر) و داهێنانی دواخستن(الإرجاء)، وداهێنانی شیعەگەرێتی، وخەوارجەکان بو، کاتێ پەرتەوازەیی‌و گروپ گروپی لەدوای کوشتنی عثمان ڕوی دا داهێنانی حەروریەتیش سەری هەڵدا، هەروەها لەکۆتایی چاخی هاوەڵاندا ، قەدەری سەری هەڵدا لەکۆتای چاخی ابن عمر وابن عباسء جابرو وێنەی ئەوان لەهاوەڵانﷺ وەمەرجەئەش لەنزیکە سەردەمی ئەوانەوە سەری هەڵدا، بەڵام جەهمیەت لەکۆتاییەکانی چەرخی شوێن کەوتوان لەدوای مردنی عمر کوڕی عبدالعزيز سەریان هەڵدا، وەڕیوایەت کراوە کەئەو واتە عمر عبدالعزيز ئاگاداری لەبارەیانەوە دابو، ئەوە بو سەرهەڵدانی جەهم لەخوراسانەوەو لەجێنشینایەتی هشام کوڕی عبدالملك دا بو.

ئائەم داهێنانانە لەسەدەی دوەمدا سەریان هەڵدا، و هاوەڵانیش هەبون‌و مابون، بەدڵنیاییەوە ئەوان ئینکاریان لەخاوەنانی ئەم داهێنانە کردوەو بەرهەڵستیان کردون، ئەمجار داتاشین‌و داهێنانی گۆشەگیری یاپەناگیری(الإعتزال) سەری هەڵدا، و فیتنەو ئاشوبو ئاژاوە کەوتە نێوان موسڵمانانەوە، وجیاڕایی‌و مەیل بەلای داهێنان‌و هەواو ئارەزو خوازی پەیدا بو، ئەمجار داهێنانی سۆفیگەرێتیش(بدعة التصوف) لەولاوە سەری

([٣٢٧]) مجموع الفتاوى (١٠/٣٥٤).

([٣٢٨]) رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

قوت کردەوە، هەروەها لەدوای چەرخە بەرێزو شکۆدارەکان داهێنانو داتاشینی دروست کردنی خانو وبینا لەسەر گۆڕەکان پەیدا بو، ئیدی بەم جۆرە تاکات بەرەو دواتر دەڕۆیشتو لەچەرخە شکۆدارەکان دور دەکەوتەوە داهێنانەکان بێ تام ترو پترو هەمە چەشنە تر دەبون.

## مەسەلەی دوەم: شوێنی سەر هەڵدانی داهێنانەکان(مكان ظهور البدع):

ولآتانی ئیسلامی لەسەر هەڵدانی داهێنراوەکاندا جیاوازن، شێخی ئیسلام ابن تيمية گوتویەتی:( شارە گەورەکان کەهاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ لێ نیشتەجێ بون، کەبریتی بون لەسەرچاوەی زانستو زانایان پێنج شار یا پێنج شوێن بون: هەردو حەرەمەکان، هەردو عراقان واتە هەردو شاری بەسرەو کوفە، وشام، کەقورئانو فەرمودە، فیقەو بەندایەتو هەرکاروبارێکی تری کەپەیوەندی بەئیسلامەوە هەبو لەوێوە دەردەچونو هەڵ دەقوڵان، وەهەر لەو ولآتانەوە داهێنانە بنەڕەتیەکان دەرچونو سەریان هەڵدا، تەنیا شاری مەدینەی پێغەمبەر ﷺ نەبێت، ئەوەتە لەکوفە شیعەو شیعەگەرێتیو ئیرجائی(الإرجـــاء) سەریان هەڵدا، دواتریش بەشوێنو ولآتانی تردا بڵاو بوەوە، هەر لەوێ قەدەریو موعتەزیلەوبەندایەتیە فاسدو خراپەکان سەریان هەڵدا، و دویش بەشوێنو ولآتانی تردا بڵاو بونەوە، هەروەها ولآتی شام بت پەرستی (النصب) و قەدەری تێدا هەبو، بەڵام جەهمیەتو جەهمیەکان لەناوچەی خوراسان پەیدا بوو شەرعیەتی بەداهێنانەکان دا.

سەر هەڵدانو پەیدا بونی داهینانەکان(البدع) بەگوێرەی دوری لەخانەی پێغەمبەرایەتیەوە بو، کاتێ جیاوازیو جودا خوازی لەدوای کوشتنی عثمان سەری هەڵدا داهێنانی حروریەتیش پەیدا بو، بەڵام مەدینەی پێغەمبەر ﷺ لەو داهێنانە پارێزراو بو، هەر چەندە هەندێ کەسی شاراوەو نادیار ی تێدا هەبون، کەلای خەڵکی سوکو ڕیسواو بودەڵەوسەر شۆڕ بون، ئەگەر کەسانێکی قەدەریشی تێدا بوبن بەڵام تێشکاوو بەزیوو کەساسو ڕیسوا بون، بەپێچەوانەی شیعەو شیعەگەرێتیو مەرجەئیەکان لەکوفە، وەموعتەزیلەکانو داهێنانی سۆفیگەرێتی(النســـاك) لەبەسرە، وەنەصەبیەکان لەشام، کەبەئاشکرا کاریان دەکرد، لەفەرمودەی ڕاستداو لەپێغەمبەرەوە ﷺ چەسپاوە کەدەجال ناچێتە ناوشاری مەدینەوە، زانستو ئیمان بەردەوامو دیار بو هەتاکو سەردەمی ملك، کەئەوان لەئەهلی سەدەی چوارەم بون)([٣٢٩]).

([٣٢٩]) مجموع الفتاوى:(٢٠/٣٠٠ـ٣٠٣).

بەڵام سێ چەرخە زێڕین و شکۆدارەکان لەناو شاری مەدینەی پێغەمبەرﷺ هەرگیز هیچ دانانێکی بەئاشکرای تێدا نەبو، و هەرگیز هیچ داهێنانێك لەبنەماو بنچینەی ئاییندا ڕوی نەداوە، هەروەکو چۆن لەشارو لەوڵاتانی تردا ڕوی داوەو سەریان هەڵداوە.

**٢ ـ هۆکارو پاڵنەرەکانی سەر هەڵدانی داهێنانەکان(البدع):**

ئەوەی کەگومانی تێدا نیە ئەوەیە کەدەست گرتن بەقورئان و سوننەت تاکە ڕێگەی خۆپارێزیە لەبیدعەو کەوتنە ناوداهێنان و گومرایی و نابوتی یەکان، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ﴾ سورة الأنعام: (١٥٣).

پێغەمبەرﷺ ئەمەی بۆ ڕون کردوینەوە لەو فەرمودەیەدا کەإبن مسعودرضي الله عنه بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ هێڵێکی ڕاستی بۆ کێشاین و فەرموی: {هذا سبيل الله ـ ئەمە ڕێگەی ڕاستی خوایە }ئەمجار چەند هێڵێکی تری لەڕاست و لەچەپی ئەو هێڵە ڕاستەدا کێشان و فەرموی: {وهذه سُبُلٌ، على كل سبيل منها شيطان يدعوا إليه ـ ئەمانەش هەمویان کوێرە ڕێن، لەسەر هەر ڕێگەیەك شەیتانێك وەستاوەو بانگەشەی شوێنکەوتن بۆ ئەو کوێرە ڕێگەیەی خۆی دەکات} ئەمجار ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾([٣٣٠]). سورة الأنعام: (١٥٣).

دەی هەر کەسێك پشت لەقورئان و سوننەت بکات، ئەوا ڕێگە گومڕاو نابوتەکان، وداهێنان و تازەگەریەکان دەیقۆزنەوەو پەلەی بۆ دەکەن و باوەشی بۆ دەگرنەوەو پێشبڕکێ ی بۆ دەکەن.

## هۆو هۆکارەکانی سەر هەڵدان و پەیدا بونی داهێنان و تازەگەریەکان (البدع) لەم چەند کاروبارانەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:

**أ ـ نەزانی و حاڵی نەبون لەحوکمەکانی ئایین:**

هەتاکو کات درێژتر ببێتەوە واتە کات و سەردەمەکان بەرەو پێشتر بڕۆن، خەڵکی

([٣٣٠]) رواه أحمد وإبن حبان والحاكم وغيرهم.

لەشوێنەوارو کاریگەریەتی پەیامی خوا دور بکەونەوەو لەچەرخی زێڕینی سەردەمی پێغەمبەری خواﷺ دور بکەونەوە، زانستو زانیاریەکان کەم دەبنەوەو بەرەو کزیو سیس بون دەڕواتو نەفامیو نەزانین باڵی تاریكو ڕەشی خۆی بەسەردا دەکێشێت، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاندوین کەفەرمویەتی:﴿من يعش منكم فسيرى اختلافاً كثيراً﴾([331]) (واتە: هەر کەسێك لەئێوە بژیەتو بمێنێتو تەمەنی باقی بێت پەرتەوازیو جاوازیو جیاڕاییەکی زۆر بەچاوی خۆی دەبینێت - وەرگێڕ)، هەروەها فەرمویەتی:{إن الله لايقبض العلم إنتزاعاً ينتزعه من العباد، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء، حتى إذا لم يبق عالماً اتخذ الناس رؤوساً جُهالاً، فسئلوا فأفتوا بغير علم، فضلوا وأضلوا}([332]). (واتە: خوای گەورە زانستو زانیاری یەکسەر لەبەندەکانیەوە ڕاناکێشێتەوە، بەڵکو زانست لەبەندەکانی دەکێشێتەوە بەکێشانەوەی زانایان واتە بەمردنی زانایان زانستو زانیاریەکانیش لەگەڵیاندا دەمرێتو لەکیس دەچێت، تابەجۆرێك وای لێ دێت کەتاکە زانایەك نامێنێت، ئەو کات خەڵکی چەندان سەری بۆگەنو نەزانو نەفامیان لەناودا دەمێننەوەو پرسیاریان لێ دەکەن ئەوانیش بێ زانستو زانیاریو نەزانیو نەشارەزایی وەڵامیان دەدەنەوە، بۆخۆشیان گومڕاو سەر لێشێواو دەبنو خەڵکیش گومڕاو سەر لێشێواو دەکەن چونکە بەهەڵەو نەزانی وەڵامی پرسیارەکانی خەڵکی دەدەنەوەو بەنەزانی کاروباری موسڵمانان هەڵ دەسوڕێنن - وەرگێڕ).

هیچ شتێك بەربەرەکانێو بەرهەڵستی داهێنانو تازەگەرێتی یەکان(البدع) ناکاتو دوژمنی باوە کوشتەیەتی تەنیاو تەنیا زانستو زانیاریو زانایانی بەڕێزی ڕاستەقینەو شارەزا نەبێت، جائەگەر زانستو زانیاریو زانایان نەمانو لەبەرچاو ون بون، ئەوا گۆڕەپان بۆ ئەو بیدعەو بیدعەکاریە بۆگەنە چۆڵ دەبێتو هەل دەڕەخسێتو سەر قوت دەکەنەوەو بەملاو بەولادا بڵاو دەبنەوەو زۆر بەخێرایی گەشە دەکەن، ئەهلو دەستەو گروپو خانەوادەکانیان چرۆ دەکەنو دەکەونە گەشە کردنو چوستو چالاك دەبنو خێرا

([331])من حديث رواه أبو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

([332]) جامع بيان العلم وفضله إبن عبدالبر(١/ ١٨٠).

دەكەونە خۆ بۆ ڕشتنی ژەهری بۆگەنیان بەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلامو پەیامەكەی خواو بەسەر موسڵماناندا.

**ب ـ شوێن كەوتنی هەواو ئارەزووەكان:**

هەر كەسێك پشتی لەقورئانو سوننەت كردو شوێن هەواو ئارەزووەكانی خۆی كەوت وەڵامی بانگەوازی پەیامبەری خوا نەداتەوە، هەروەكو خوای باڵا دەستو كار بەجێ دەفەرموێ:﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ﴾ سورة القصص: (٥٠).(واتاكەیمان لەبەشەكانی ڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ } [٣٣٣].

(واتە: ئایا ئەو كەسەت بینیوە كەلەدنیادا ئەوەی بیری لێ دەكاتەوە تەنیا خۆش گوزەرانیو ڕابواردنەو هەر خەریكی بێ ڕەوشتیو خراپەو خراپەكاریەو هەواو ئارەزوە بۆگەنەكانی خۆی كردۆتە خوای خۆی و دەیپەرستێتو جڵەوی خۆی داوەتە دەست نەفسو ئارەزووەكانی، خوای گەورەش لەزانستو عیلمی ئەزەلی خۆیەوە دەزانێت كەئەو كەسە هەر لەسەر بێباوەڕیو سەركەشیو ملهوڕی خۆی دەڕواتو دەست بەرداری نابێت، واتە زانیویەتی كەشایەنیەتی بۆیەخوای گەورە مۆری داوە لەگوێو لەدڵی لەوەی كەتازە ئیدی پەندو ئامۆژگاری وەربگرێتو تێرا بمێنێتو هۆشو گۆش بەكار بهێنێتو بگەڕێتەوە، هەروەها پەردەی تاریكو ڕەشی خستبێتە سەر چاوی لەوەی كەتازە ئیدی ڕێگەی ڕاستی پێ ببینێت، جاهەر كەسێك ئاوا بێت خوا بەو دەردەی بەرێت لەسزای ئەوەی كەخوا هەمو شتێكی بۆ ڕون كردەوەو قورئانو پەیامبەری بۆ ناردو هەمو شتێكی تێ گەیەنراو پێ ی گوترا كەئەمە ڕێگەی ڕاستی خواییەو بەرەو بەهەشتت دەباتو ئەمەش ڕێگەی چەوتی شەیتانیەو بەرەو دۆزەخت دەبات ، ئیدی تەنیا خۆی تاوانبارەو خواش لەتۆڵەی سەركەشی خۆی بەم جۆرە سزای دەدات، وبەو جۆرەی لێ كرد ئایا ئیتر لەخوای گەورە بەولاوە ئیدی كێ ی تری هەیە ڕێنومایی بكاتو هیدایەتی بداتو كێ هەیە بێجگە

---

[٣٣٣] سورة الجاثية: (٢٣)

لەخوای پەروەردگار بیخاتەوە سەر ڕێگەی ڕاستی خوایی؟!! وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٣ل١٣١٣. هەروەها لەتەفسیری قورئانی پیرۆز لەنوسینی مامۆستا ملا عثمان عبدالعزیز ب١٣ل١٤٤). دەی گومانی تێدا نیە کەداهێنان‌و تازەگەریتی لەئاییندا(البدع) تەنین‌و چنین‌و دارشتنی دەستی هەواو ئارەزوی بۆگەنی شوێنکەوتوە.

ج - دەمارگیری‌و پەیوەست بون بەڕاو بیرو بۆچونەکان‌و کەسەکانەوە:

دەمارگیر بون‌و پەیوەست بون بەڕاوبیرو بۆچونەکان‌و کەسەکان دەبنە کۆسپ‌و تەگەرە لەنێوان مرۆڤ وشوێنکەوتنی بەڵگە شەرعیەکان‌و دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست‌و دۆزینەوەی ڕاستیەکان، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا ﴾ سورة البقرة: (١٧٠).(واتاکەیمان لەبەشەکانی ڕابردودا نوسیوە - وەرگێڕ).

دەی ئەمە پیشەی دەمارگیرەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانە، لەهەندی لەشوێنکەوتوانی سۆفیگەرێتی‌و گۆڕ پەرستان(المقبوريين) ئەگەر داوایان لێ بکرێت و پێ یان بگوترێت: بابە وەرن شوێن قورئان‌و سوننەت بکەون‌و واز لە ڕێگە چەوت‌و لاڕێکان بهێنن، چونکە ئەو ڕێگەیەی ئێوە گرتوتانە هەڵەیەو بەرەو هیلاکیتان دەبات، ئەوان تەنگە تیلە دەبن‌و خەریکە سینگە کوژێ بیان گرێت‌و ئیدی پەنا دەبەنەبەر بەڵگە هێنانەوە بەڕێبازو مەزهەبەکانیان، بەشێخەکانیان‌و بەباوك‌و باپیرانیان و ئەو ڕێگەی کەئەوان لەسەری دەڕۆیشتن‌و دەڵێن بۆ گوایە ئەوان هەمویان هەڵەو لاڕێ بون؟!!

د - خۆ چواندن بەکافران:

ئەم جۆرە داهێنانە بەهێزترین‌و قێزەونترین داهێنانێکە کەتێ ی کەوتون‌و تێ ی دەکەون، هەروەکو لەفەرمودەی أبي واقد الليثي دا هاتوە کەگوتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حنین دەرچوین، ئێمە ئەو کات تازە موسڵمان بو بوین‌و زۆر دور نەکەوتبوینەوە لەسەردەمی کافریماندا، هاوبەش پەیدا کەران درەختی تاوگیان(سدرة) هەبو بۆی دەچەمانەوەو کرنوشیان بۆ دەبردو چەك‌و چۆڵەکانیان پێدا هەڵ دەهاوەسی لەبەر بەپیرۆز دانانی ئەو درەختەو پێ یان دەگوت:(ذات أنواط - پێدا هەڵواسراو)، جابەلای ئەو درەختەدا تێ پەڕین‌و ئێمەش گوتمان: ئەی ڕەسولی خوا: تۆش ئاوا

شتێكمان بۆ دابنێ یا شت پێدا هەڵواسراوێكمان بۆ دبنێ هەروەك چۆن ئەوانە شت پێدا هەڵواسراوی خۆیان هەیە، پێغەمبەرﷺفەرموی:{الله اكبر، إنها السنن! قلتم ـ والذي نفسي بيده ـ كماقالت بنو إسرائيل لموسى:﴿ اجْعَل لَّنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾[٣٣٤]. كتركبنَّ سنن من قبلكم}[٣٣٥] (واتە: ئەوەی كەگوتتان لەیاساو رێساورێبازو باوەڕو ئایینەكانن! سوێندم بەو كەسەی كەگیانی منی بەدەستە ـ ئەمە هەمان داواو هەمان قسەو هەڵەی بەرەی ئیسرائیلیەكان بو كەبەموسایانو گوتو داوایان لێ كرد، ﴿ئەی موسا تۆش پەرستراوێك بۆ ئێمە دەست نیشان بكە هەروەكو چۆن ئەوانە پەرستراوێكیان هەیەو لەگەڵ خوادا دەیپەرستن، موسا پێ ی گوتن: بەڕاستی ئێوە گەلێكی نەفامو نەزانو بێ سەوادن﴾. ئێوەش خەریكە سواری رێچكەو یاساو دەستورەكانی گەلانی پێش خۆتان دەبنو چاو لەو كافرو بێباوەڕو هاوەڵ بۆ خوا دانەرانە دەكەن. وەرگێڕ).

لەم فەرمودەیەدا دەردەكەوێت كە: خۆ چواندن بەكافران ئەو سیفەتە بو كەوای لەبەرەی ئیسرائیلیەكان كرد كەداوای ئەو داواكاریو داخوازیە پیسو بۆگەنە بكەن، ئەویش ئەوە بو داوایان لەموسا(عليه السلام) كرد كەپەرستراوێكیان بۆ دابنێت كەلەگەڵ خوادا بیپەرستن، هەر ئەو فیكروبۆچونە بۆگەنەش بو وای لەهەندێ لەهاوەڵانی محمدﷺكرد كەداوای لێ بكەن كەدرەختێكیان بۆ دەست نیشان بكات كەجگە لەخوا بەپیرۆزی بزانو شتەكانی خۆیانی پێدا هەڵ بهاوەسنو بەنیازی ئەوی كەبۆیان بپارێزێت، ئەمەش هەمان واقعی ئەمڕۆیە، كەزۆرینەی موسڵمانان ئەمڕۆ لاسایی كافرانو هاوەڵ دانەران دەكەنەوە لەكارە هاویەش دانانو كارە داهێنانو تازەگەریەكانیاندا(البدع والشركيات)وەك جەژنەكانی لەدایك بونەكان(الموالد)، تەرخان كردنی رۆژانو هەفتەكان بۆ كارە تایبەتیەكان(مخصصة)، وەئاهەنگەكان بەبۆنە ئایینیو یادەوەریەكان(الدينية والذكريات)، وە دانانو چەسپ كردنی وێنەو پەیكەرەكان(التماثيل)ن وەچەسپ كردنی پەیكەرە یادەوەریەكان(التذكارية)، وەبەرپا كردنی شینو شەپۆریەكانو پرسەكان، داهێنانەكانی(بدع) كەپەیوەندن بەتەرمەكانو مردوەكان، دروست كردنی خانوو هەڵبەستنی گۆڕەكانو، كەلێ كارو كردەوەو شتی تری لەم جۆرانە.

---

([٣٣٤]) الأعراف:١٣٨.

([٣٣٥])رواه الترمذي وصححه.

## بەشـی سێ یەم

## هەڵوێستی ئوممەتی ئیسلامی لەبەرامبەر داهێنەران، ومەنهەجی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەبەرپەرچ دانەوەیاندا.

### ١- هەڵوێستی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەبەرامبەر داهێنەران(المبتدعه):

تاکو ئێستاش بەردەوام ئەهلی سوننەتو جەماعەت بەرپەرچی داهێنەران دەدەنەوە، ناڕەزایی دەردەبڕن لەبەرامبەر ئەو کاری داهێنانو تازەگەریە قێزەونە کەئەنجامی دەدەن، وهەمیشە ئامۆژگاریان دەکەنو قەدەغەیان دەکەن لەئەنجامدانیانو دەیانگێڕنەوە لەو خراپەکاریە، ئەمەش چەندان نمونە لەم بوارەوە:

(أ) لەأم الدرداء وە کەگوتویەتی:أبو الدرداء بەتوڕەییەوە هاتە لام، پێم گوت: ئەوە چیتە؟گوتی: (واللە من شتێك لەبارەی ئەوانەوە لەکاری محمد نازانم تەنیا ئەوە نەبێ ئەوان هەر هەمویان نوێژ دەکەنو نوێژکارن)([٣٣٦]).

(ب) لەعمر کوڕی یحیی وەدەگێڕنەوە کەگوتویەتی:( من گوێم لەباوکم بو ئەویش لەباوکیەوە کەگوتویەتی: ئێمە لەبەر دەرگای عبداللە کوڕی مسعود لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا دانیشتبوین ، کەهاتە دەرەوە لەگەڵی دا بەپێیان بۆ مزگەوت دەڕۆیشتین، أبو موسی الأشعري هات بۆ لامان، وگوتی: ئایا أبو عبدالرحمن هێشتا نەهاتۆتە بۆ لاتان؟ گوتمان: نەخێر، ئیدی لەگەڵمان دانیشت هەتاکو هاتە دەر، جاکاتێ هاتە دەر هەمومان لەبەری هەستاین، گوتی: ئەی أبا عبدالرحمن، من پێشتر لەمزگەوتدا کارێك، شتێکم چاو پێ کەوت کە بەدڵم نەبوو بەدڵم نەبو(أنكرته) وەهیچ شتێکم نەدی - سوپاس بۆ خوا - لەچاکەو خێر بەولاوە، گوتی: چی بو ئەوەی دیتت؟ گوتی: ئەگەر بژیەیتو تەمەنت باقی بێت دەیبینی، ئەمجار گوتی: لەو مزگەوتەدا بینیم گەلێك یاگروپو کۆمەڵێك بەزنجیرە دانیشت بونو چاوەڕوانی نوێژیان دەکرد، لەهەر زنجیرەیەکدا کەسێك هەبو، ئەوانیش هەمویان وردە بەردیان لەچنگدا بو پێ ی دەگوتن: سەد جار (اللە أكبر) بکەن، ئەوانیش دەستیان دەکرد بە(اللە أكبر) کردن تاسەد جارەکە تەواو دەبو، ئەمجار پێ ی دەگوتنەوە

---

([٣٣٦]) رواه البخاري.

سەد جار(لا إله إلاّ الله) بكەن، ئەوانیش سەد جار(لاإلــه إلاّ الله) یان دەكرد، ئەمجار پێ ی دەگوتن: سەد جار(سبحان الله) بكەن، ئەوانیش سەد جار(سبحان الله)یان دەكرد، ئەمجار أبـا عبدالرحمن گوتی: باشە تۆ چیت پێ گوتن؟ گوتی: من هیچم پێ نەگوتن تاپرسیار لەتۆ دەكەمو چاوەڕوانی ڕای تۆ بوم، یاچاوەڕوانی فرمانی تۆ بوم، أبـا عبـدالرحمن گوتی: تۆ فرمانت پێ نەكردن جارێ ئێوە گوناحو تاوانو خراپەكانی خۆتان بژماردایە، ومسۆگەریو گرێنتی ئەوەشت دابانایە كەدڵنیا بن هەرگیز هیچ شتێك لەچاكەكانیان لای خوا گوم نابێتو مەترسی ئەوەیان نەبێت؟

ئەمجار ڕۆیشتو ئێمەش لەگەڵی دا ڕۆیشتین، هەتاكو هاتە لای زنجیرەیەك لەو زنجیرانە، لەسەریان وەستاو گوتی: ئەوە چی یە كەدەتان بینم دەیكەنو ئەنجامی دەدەن، ئەدی ئەوە چی یە لەدەستتان دایە؟ گوتیان: ئەی باوكی عبدالرحمن، ئەوە وردە بەردنو تەسبیحاتیان پێ دەكەین واتە(الله أكبر، و لاإله إلاّ الله، وسبحان الله، والحمـد لله)ی پێ دەژمێرین. گوتی: دەی ئێوە گوناحو تاوانو خراپەكانی خۆتان بژمێرنو بزانن چیتان كردوە، من مسۆگەریو گرێنتیتان دەدەمێو دڵنیاتان دەكەم كەهیچ شتێك لەچاكەكانتان لای خوا گوم نابێتو دەیبیننەوە، هاوار بۆ ئێوە ئەی ئوممەتی محمد، چی بو وازو بە هیلاكی بردن، ئائەمە هاوەڵانی پێغەمبەرن كە هێشتا هەر ماونو زۆرن(متوافرون)، وەئەمەش جلەكانی پێغەمبەرەﷺ هێشتا كۆن نەبون، و ئەمەش قاپو قاپاغەكانیەتی هێشتا نەشكاون، سوێندم بەو كەسەی كەگیانی منی بەدەستە: ئێوە ئێستا بەم كارەتان لەسەر ڕێبازو ئایینێكن گوایە لەئایینو ڕێبازی محمد باشترو ڕاسترە، بەواتایەكی تر ئێوە وا خەریكە دەرگاكانی گومڕاییو سەر لێ تێك چون دەكەنەوە. گوتیان: والله ئەی باوكی عبدالرحمن، هیچ مەبەستێكمان نیە تەنیا چاكەو خێر نەبێت، گوتی: ئەی نازانن چەندان كەس كە مەبەستیان چاكەو خێر بوە لەكارەكانیاندا بەڵام نەیان پێكاوە! پێغەمبەری خوا ﷺپێمانی فەرمو گەلێك یان كەسانو دەستەو كۆمەڵانێك هەن قورئان دەخوێنن بەڵام لەگوێكانیان تێ ناپەڕێت واتە لێ یان وەرناگیرێت، سوێند(أيم) بەخوا نازانم لەوانەیە ئەوانە زۆربەیان لەئێوە بن، ئەوجار لەلایان ڕۆیشت. عمرو كوڕی سـلمة گوتی: لەڕۆژی نەهرەواندا بینیمانن ئەوانە هەمویان لەگەڵ خەوارجەكاندا تێ یان دەسرەواندین(يطاعوننا) (٣٣٧).

(٣٣٧) رواه الدارمي.

(ج) پیاوێك هاتە لای مالك كوڕی أنس ـ رحمه الله ـ وگوتی: لەكوێ ئیحرام ببەستم؟ گوتی: لەشوێنی ئیحرام بەستن كەپێغەمبەری خواﷺبۆی دەست نیشان كردوین ئیحرام ببەستە، پیاوەكە گوتی: ئەدی ئەگەر لەدور تری ئەو شوێنە ئیحرامم بەستبێت، مالك گوتی: وای نازانم، گوتی: چ لەوە دەترسی؟ گوتی: لەفیتنە لێت دەترسم، گوتی: چاچ فیتنەیەك دەبینی لەوەدا كەكاری خێرو چاك پتر بكرێت؟ مالك گوتی: خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ:﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ ([٣٣٨])، (واتە: ئاگادارو وریای ئەو كەسانە بكەوە كەبێ فرمانیو سەرپێچیو بێ گوێی پێغەمبەر دەكەن كەلەوانەیە هەر لەدنیادا توشی بەڵاو ناخۆشی یان بكات یاخود لەڕۆژی دوایی دا توشی ئازارو ئەشكەنجەیەكی زۆر توندو تیژو بەسوێ یان بكات ـ وەرگێڕ). ئەدی چ فیتنەو ئاشوبێك لەوە گەورە ترە كەتۆ بەكەیفی خۆتو بەئارەزوی خۆت خێرو چاكەیەك دەست نیشانو تایبەت بكەیتو دای بهێنیت كەپێغەمبەری خواﷺ دەست نیشانو تایبەتی نەكرد بێت بۆ موسڵمانانو فرمانی خواو پێغەمبەریﷺخوای لەسەر نەبێت)([٣٣٩]).

ئەم نمونەیە، هەتاكو ئێستاش سوپاس بۆ خوای گەورە زانایان لەڕوی داهێنەراندا (المبتدعـــة) لەهەمو كاتو زەمینەیەكدا بەكاری دەهێنن.

**٢ـ پەیرەوو پرۆگرامـی(مـنهج) ئـەهلی سـوننەتو جەماعـەت لەبەرپـەرچ دانـەوەی ئـەهلی داهێنان(البدع):**

پەیرەوو پرۆگرامی ئەوان لەم بوارەدا لە قورئانو سوننەت داڕێژراوە، كەبریتیە لەپەیرەوو پرۆگرامێكی سەلمێنەرو ڕازی بەخشو دەمكوتكەرو قسەبڕو بەهانە بڕ، كەهەمو گومانێكی داهێنەران ڕەت دەكەنەوەو هەڵدەوەشێنێتەوە، لەقورئانو سوننەت ڕێنومایی دەكەنو پێشەنگیو چاوساغی دەكەن لەسەر واجب بون و پابەند بونو دەست گرتن بەسوننەتەوە، وقەدەغە كردنو بەرگرتن لەداهێنانو تازەگەریەكان(البدع والمحدثات)، و لەم بوارەدا گەلێ كتێبو چاپكراویان بڵاو كردۆتەوە، وەلەكتێبو چاپكراوە بیروباوەڕیەكانی (العقیـدة) خۆیاندا بەرپەرچی شیعەكانو خەوارجەكانو جەهمیەكانو موعتەزیلەكانو ئەشعەریەكانیان داوەتەوە، لەوتارو نوسینانە داهێنانیەكانیان كەلەبواری بنەڕەتەكانی بیروباوەڕو ئیماندا، كتێبو چاپكراو

---

([٣٣٨]) سورة النـــور: (٦٣).

([٣٣٩]) أبو شامة لەكتێبی(الباعث على إنكار الحوادث) دا ئاماژەی پێ كردوەو لەأبی بكر الخلال ڕاگواستوە.

گەلێکی تایبەتیان لەم بوارەدا داناوە واتە نوسیوە، هەروەکو ئیمامی أحمد (كتاب الرد)ی لەسەر جەهمیەکان نوسیوە، هەروەها بێجگە لەئیمامی أحمد پێشەواکانی تر کتێبو چاپکراویان لەم بوارەدا نوسیوە وەك عثمان کوڕی سعيد الدارمي، هەروەکو لەکتێبەکانی شێخی ئیسلام ابن تيمية و قوتابیەکەی ابن القيم، وشێخ محمحد کوڕی عبدالوهاب، وغەیری ئەوانیش کەبەرپەرچی ئەو گروپو دەستە داهێنەرو بیدعەچیو گۆڕپەرستانوسۆفیەکانیان داوەتەوە، بەلام کتێبەکانی تایبەت بەبەرپەرچ دانەوەی ئەهلی بیدعە نوسراون گەلێك زۆرن، لەوانە بۆ نمونە لەکتێبو چاپکراوە کۆنەکان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گردیان دەکەینەوە:

١. کتێبی( الإعتصام)لەنوسینی ئیمامی الشاطبي.
٢. کتێبی( إقتضاء الصراط المستقيم) لەنوسینی شیخی ئیسلام( ابن تيمية)، کەتیایدا* بەشێکی زۆری بۆ بەرپەرچ دانەوەی داهێنەرانو تازەگەری خوازان تەرخان کردوە.
٣. کتێبی(إنكار الحوادث والبدع) لەنوسینی أبي شامة.
٤. کتێبی (الحوادث والبدع) لەنوسینی طرطوشي.
٥. کتێبی (الباعث على إنكار البدع والحوادث) لەنوسینی أبي شامة.

* وە کتێبو چاپکراوە هاوچەرخەکان لەم ریز بەندیەی خوارەوەدا دەگوشین:

١. کتێبی(الإبداع في مضار الإبتداع) لەنوسینی شێخ علي محفوظ.
٢. کتێبی(السنن والمبتدعات المتعلقة بالأذكار والصلوات) لەنوسینی شێخ محمد کوڕی أحمد الشقيري الحوامدي.
٣. نامیلکەی(التحذير من البدع) لەنوسینی شێخ عبدالعزيز بن باز.

هەتاکو ئێستاش زانایانی موسڵمانان - سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە - داهێنانو تازەگەریەکان(البدع)وەلا دەنێنو زۆر ڕقیان لێ دەبێتەوەو بەرپەرچی داهێنەرانو تازەگەرخوازان(المبتدعة) دەدەنەوە لەمیانەی ڕۆژنامەکانو گۆڤارەکانو ئێستگەو ڕادیۆ دەنگەکان ووتارەکانی ڕۆژانی هەینیو موحازەرەکانوکۆڕو کۆبونەوەو لێدوانەکان، کەبەڕاستی شوێنەوارو کاریگەریەکی یەکجار زۆریان هەبوەو هەیە لەوریا کردنەوەو هۆشیار کردنەوەو بەئاگا هاتنەوەی موسڵمانان، وکۆتایی پێ هێنانو دەست گرتن بەسەر داهێنانو تازەگەریەکاندا، بێ دەنگ کردنو دەمکوت کردنەوەی داهێنەران(المبتدعين).

## بەشــی چوارەم

## ڕونکردنەوەی نمونەکانی داهێنراوە هاوچەرخەکان( البدع المعاصرة ):

ئەم لقەش ئەم بەشانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

١ ـ ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ.

2 ـ بەپیرۆز دانانی شوێنەکانو شوێنەوارو مردوانو واتە مەزارو پیرو نەزرگەکان و لەم جۆرانە.

٣ ـ داهێنانەکان لەبواری بەندایەتیەکانو خۆنزیك کردنەوە لەخوای گەورە.

داهێنانـە هاوچـەرخەکان گـەلێك زۆرن بـەهۆی تـێ پـەڕ بـونی کـاتو دور کەوتنـەوە لەچـەرخی زێڕینـی سـەردەمی پێغەمبـەرﷺ،و بـەهۆی کـەم زانسـتیەوە کەمەبەسـت لەزانسـتو زانیـاری ئـایینی ئیسلامو شـەریعەتی خوایە، وەزۆری بانگەشـەکارانی داهێنـانو سەرپێچیویاخی بونەکان(البدع والمخالفات)، تەنینەوەو تەشـەنە کردنـی خۆچـواندن بـەکافران لەخوو ڕەوشتو نەریتو ئاکارەکانیان بەپشت ڕاستی فەرمودەیﷺ: {لتتبعنَّ سنن مـن کـان قبلکم }[٣٤٠]

### ١ـ ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ:

ئەمەش خۆ چـواندنە بـەگاورەکان(النصارى) لەکارێکدا کـەپێ ی دەگوترێت ئاهـەنگ گێڕان بەبۆنەی لەدایك بونی مەسیح، ئیدی موسڵمانە نەفامەکان، یاخود زانا گومڕاو سەر لێ تێکچوەکان لـەمانگی ڕەبیعی یەکـەم یالەمانگـەکانی تـردا لەهـەمو ساڵێکدا بەبۆنـەی لەدایك بونی پێغەمبەر محمدﷺیادی دەکەنەوە. جاهەیانە لەمزگەوتەکانـدا ئاهـەنگی بۆ دەگێڕن، وەهەیانە لە ماڵەکاندا ئاهەنگی بۆ ساز دەکەن، یاخود لەهەر شوێنێکی تـر بێـت بۆ ئەو مەبەستە ئاهەنگ دەگێڕن، خـەڵکانێکی زۆریش لەخـەڵکی سـادەو ڕەشۆکی لێ ی گـردو کۆ دەبنـەوە، ئـەم کـارە ئـەنجام دەدەن بەچـاو کـردن لـەگاورەکان لـەداهێنانو داتاشینی ئاهەنگیان بەبۆنەی لەدایك بونی مەسیح ـ سەلامی خوای لەسەر بێت،وەبەزۆری وایە کەئەم ئاهـەنگ گێڕانە سەرباری ئەوەی کەکارێکی داهێنراوو تازەیـە لەئایینـدا، وخـۆ

---

([٣٤٠])رواه الترمذي وصححه.

چواندنه به‌گاوره‌كان، بێ به‌ش نیه له‌بونی هاوبه‌شی دانانو شتی خراپو گوناح كردن، وه‌ك گوتنو تێدا خوێندنه‌وه‌ی هۆنراوه‌ی چامی(إنشـــاد القصـــائدي) كه‌پڕیه‌تی له‌زێده ڕه‌ویو پێ ڕاكێشان پتر له‌به‌ره له‌مافی پێغه‌مبه‌رﷺ بۆ پله‌یه‌ك زۆر سه‌رو تر له‌پله‌و ئاستی پێغه‌مبه‌رﷺكه‌بریتیه له‌دوعاو داوا كردن له پێغه‌مبه‌رﷺ پاڕانه‌وه به‌غه‌یری خوای گه‌وره، هاناو په‌نا بۆ بردنی، ئه‌وه‌ته پێغه‌مبه‌ر ﷺ قه‌ده‌غه‌ی زێده ڕه‌ویو پێ لێ هه‌لكێشان له‌مه‌دحو وه‌سفی ئه‌ودا؟ فه‌رمویه‌تی : { لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، إنما أنا عبد، فقولوا: عبدالله ورسوله}([٣٤١]).(واته: زێده ڕه‌وی له‌مه‌دحو وه‌سفی مندا مه‌كه‌ن ئه‌وه‌نده‌م به‌رز مه‌كه‌نه هه‌روه‌كو چۆن گاوره‌كان كوڕی مه‌ریه‌میان به‌رز كرده‌وه‌و زێده ڕه‌ویان تێدا كرد، به‌لكو منیش وه‌ك ئێوه به‌نده‌یه‌كی خوام، پێم بلێن به‌نده‌ی خواو پێغه‌مبه‌ری خوا. وه‌گێڕ). گومانی تێدا كه تێكه‌لاوی پیاوو ئافره‌تانو بێ ڕه‌وشتی تێدا ڕو ده‌ده‌اتو مادده سه‌رخۆشكه‌ره‌كانو غه‌یری ئه‌وانه‌شی تێدا ده‌رده‌كه‌نو ده‌خورێنو ده‌خورێنه‌وه.

(الأطراء)واته: زێده ڕه‌وی پێ تێ په‌ڕاندن له‌سنور له‌مه‌دح كردنو وه‌سف كردندا، وه له‌وانه‌یه بڕواشیان وابێت كه‌پێغه‌مبه‌رﷺله‌و ئاهه‌نگه‌یاندا ئاماده ده‌بێت، وه‌له‌خراپیه‌كانی ئه‌وه‌یه كه‌هاوڕێ له‌گه‌ل ئه‌و ئاهه‌نگانه‌دا سرودی كۆڕسی ئاوازدارو ته‌پلێ لێدان، و غه‌یری ئه‌وانه‌ش له‌كاری ویردو زیكره سۆفیه داهێنراوه‌كانی تێدا ساز ده‌كرێتو ده‌گوترێن، هه‌روه‌ها تێكه‌لی پیاوانو ئافره‌تان، كه‌ده‌بێته هۆی ڕودانی فیتنه‌و ئاشوب گه‌لێك، وبه‌ره‌و ڕو دانی خراپه‌و خراپه كاری سه‌رده‌كێشێت، ده‌ی خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌م ئاهه‌نگه هه‌مو ئه‌م شتانه‌شی تێدا نه‌بێت كه‌باس كران، ته‌نیا كۆبونه‌وه‌و كرد بونه‌وه‌ی خه‌لكیو نان خواردنو ده‌ر برینی خۆشیو شادی بێت ـ هه‌روه‌كو ده‌لێن ـ، خۆ هه‌ر داهێنراوێكی تازه‌یه(بدعة محدثة)( هه‌مو كارێكی تازه له‌ئاییندا داهێنانه، هه‌مو داهێنانێكیش گومڕاییو سه‌ر لێشێواویه)، هه‌روه‌ها هۆكارێكه بۆ گه‌شه كردنو پێوه چون، و ئه‌وه ڕو ده‌دات كه‌له‌ئاهه‌نگه‌كانی تردا ڕو ده‌دات له‌خراپه‌و خراپه‌كاریو سه‌رپێچی و یاخی بونی خوا.

---

([٣٤١]) رواه الشيخان.

وەگوتمان: ئەمە بیدعەیە، چونکە نەلەقورئانو لەسوننەتداو نەلە کاری پێشینەی چاکو لەچەرخە باشو سەروەرەکاندا هیچ ڕەگو ریشەو بنەمایەکی نیە، بەڵکو لەم دواییانەداو لەچەرخی چوارەمی کۆچی دا داتاشراوەو هێنراوەتە ناوئایینەوە، فاطمیە شیعەکان دایان هێناو دایان تاشیو خستیانە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، ئیمامی أبو حفص تاج الدين ـــ رحمه الله) گوتویەنی:( لەدوای ئەمە: پرسیاری کۆمەڵێك لەپیرۆزبایی کاران لەو گرد بونەوەو کۆبونەوانەی کەهەندێ لەخەڵکی لەمانگی ڕەبیعی یەکەمادا سازو ئەنجامی دەدەن، کەناویان لێ ناوە یادی لەدایك بون(المولد) دوبارەو چەند بارە بونەوە، ئایا هیچ بنەڕەتو بنەمایەکی لەئاییندا هەیە؟ کەوەلامێکی ڕاستو ڕەوانو ڕونیان لەم بارەوە دەویست، هەروەها ڕونکردنەوەیەکی دیاریکراوو تایبەت دەربارەی ئەو بۆنەیەیان دەخواست، منیش گوتم ـ پشت بەخوا ـ:

نەم زانیوە کەئەم ئاهەنگی یادی لەدایك بونە هیچ بنەڕەتو بنەمایەکی لەقورئانو سوننەتدا هەبێت، هەروەها کار پێ کردنی لەهیچ زانایەك لەزانا بڕوا پێکراوەکانی ئوممەتی ئیسلامی، ئەوانەی کەپێشەنگو ڕابەر بون لەم ئایینەدا، ودەست گرتو بون بەزانستو زانیاریەکانو شوێنەوارەکانی پێش خۆیان ڕانەگوێزراوەو ئەمەیان بەئێمە نەگوتوە، بەڵکو کارێکی تازەیەو باتڵخوازەکان دایان تاشیوەو واتە بیدعەیە، وەهەواو ئارەزو بازیە چڵێسو کاسە لێسەکان وەك هۆکارێك بۆ خواردنی ماڵی خەڵکی سادەو ساویلکە بەناهەق بەکاریان هێناوە([٣٤٢]).

شێخی ئیسلام ابن تيمية رحمه الله گوتویەتی:(وەهەروەها ئەوەی کەهەندێ لەخەڵکی دای دەهێننو دای دەتاشن، یان خۆچوندانو لاسایی کردنەوەو چاو کردنە لەگاورەکان لەیادی لەدایك بونی عیسا عليه السلام ، وەیان خۆشەویستیە بۆ پێغەمبەرﷺو بەگەورە دانانی... لەدانانی ڕۆژی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ بەجەژنو یاد کردنەوەو ئاهەنگ تێدا گێڕانی، لەگەڵ جیاوازیو جیا ڕایی موسڵمانان لەڕۆژی لەدایك بونی دا( واتە: زانایانی ئیسلام هەتاکو لەدەست نیشان کردنو چەسپاندنی ڕۆژی لەدایك بونەکەشی دا جیاڕانو

([٣٤٢]) رسالة المورد في عمل المولد.

بەتەواوی ڕون نیەو نەچەسپاوە ، جاچ جای ئەوەی هەتاکو ئەو ڕۆژە بکەن بەجەژن‌و یاد کردنەوەو ئاهەنگو بەزم تێدا گێڕان‌و داهێنانی سەدان کارو کردەوەی هەواو ئارەزو بازی لەو ڕۆژە داهێنراوو داتاشراوەدا یان ڕۆژەکەی تایبەت بکەن بەتێدا بەڕۆژو بون‌وزیندو کردنەوەی شەوەکەی بەعیبادەت کردن کەخەڵکێکی زۆریان پێ چەواشە کردوەو بەتەواوی دەقیان پێوە گرتوەو تازە ئیدی زۆر بەزەحمەت تێدەگەن‌و لەمێشکی یان دێتە دەر گوایە خوای گەورە لێ یان وەردەگرێت پاداشتیان دەداتەوە، نەخێر بەپێچەوانەوە لەبری ئەوەی بچێتە بەهەشت دەبێ بچێتە ناو ئاگری دۆزەخ بەپێ ی فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺ کەفەرمویەتی: { كل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار}- وەرگێڕ)، ئەم کارە پێشینەکانﷺ نەیان کردوە، جائەگەر ئەوە چاکەو خێرێکی کاکڵەو ڕاست بایە، ئەوە پێشینەکان ﷺلەئێمە لەپێشترو شایستە تر بون کەئەو کارە ئەنجام بدەن، خۆ ئەوان لەئێمە پتر پێغەمبەریانﷺخۆشتر دەویستو لەئێمە پتر ڕێزیان دەگرت، وەئەوان لەئێمە سور تر بون بۆ کردنی کاری خێرو چاکە، ئەدی بۆ ئەوان نەیان کرد؟ ئاخر خۆشەویستی‌و ڕێز گرتن بۆ پێغەمبەرﷺ بەو جۆرە کارە خراپانە دەرنابڕدرێت، نەخێر بەڵکو دەربڕینی ڕێزو خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرﷺ بەشوێن کەوتن‌و گوێ ڕایەڵی‌و جێ بەجێ کردنی فرمانەکانی‌و زیندو کردنەوەی سوننەتەکانی بەپەنهانی‌و بەئاشکرا دەبێت، هەروەها بڵاو کردنەوەو ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەی کەپێ ی ڕەوانە کراوە، هەروەها تێکۆشان لەو پێناوەدا بەدڵ‌و بەدەستو بەزمان، ئائەمە ڕێبازو ڕێڕەوی ڕابردوانە واتە پێشینە سەرەتأکانمان لەکۆچ کاران‌و پشتیوانان‌و ئەوانەشی کەبەچاکە شوێنیان کەوتون و شوێن پێ یان هەڵ گرتونەوە)([٣٤٣])... تەواو بو قسەکانی شێخی ئیسلام ابن تيمية رحمه الله بەهەندێ کورت کردنەوە.

هەروەها لەئینکار کردن‌و بەرپەرچ دانەوەی ئەم داهێنانە(البدعة)یەدا زۆرێك لەکتێبو نامیلکەکان کۆن‌و نوێ دانراون، ئەم داهێنانە سەرباری ئەوەی کەبیدعەو خۆچواندنە، دەبێتە ئەگەری سەر هەڵدان‌و بەرپا کردنی چەندان ئاهەنگو یادەوەری تری وەك یادی

---

([٣٤٣]) إقتضاء الصراط المستقيم(٢/٦١٥) بەتەحقیق کردن‌و پێداچونەوەی دکتۆر ناصر العقل.

لەدایك بونی پیاو چاکان‌و وەلیەکان‌و شێخەکان‌و سەرکردەوو بەرپرسەکان (هەتاکو گێرانی ئاهەنگی یادی لەدایك بونی هەمو کەسێك‌و شیرینی‌و شەکراو خوا خواردنەوە لەهەمو خانەوادەیەك‌و لەهەمو ماڵێکدا بەبۆنەی لەدایك بونی کوڕەکەیان یان کچەکەیان هەروەکو لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەچاوی سەری خۆمان دەیبینین. وەرگێڕ)، دەی ئەم کارە قێزەونە دەبێتە ئەگەری کردنەوەی دەرگاکانی شەڕگەل‌و خراپ گەلێکی زۆر لەناو موسڵماناند ا (٣٤٤).

(٣٤٤) بەداخەوە هەمو ساڵێك وێڕای هۆشیار کردنەوەی کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمانان لەلایەن زۆرێك لەزانا پایە بەرزو بانگەشەکارانی بەڕێزی ڕێگەی ڕتستەقینەی خوایی واتە قورئان‌و سوننەت لەبەرنامەو شەریعەتی خوا گەیشتو لەم بوارەو لەگشت بوارەکانی تری شەریعەتی خوادا، کەچی موسڵمانان بەعەوام‌و ناعەوامەکانیشەوە ساڵانە یادی ئەو ڕۆژی بەناو لەدایك بونە واتە ١٢ڕەبیعی یەکەمدەکەنەوە، هەروەك چۆن فێر کراون‌و لەسەر ئەم بیدعە خراپە ڕاهێنراون وا دەقیان پێوە گرتوەو بەهیچ شێوەیەك دەست بەرداری نابن‌و وازی لێ ناهێنن‌و مێشکیان دەقی پێوە گرتوەو تازە ئیدی زۆر بەناخۆشی‌و بەزەحمەت لەمێشیان دێتە دەر. پشوی درێژو کات‌و زەمینەیەکی زۆر دورو درێژی دەوێت بۆ ڕاست کردنەوەو پاك کردنەوەی خانەو شانەی مێشکی ئەم خەڵکە موسڵمانە هەژارو سادەو ساویلکەو دڵ سافانە. ئاخر ئارامی خۆگریەکی زۆری دەوێت تاوشکاوی یات پێ دێت.

ساڵ بۆ ساڵ لەبری واز لێ هێنان‌و کشانەوەو چۆڕە بڕی لەو بیدعە خراپ‌و خورافیاتانە پتر باوەشی بۆ دەگرنەوەو گەرم‌و گوڕ تر ئەنجامی دەدەن، ئەوەتە لەو ڕۆژەدا ئافرەتان بەکچان‌و بەژنانەوە ماڵ بەماڵ‌و گەڕەك بەگەڕەك‌و دەستە بەدەستە سەر سینی‌و خوانچەیان لەسەر دەستانەو دەرك بەدەرك دەگەڕێن چکلێت‌و شیرینی دەبەخشنەوە، یان لەبازاڕەکان کەمن خۆم لەو ڕۆژەدا لەیەکێ لەبازاڕەکان بوم، ئافرەتان بەڕوی سورو بەسەرو مل‌و سەر شان‌و بەرۆك ڕوت‌و نیوەڕەتەوە شیرینی‌و چکلێتیان بەسەر پیاواندا دەبەخشیەوە، گوایە بۆ دەربڕینی خۆشەویستیە بۆ پێغەمبەرﷺ. ئەو ڕۆژە دەبوایە وەك ڕۆژەکانی تو جەژنەکان هەمیشە دەستت بەدەرگاوە بوایە بۆ دەرگا کردنەوە لەو ئافرەتانەی کەئەم شیرینیانەیان دەبەخشیەوە، دوکانەکانیش بەهەمو جۆرەکانیانەوە چکلێتیان کڕی بو نەت دەوێرا بەبەر دەرگای دوکانەکانیان دا بڕۆیت قۆڵیان دەگرتی‌و دەیان گوت فەرمو ئەوە گوێزەبانەیە. نەخێر خوشکانی بەڕێزم‌و برایانی موسڵمانم، زۆر بەهەڵە لەبابەتەکە گەیشتون‌و خراپتان تێ گەیەنراوەو تەواو پێچەوانەی ڕاستیەکانە، چونکە ئەی خوشکی موسڵمانم تۆ هەر دەرچونت لەماڵ بۆ دەرو بەرو بازاڕەکان‌و گەڕانت دەرك بەدەرك بەماڵەکانەوە بەم شێوە پێچەوانەو سەرپێچی کردنی خوای گەورەو پێغەمبەریﷺ خوات کردوە کەفرمانت پێ دەکات لەماڵەکەی خۆتدا بمێنەوە کەچی تۆ سەرپێچی دەکەیت‌و دەڵی ی ناخوایە بەقسەت ناکەم دەچمە دەر. بەڵێ، بەم شێوەیە دەچیتە دەرو شیرینی دەبەخشیتەوە، گوایە لەخۆشەویستیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەمە سەرباری ئەوەی لەئەم کارە ئەنجامی دەدەیت خۆی لەخۆی دا بیدعەو داهێنانەو خوات لەخۆت تورە کردوەو بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ تۆ دەچیتە

ناو ئاگری دۆزەخ. ئاخر گریمان ئەو کارەتان کارێکی شەرعیانەش بو ئەم کارە ئەرکی تۆ نیە بەڵکو ئەرکی سەرشانی پیاوانە.

ئاخر دەربرینی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرﷺ یادی لەدایك بونی بەوە دەبێ کەئێمە بەخۆماندا بچینەوەو بزانین لەو ماوە دورو درێژەی ژیانو تەمەنمان کەرابردوە تاکوێو چەند شوێن پێ ی ئەو پێغەمبەرەمان هەڵ گرتۆتەوەو چەندە گوێ رایەڵو چەندە فرمانەکانی خواو پێغەمبەرمان جێ بەجی کردوە، ئەوەندەی کەنەمان کردوە هەوڵ بدەین لەخۆمانی دا بێینە دیو لەکارو کردەوەکانماندا رەنگی بدەینەوە، ئاخر ناکرێ ئێمە ئەمرۆ لەیەك تاکە رۆژدا خۆشەویستی خۆمان بەبەشینەوەی شیرینیو چکلێتو ئاهەنگ بۆ گێرانو کردنی مزگەوتەکانو بەتایبەتی مینەبەری پێغەمبەر بەسرودو گۆرانی گوتن بەشانۆگەریو سرودو گۆرانی تێدا بەرینە سەرو کەچی بەدرێژایی تەمەنت دژو پێچەوانەی ئەو بەرنامەیە بیت کەئەو کەڵە پیاوە هێناویەتی، یان هەمو گیانت پڕی بێت لەبیدعەو بیدعەکاریو پێچەوانەی فەرمودەکانی پێغەمبەر بجوڵێیتەوە ئەوە کەی خۆشەویستیە بۆ ئەو زاتە پیرۆزە، ئەگەر کەسێکت خۆش بوێت دەبێ لەفرمانو گوێ لەمستی دابیتو بە کردەوە بیسەلمێنی کەبەراستی خۆشت دەوێت، هەروەك چۆن خۆشەویستی قورئان بەماچ کردنو بەسینگی خۆوە نان و لەسەر رەفتە دانانەوە نابێت، بەڵکو دەبێ کار بەو بەرنامەیە بکەیت کەلەدو توێ ی ئەو قورئانەدا هاتوە، ئاواش خۆشەویستی پێغەمبەر بەئاهەنگ گێرانو سرودو گۆرانیو نقڵو چکلێت بەخشینەوە نابێت، بەڵکو بەجێ بەجێ کردنی سوننەتەکانیو شوێن کەوتنی دەبێت سەد دەر سەد. ئەوەتە خواو پێغەمبەرەکەت پێت دەفەرمون: خۆت داپۆشەو خۆت مەرازێننەوەو بۆنی خۆش لەخۆتان مەدەنو مەچونە ناو پیاوانی بێگانەوە. هەروەها ئەگەر راست دەکەن کەخواو پێغەمبەری خواتان خۆش دەوێت شوێن ئەو پێغەمبەرە بکەونو سوننەتەکانی زیندو بکەنەوەو ئەنجامیان بدەن وەك شەو نوێژەکانو بەرۆژو بون لەرۆژەکانی دوشەممەو پێنج شەممەکانو سێ رۆژ لەهەمو مانگێکدا ١٣، ١٤و١٥ی هەمو مانگێكو چێشتە نوێژەکانو بەدرێژایی ژیانو لەهاوینو لەزستانداو باقی سوننەتەکانی تری کەفرمانی پێ کردوین. دەبێ لەکردەوەکانتداو لەخۆتدا رەنگ بداتەوە، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ سورة آل عمران: (٣١). ئەمەیە خۆشویستنی پێغەمبەرﷺنەك ئەو شێوەی کەئێستا خەڵکی دەری دەبڕن!

پیاو قسێکی بۆ دزیش بکات باشە، ئاخر ئەو خەڵکانەی کەیادی ئەم یادەوەریە دەکەنەوەو بەجەژنی دەزانن دەڵێن: ئێمە سەرمان لێ شێواوە نازانین بەقسەی کێ بکەین هەندێك دەڵێن: دروستەو یاد کردنەوەی رۆژی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ هیچی تێدا نیە، هەندێکیش دەڵێن: دروست نیەو بیدعەیەو دەبێ بچیتە ناو ئاگر، دەی ئێمەش بۆیە دەیکەین کەبەندایەتیەك بۆ خوا دەکەینو خۆمانی پێ لەخوا نزیك دەکەینەوەو بەنیازی چونە بەهەشت. بەڵێ، راست دەکەن زۆرێك لەسەر کەناڵەکانو رادیۆ دەنگەکانو لەرۆژنامەو نامیلکەو گۆڤارو کتێبەکاندا دەڵێنو دەنوسن:

أ ـ هەندێکیان لەسەرەوە پێدان دێن هەرچی راستە دەڵێن:: کەدروست نیەو لەسوننەتی پێغەمبەردا نیەو نەهاتوەو بونی نیەو فلان و فیسارە تاقم دایان هێناوەو پێغەمبەرﷺو هاوەڵەکان و چوار جێنشینەکان و شوێنکەوتوان و هەرسێ چەرخە سەروەرەکان نەیان کردوە، کەچی دوایی دێت دەستوری بۆ دادەرێژێت و کات و زەمینەی بۆ دادەنێت و مەیدانی بۆ خۆش دەکات و شێوازی بیدعەکەی بۆ دادەرێژێت و دەڵێت: چی تێدا نیەو ئەگەر ئەو رۆژە بقۆزینەوەو سودی لێ وەربگرین، بامامۆستاو زاناکانمان خەڵکی کۆ بکەنەوەو وتاری تێدا بخوێننەوەو ئامۆژگاری خەڵکی بکەن و باسی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺسوننەتەکانی بکەن، ئێ ئاخر ئەمە کات و زەمینە خۆش کردن و هان دانی خەڵکە بۆ کردنی ئەم بیدعەیە کەمشت و مڕی لەسەرە، ئاخر ئەوە چۆن دەبێت؟!!

ب ـ هەشیانە دەڵێن: دروستەو ئێمەش یادی سەروەرو سەرداری خۆمان کەمحمد مصطفی یەﷺدەکەینەوە، ئەو پێغەمبەرەی کەئەو هەمو نازو نیعمەتەی ئیسلام و سەرفرازی دین و دنیای بۆ هێناوین و جیهانی پڕ کردوە لەنوری ئیسلام و رێزو خۆشەویستیەکی زۆری لەسەرمان هەیە، قەرزاری ئەوین، باشە ئەدی بۆچی خەڵکی یادی ڤالانتاینو رۆژی خۆشەویستی دەکەنەوە کەکارێکی پڕو پوچ و بێ بنەماشە، یان دەڵێن: بۆچی گاورەکان یادی لەدایک بونی عیسا علیه السلام دەکەنەوە بۆ ئێمە یادی ئەو پێغەمبەرە نازدارە نەکەینەوە؟

ئێمەش دەڵێین: راستە پێغەمبەرﷺ خۆشەویست و سەردارو گەورەی ئێمەیە هەر کەسێك پێغەمبەری لەخۆی و لەماڵ و منداڵ و لەدایك و باوك و لەهەمو کەس خۆش تر نەوێت ئەوە ئەو کەسە بروای تەواو نیە هەروەکو پێغەمبەر بەئیمامی عمری کوڕی خەتتابی فەرموو ئەویش گوتی: ئەی رەسولی خوا ئەوە ئێستا تۆم لەخۆم و لەماڵ و منداڵ و دایك و باوك و لەهەمو کەس خۆشتر دەوێت. ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرموی: دەی ئێستا ئەی عمر برواکەت تەواوە. وەبۆ ئەوەش کەدەڵێن : بۆچی گاورەکان یادی لەدایك بونی عیسا دەکەنەوە، ئەوە راست وەك ئەو فەرمودەیە کەپێغەمبەرﷺ فەرموی: {لتركبنَّ سنن من قبلكم} رواه الترمذي وصححه. وەلەرپوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئێوە شوێن خوو نەریت و رێگەی گەلانی پێش خۆتان دەکەون، هەتاکو ئەگەر بچنە ناو کونی بزن مێژکەشەوە لەگەڵیان دەچنە ژور یان شوێنیان دەکەون ئاخر ئێوە بەر ئەم فەرمودەیە دەکەون بەم قسانەتان. و ئەمە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرەﷺ کەپێمان دەفەرموێت ئێوە موسڵمان و برواداری خۆتان بەکەسان و گەلانی ناموسڵمان و لەدین دەرچوو بیدعەچی یەکان مەچوێنن چونکە ئەگەر خۆتان لەوان بچوێنن ئەوە ئێوەش لەوانن واتە حەشرو حسابتان رۆژی قیامەت لەگەڵ ئەواندا دەبێت خوای گەورە پەنامان بدات، {من تشبه بقومٍ فهو منهم}. دەی کەتۆ خۆت بەموسڵمان دەزانین پێت خۆشە رۆژی قیامەت لەگەڵ گاورو جولەکەکاندا زیندو بکرێیتەوەو حسابت لەگەڵ ئەواندا بکرێت؟! ئاخر بەم قسانە دەبیتە داهێنەری بیدعەکەو تاوانی هەمو ئەوانەشت دێتە ئەستۆ کەشوێن فتواو قسەکانی تۆ دەکەون هەتا دنیا دنیایە بێ ئەوەی لەگوناحی هیچیان کەم ببێتەوە هەروەکو پێغەمبەریﷺ خۆشەویست فەرموی.

یان دەڵێن ئەم یاد کردنەوەیە لەبەندایەتیەکان نیە بەڵکو خوو نەرێتێکەو خەڵکی گرتویانەتە بەرو دەقیان پێوە گرتوەو هەر دەیکەن، ئاخر ئەمەش پاکانەیەکەو ئۆباڵی ئەمەشتان دێتە سەر، توخوا کێ ئەقڵی دەبڕێ

**٢. بەپیرۆزو بەفەڕ دانانی شوێنەکانو شوێنەوارەکانو کەسەکان زیندو بن یان مردو:**

هەروەها لەداهێنراوە تازەگەریەکان: بەپیرۆزو بەفەڕ دانانی دروستکراوەکانە، ئەمە ڕەنگێکە لەڕەنگەکانی بت پەرستی(الوثنية)و تۆڕێکەو خۆفرۆشەکان ڕاوی ماڵو سامانی خەڵکی سادەو ساویلکەکانی پێ دەکەن، وە(التبرك): بریتیە لەفەڕو پیرۆزیو بریتیە لەسەلماندنی بونی خێرو فەڕ لەشتێکداو پتر بونوفەڕداری ئەو شتە، داوا کردنی بونی خێرو بەرەکەتو پتر بونیو بەسەردا ڕژان تەنیا لەو کەسە دەکرێت کەخاوەنیەتیو هەر ئەویش تواناو دەسەڵاتی بەسەردا دەشکێت، کەئەویش خوای پاکو بێگەردە، هەر ئەوە خێرو فەڕو بەرەکەت دەنێرێتە خوارو دەیچەسپێنێ، دەی بەپیرۆز دانانو داوا کردنی فەڕو بەرەکەتو خێر لەشوێنەکانو شوێنەوارەکان(جێگاو نەزرگەکان)و پاشماوەی کەسەکان ـ بەزیندوو بەمردویانەوە ـ دروست نیەو نابێ ، لەبەر ئەوەی یان هاوبەش دانانە، ئەگەر باوەڕی وابێت کەئەم کارەی دەبێتە هۆی پێدانو پێ بەخشینی خێرو فەڕو بەرەکەت، یاخود هۆکارێکن بۆ هاوبەش دانان ئەگەر بیرو باوەڕی وا بێت کەئەم سەردان(زیارتە)و دەست لێدان (ملامسة)و خۆ لێخشاندنو دەست پێدا هێنانە (التمسح) هۆکارێکن بۆ وەدەست هێنانی ئەم خێرو بەرەکەتو فەڕیە لەخوای گەورەوە واتە واسیتەیەکن لەنێوان ئەو کەسانەو لەنێوان خواداو بۆ خۆ نزیك کردنەوە بێت لەخوای گەورە.

بەڵام ئەوەی کەهاوەڵان دەیان کرد لەبەپیرۆزو بەفەڕ دانانی موو لیكو هەر شتێك کەلەجەستەی پێغەمبەرﷺ جیا دەبوەوە، بەتایبەتی ئەوەی لەپێشدا باس کرا، ئەمە تایبەت بو بەپێغەمبەرﷺو بەس، هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هۆدەو خانوو شوێنو

---

کەئەم قسەیە ڕاست بێت. من دەڵێم: باشە وەرن ڕاپرسیەك بکەن.لەناو ئەو موسڵمانانەدا کەبەم کارانەی کەباسمان کردن لەیادی ئەم ڕۆژەدا ئەنجامی دەدەنو لێ یان بپرسن: ئایا ئێوە ئەم یاد کردنەوەو ئاهەنگ گێڕانو شیرینی بەخشینەوەو پیرۆز بایی لەیەکتری کردنە بۆچی ئەنجام دەدەن، ئایا هەر خوو نەریتێکەو بارتان پێوە گرتوەو بۆخۆشی خۆتان ساڵانە ئەنجامی دەدەن، یاخود بەندایەتیەکەو بۆ خۆ لەخوا نزیك کردنەوەو ڕازی بونی خواو گەیشتن بەبەهەشتو لەپێناو دەربڕینی خۆشەویستی پێغەمبەرداﷺ ئەمەدەکەن؟ حەتمەن من پێم وایە سەدا سەد وەڵامەکە هی دوەم دەبێت واتە بۆ بەندایەتی کردنو خۆ لەخوا نزیك کردنەوەو خوا لەخۆ ڕازی کردنو چونە ناو بەهەشت دەبێت. بەڵێ ساڵانە ڤاگمیەکانی سەردەم گەرمو گوڕ ترو یادی دەکەنەوەو خێراترو ڕەوڕەوی ئەم یاد بەم کۆمەڵە پاساوانە دەخولێننەوە. وەرگێڕ.

گۆڕەکەیان لەدوای خۆی بەپیرۆزو بەفەڕ دانەدەناو بەپیرۆزیان نەدەزانی، وەنە دەچونە ئەو شوێنانەی کەپێغەمبەرﷺنوێژی تێدا دەکرد یاخود لێ ی دادەنیشت،( واتە لەدوای وەفاتی خۆی ئەو پاشماوانەی پێغەمبەریانﷺ نەدەکەردە هۆکارو وەسیلەیەك بۆ خۆ نزیك کردنەوە لەخوای پەروەردگار۔ وەرگێڕ)، هەروەها شوێنەکانی ئەولیاکان لەپێشتریش بون، دەی ئەوان پیاو چاکانی وەك: أبي بكــرو عمــر و غەیری ئەوانیشیان لەهاوەڵە بەڕێزەکان بەپیرۆزو بەفەڕ دانەدەنا، نەلەژیانی خۆیاندا نەلەدوای مردنیشیان، نەدەچون بۆ ئەشکەوتی حەڕاو نوێژیان لێ نەدەکرد یالەو شوێنە نەدەپاڕانەوە وەك شوێنێکی پیرۆزو بەفەڕ، وەنەدەچونە کێوی (طــور) کەمەسا لەو شوێنەدا قسەی لەگەڵ خوای پەروەردگار کردوە بۆ ئەوەی نوێژی لێ بکەنو لەوێدا بپاڕێنەوە، یان بۆ هەر شوێنێکی تری ئەم شوێنانە لەشاخو چیاکانی کەدەڵێن شوێنو جێگەی پێغەمبەرانو غەیری ئەوانی لێ یە، نەبۆ ئەزرگەو مەزارەکانی کەلەسەر شوێنەواری واتە پاشماوەی پێغەمبەرێك لەپێغەمبەران خانوو بینایەی لێ دروست کراوە۔ ( بۆ نمونە وەك گۆڕو مەزاری پێغەمبەر یونس سەلامی خوای لەسەر بێت کەلەشاری موسڵو هیچ مزگەوتێك بەقەد ئەوێ قەڵەوبالَغ نیەو شەوو ڕۆژ جمەی دێت بەدەیانو بەسەدان کامێرای وێنە گرتنو ڤیردیۆیی بەشەوو بەڕۆژ کاری وێنە گرتنی تێدا دەکەن کەئەم کارەشیان خۆی لەخۆی دا بەتەنیا گوناحو سەرپێچی یەکی تری خوای گەورەیە ۔ وەرگێڕ)۔

هەروەها ئەو شوێنەی کەپێغەمبەرﷺلەمەدینەی پێغەمبەرﷺ هەمیشە نوێژی لێ دەکرد هیچ کامێك لەپێشینەکان نەچون باوەشی پێدا بکەنو ماچی بکەنو خۆیانی لی بخشێننو بیلێسنەوە، نەئەو شوێنەشی کەلەمەککەو شوێنەکانی تری کەنوێژی تێدا کردوە،جا ئەگەر ئەو شوێنەی کەپێغەمبەرﷺ بەهەردو پێ ی پیرۆزی پێ لێ دەنا یاپێی دا دەڕۆیشتو نوێژی لێ دەکرد بۆ ئوممەتەکەی دروست نەبێت دەستی پێدا بێنێنو ماچی بکەنو بیلێسنەوە، ئەدی چۆن بێت بۆ شوێنەکانی تر کەدەڵێن غەیری پێغەمبەر ﷺ لەپیاو چاکانو وەلیەکانی خوا نوێژیان لێ کردوە یالێ ی نوستون؟ دەی ماچ کردنی

شتێك لەو شوێنەو دەست پێدا هێنانی زانایان داهێنانو هاوردەیان (إضـطرار) زانیـوە لەئاینی ئیسلامدا. ئەوە لەشەریعەتی پێغەمبەرداﷺ نیە([٣٤٥]).

٣- بیدعەكان لەبواری بەندایەتیەكانو خۆنزیك كردنەوە پێ ی لەخوای گەورە:

ئەو داهێنانو تازەگەریانەی كەلەبواری بەندایەتیەكاندا لـەم زەمانو لـەم سـەردەمەدا گـەلێك زۆرن، لەگـەل ئەوەشـدا كەبنـەڕەتو بنـەماو ڕەگو ڕیشـە لەبەندایەتیەكانـدا چەسپینو نەگۆڕییە (التوقيف)، هیچ شتێك دروستو شەرعی نیە تەنیا بەبەلگەوە نـەبێت، ئـەوەی كەبەلگـەی شـەرعی لەسـەر نـەبێت ئـەوە بیدعەیـە، بـەگوێرەی فـەرمودەی پێغەمبەرﷺ: {من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌّ}([٣٤٦])

وەئەو بەندایەتیانەی كەئێستا ئەنجام دەدرێنو بەلگەی شەرعیان لەسەر نیە گەلێك زۆرن، ئێمە لەم چەند خالانەی خوارەوەدا كورتیان هەل دەهێنین:

**ا- گوتنی نیەتی نوێژ دابەستن بەزمانو بەئاشكرا(بەقەو):** بەوەی كەبەزمانو بەدەنگ دەلێ: نیەتم وایە نوێژ بۆ خوا دەكەم ئەواو ئـاوا، ئـەم نیـەت هێنانـە بیدعەیـە، چونكە لەسونەتی پێغەمبەرداﷺ بونی نیەو هیچ ڕەگو ڕیشەیەكی نیە، چونكە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ اللَّهَ بِدِينِكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ سورة الحجرات: (١٦).

وەنیـەت جێگـەی لـەناو دلدایـە، و لـەكارەكانی دلـە نـەك لـەكاری زمـان واتـە بـەدل دەگوترێت نەك بەزمان.

**٢ - ویردو زیكرەكـانی دوای نوێژ بەكۆمـەلی (الجماعی - كـۆڕس)**، بـەلكو ئـەوەی كەشەرعیو دروستە ئەوەیە كەدەبێ هەر كەس بەتەنیا بۆ خـۆی زیكرەكان بكات بەبێ دەنگیو لەبەر خۆوە.

**٣ـ خوێنـدنی سـورەتی (الفاتحـە)لەبۆنەكانـدا**، و لـەدوای دوعـا كـردنو بـۆ مـردوان لەتازیەكاندا.

([٣٤٥]) تەماشای:إقتضاء الصراط المستقيم(٢/٧٩٥ــ٨٠٢) بكە لە تەحقیق كردنی دكتۆر ناصر العقل.

([٣٤٦]) رواه مسلم.

**٤ـ بەرپا کردنی پرسە واتە دانانی پرسەکان بۆ مردوەکان**، و دروست کردنی چێشتو گۆشتو خواردن بەکرێ گرتنی قورئان خوێنەکان بۆ خوێندنی قورئان لەگۆڕو گرد بونەوەکانی تازیەو پرسەکاندا، و دەڵێن ئەو لەدەرگای تازیەیە، یاخود دەڵێن ئەو قورئان خوێندنە سود بەمردوەکە دەگەیەنێت، ئەوانە هەمویان لەبیدعە داهێنراوەکانن‌و هیچ بنەماو بنەڕەتێکی نیەو لەڕاستیەوە دورن، کۆتو زنجیرو سینگانێکن کەخوای گەورە هیچ زانستو زانیاری‌و بەڵگەیەکی لەبارەوە نەناردونە خوار.

**٥ـ ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی بۆنە ئاینیەکانەوە**:وەك بۆنەی یادی ئیسراو میعراج، بۆنەی کۆچی پێغەمبەرﷺ لەمەککەوە بۆ مەدینە، ئەم جۆرە ئاهەنگانەش بەو بۆنانەوە هیچ بنچینەو بنەمایەکی نیە لەشەریعەتی خواداو نەپێغەمبەرﷺ نەچوار جێنشینەکان‌و نەهاوەڵان‌و نەشوێنکەوتەو پێشینە پیاو چاکەکان نەیان کردوە.

**٦ـ ئەوەی کەلەمانگی ڕەجەبدا دەکرێت**: لەو بەندایەتیانەی کەتیایدا دەکرێت‌و تایبەت کراون بەو مانگەوە ـ وەك تێدا کردنی نوێژو ڕۆژوی تایبەت، ئەو مانگە هیچ جیاکەرەوەو تایبەتمەندیەکی تایبەتی نیەو هیچی لەمانگەکانی تر پتر نیە، نەڕۆژو ونەنوێژو نەسەربڕین وەك قوربانی‌و خوێن ڕشتن بەنیازی بەندایەتی کردن، وغەیری ئەمانەش.

**٧ـ زیکرو ویردی سۆفیەکان بەهەمو چەشنەکانیەوە**: گشتیان داهێنان‌و تازەگەرین‌و لەئایینی ئیسلامادا بونیان نیە، چونکە پێچەوانەی زیکرو ویردە شەرعیەکانن چ لەشێوەی داڕشتنەکانی‌و چ دەستەو چ لەکاتەکانی ئەنجامدانیاند بێت.

**٨ تایبەت کردنی شەوی نیوەی شەعبان**: بەهەستانەوەو زیندو کردنەوە واتە شەو نوێژ تێدا کردنی، هەروەها بەڕۆژو بونی ڕۆژی نیوەی شەعبان، ئەمەش لەئایینی ئیسلامدا بونی نیە، چونکە لەپێغەمبەرەوەﷺنەچەسپاوەو هیچ شتێکی تایبەتی لەسەر نەهاتوەو ئەو بەنداتیانەی تێدا تایبەت بکرێت.

**٩ـ دروست کردنی بیناو خانو لەسەر گۆڕەکان**: وکردنیان بەمزگەوت واتە مزگەوت دروست کردن لەسەر گۆڕوگۆڕستانەکان، وەسەردانی گۆڕو گۆڕستان‌و مەزارو نەزرگەکان بەنیازی پیرۆزی‌و فەڕو بەرەکەت، پاڕانەوەو پەنا بردنە بەر مردوان‌و کردنیان بەوەسیلە لەنێوان خۆیان‌و خوای گەورەدا( واتە وەکو ئەو جۆرە کەسانە خۆیان دەڵێن: ئەوانە پیاوی چاکن‌و دوعایان

قبوڵەو ئێمە لەبەر ئەوان دەپاڕێینەوەو ئەوانیش بۆمان لەخوا دەپاڕێنەو دەیان کەینە واسیتە. وەرگێڕ). ئەمانەو غەیری ئەمانەش لەمەبەستو ئامانجە هاوبەش دانانیەکان(الأغراض الشركية)، هــەروەها زیــارەتی ئافرەتــان بــۆ ســەر گــۆڕو گۆڕســتانو مــەزارەکان لەگــەڵ ئەوەشــدا کەپێغەمبەرﷺنەفرەتی لەو ئافرەتانە کردوە کەدەچنە سەر گۆڕو گۆڕستانەکان، هەروەها لەو کەسانەی کەگۆڕو گۆڕستانەکان دەکەنە مزگەوتو هەڵیان دەبەستنو قوببەو خانویان لەسەر دەکەن.

وەلەکۆتایی دا دەڵێین: داهێنانو تازەگەری لەئاییندا(البدع) پۆستەی کوفرو کافر بونە، کەبریتیە لەخستنە سەرو زیادە لەئاییندا کەنەخوای پەروەردگارو نەپێغەمبەرەکەی بەشەرعیان دانەناوە، وە بیدعە خراپەو خراپەکاریو شەڕێکە لەسەرپێچیو یاخی بونو گوناحی گەورە، شــەیتان بــەم کــارە گــەلێك دلخۆش تـر دەبێـت لـەوەی کەبەئەنجامـدانی گونـاحو یـاخی بونە گەورەکان دڵخۆش دەبێت، چونکە یاخی بو گوناحێكو سەرپێچیەك دەکات دەزانێت ئـەوە کەگوناحو سەرپێچی کردوە لەوانەیە تۆبە بکاتو لەگوناحەکەی پەشیمان ببێتـەوەو خـوای گەورەش بیبورێت، بەڵام داهێنەرو تازەخواز کاری داهێنـانو بیدعـە دەکـات وا دەزانێـت ئەوە دینەو خۆی پێ لەخوای گەورە نزیك دەکاتەوە، گوێ ی پێ نـاداتو هـەرگیز تۆبـەی لێ ناکـات، هــەروەها داهێنــانو تازەگــەری دەســت بەســەر ســوننەتەکاندا دەگرێـتو ڕەشـیان دەکاتــەوە، ڕقــی لەهاوەڵــەکانی دەبێتــەوە لەوانــەی کــەکار بەسوننەتەکان دەکــەنو ئــەهلی سوننەتن. بیدعە بەپێچەوانەی بیرو باوەڕی بیدعەچیانوتازەگەرخوازان لەخوات دور دەخاتەوە نەك نزیکت بخاتەوە، ڕقوخەشمی خوا لەسەرخۆی واجب دەکاتو شاسیتەی سزای خوا دەبن، هەروەها دەبێتە هۆی لادانو ژەنگ هەڵێنانی دڵو پیسو بۆگەن بونی دڵ.

**ع هەڵسو کەوت واتە مامەڵە کردن لەگەڵ داهێنەرانو تازەگەران لەئاییندا(المبتدع):**

سەردانو چونە لای داهێنەران حەرامەو دروست نیە لەمـەجلسو کۆڕو کۆبونـەوەکانی یاندا دابنیشت مەگەر بۆ مەبەستی ئامۆژگاری کردنو بەرپەرچ دانـەوەی لەسـەر ئـەو کـارە بیدعیـەی کەکردویەتی، چونکە تێکەڵ بون لەگـەڵی دا دەبێتـە هـۆی خراپـیو شـەڕی لێ دەکەوێتـەوە، و دوژمنایەتیو ناحەزیەکەی بڵاوە دەکاتو بۆ غەیری خۆیو تەشەنە دەکـات، پێویسـتە وریـاییو ئاگاداریو هوشیاری موسڵمانانیان لێ بکرێتو لەشەڕو خراپەکاریەکانیان خۆ بپارێزرێت، ئەگـەر دەستیان نەگیرێتو ڕێگەیان نەگیرێت، وەقەدەغە بکرێن لەئەنجامدانی ئـەو کـارە بیدعیـەیان،

وەهەروەها پێویستە لەسەر زانایانی موسڵمانانو کاربەدەستانو بەرپرسان کەقەدەغەی ئەو کارە بیدعیانە بکەنو ڕێگەیان لێ بگیرێتو بواریان نەدرێت، و دەستیان بگیرێت ئەگەر شەڕو خراپەکاریەکەیان دانەمرکێندرێتەوەو بەریان پێ نەگیرێت ڕەوشەکە بەرەو خراپترو بەرەو خراپەکاریو ئاشوب دەڕوات، چونکە مەترسی یان لەسەر ئیسلامو موسڵمانان گەلێك زۆرو توندو تیژە، هەروەها پێویستە بزانین کەوڵاتانو دەوڵەتانی کوفر هەمیشە هانی داهێنەرانو تازەگەران لەئاییندا(المبتدعـــة) دەدەن بۆ پەرە پێدانو بلاو کردنەوەی داهێنانەکانیان، وەهاریکاریو یارمەتیەکی بی پایانیان دەکەن بەجۆرەها ڕێگەو شێوە چۆنی بۆیان گونجاو بۆیان لوا، چونکە بەهۆی ئەم کارەوە دەتوانن لەدەلاقەی شورای ئیسلام بێنە ژورو دەست بەسەر قەوارەی ئیسلامدا بگرنو ئیسلام لەناو بەرن ، ونەمنو ئاساییشی ولآتانی ئیسلام بشێوێننو وێنەی ئیسلام لیخنو دزێو بکەن.

داوامان لەخوای گەورەو پەردگارە ئەوەیە کەئایینەکەی خۆی سەر بخات، و وشەو بەرنامەو پەیامەکەی خۆی بەرز بکاتەوە، دوژمنانو ناحەزانیشی سەر شۆڕو ڕیسوا بکات.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وآله وصحبه.

# پـــێـرســــت (الفـــهـــرســـت)